# کۆتایی ئێراق

چۆن کارنارێکی ئەمێریکا شەڕێکی بێ کۆتایی بەرپا کرد

نووسەر: پیتەر و. گالبریت
وەرگێر: مامەک

IRAQ



# کۆتایی ئێراق

چۆن کارنارێکی ئەمێریکا شەرێکی بێ کۆتایی بەرپا کرد

نووسەر:

پیتەر و. گالبریت

وەرگێڕ:

مامکاک

ناوی کتێب: کۆتایی ئێراق - چۆن کارنارێکی ئەمێریکا شەڕێکی بێ کۆتایی بەرپا کرد
نووسەر: پیتەر و. گالبریت
وەرگێڕ: مامکاک
بڵاوکراوەی ئاراس- ژمارە: ٥٤١
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە: ئاراس ئەکرەم
دەرهێنانی بەرگ: حەمید ئازموودە
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم، هەولێر- ٢ ٠٧
لە کتێبخانەی گشتیی هەولێر ژمارە (١٤٣)ی ساڵی ٢٠٠٧ی دراوەتێ

# مردن دەئاخێفێ

بازرگانێک لە بەغدا هەبوو، خزمەتکارەکەی خۆی ناردبووە بازاڕ ئازووخە بکڕێ. بەردەستەکە پاش ماوەیەکی کەم هاتەوە، ڕەنگی سپی بووبوو و دەلەرزی، گوتی: "گەورەم، هەر ئێستاکە لە بازاڕی، لەناو ئاپۆڕەی قەرەباڵغیدا، ژنێک خۆی پێدادام. کە ئاوڕم لێی داوە، دیتم مردن بوو خۆی لێدام. ئافرەتەکە سەیری کردم و بە ئیشارەت هەڕەشەی لێ کردم؛ هەر ئێستا، ئەسپەکەی خۆتم پێ بدە تا لەو شارە ڕاکەم و لە چارەنووسی خۆم دوور بکەومەوە. دەچمە سامەڕا لەوێ مردن نامدۆزێتەوە. بازرگانەکە ئەسپەکەی خۆی پێ دا و خزمەتچییەکە سواری بوو و دایە بەر نەقیزان و هەتا توانی ئەسپەکە بە غار بۆی دەرچوو. پاشان بازرگانەکە چووە بازاڕی و منی دیت لە ناو قەرەباڵغیی خەڵکەکە ڕاوەستابووم، هاتە لام و لێی پرسیم: بۆ کە بەردەستەکەم ئەم بەیانییە تۆی دیت، ئاماژەی هەڕەشەت ئاراستەی کردبوو؟ منیش گوتم، ئەوە ئیشارەتی هەڕەشەکردن نەبوو، بەڵکو تەنیا سەرەتای سەرسوڕمانەکە بوو. حەپەسام کە لە بەغدا دیتم، چونکە من ئەمشەو دەبوو لە سامەڕا چاوم پێی بکەوێ.

وەک چۆن گێڕاویانەتەوە؛
نووسینی سۆمەرسێت مۆم
- جۆرج و. بوش، ۲۰۰۳
جێبەجێیان بکە

# بەشی ١

## کاتە دیارکراوەکە لە سامەڕا

بکوژترین پەلاماری تیرۆریستی لە ئێراقی کەسی نەکوشت.

لە بەیانییەکی زووی ٢٢ی شوباتی ٢٠٠٦دا، چەند زەلامێکی چەکدار، هەڵیان کوتا ناو گومبەتی عەسکەری لە سامەڕا، کە شەست مایل لە باکووری بەغداوەیە. هەر چوار زێرەڤانی قەبرەکەیان پەلبەست کرد و بردیاننە ناو ژوورێکی لاچەپ و لەوێ بەجێیان هێشتن. پاشان لە ماوەی چەند سعاتێکدا، هەستان سەدان پاوەن تەقەمەنییان لە چەند شوێنێکی ستراتیژی بن گومبەتە زێڕینەکە داناوە. لە ٦,٥٥ی بەیانی تەقەمەنییەکانیان تەقاندەوە؛ کە ڕەنگە بەهۆی مۆبایل فۆنێک ئەنجامیان دابێ. گومبەتەکە داتەپی و ئەو مەرقەدەی کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە سەدەی نۆیەم، خاپوور بوو.

چەندین سەدەیە، شیعەکان ئەسپێکی زینکراو بۆ گۆڕگۆمەزی عەسکەری دێنن. ئەسپەکە لە چاوەڕوانی محمد المهدی دەوەستێ. مەهدی ئیمامی دوازدەمینە؛ ئەو دوا ئیمامەشە کە لە ٨٧٨ چووە نێو ئەشکەوتێکی بن گۆڕەکە و لەوێ خۆی وەشاردەوە. هێشتا هەر منداڵێک بوو کە دواجار بیندرا ئیمامەکە پاشتر بۆ ماوەی حەفتا ساڵ، لە ڕێگەی پێوەندێکەوە، پەیوەندی بەلایەنگرانییەوە کرد. شیعەکان لەو باوەڕەدانە کە ئەو هێشتا هەر زیندووە. کە گەڕاوەش داد و ڕەوا تا ڕۆژی قیامەت، لەسەر زەوی بەرپا دەکا خەلیفەی بەهێزی بەغدا کە سەرکردەی فیکری ئیسلامە سوننە نەیارەکانی شیعە بوو، فەرمانی گرتنی باپیری المهدی دابوو، هێنابووی لە سامەڕا ماڵزیندانی کردبوو. ئیمام علی الهادی کە باپیری ئیمامی مەهدی و دەیەم ئیمامی شیعەکان بوو، بەبۆچوونی شیعەکان، خەلیفە لە ٨٦٨ ژارخواردووی کردووە. دوای شەش ساڵیش حسن العسکری کوڕی هادی کوشتووە. حسن العسکری ئیمامی

یازدەمـە. ئیـمـانداران ئیـمـامی دوازدەمـیـان شـاردەوە و نەیانـهـێـشت بەهەمـان چارەنووس بگا.

شیعە ئێراقییەکان هۆی ڕاشکاویان بەدەستەوە هەیە بۆ ئەوەی باوڕ بکەن کە ئەو پیاوانەی گۆڕگومبەتی العسکریـیان تەقاندەوە ئەوەی زەلامکوژەکانی خەلیفەکە بوون. گومان لەوەدا نییە کە القاعدە فی بلاد الرافدین گۆڕگومبـەزەکەی تەقاندۆتەوە. ئەم ڕێکخـراوە هاوشـێوەی ئەو شـانەیەیە کـە ناوەندی بازرگـانی جـیـهـانی لە نیـویۆرک ڕمـاند. القاعدە هەوڵ دەدا سـسـتـمی خـەلیـفـایەتی سـوننی زیندوو بکاتەوە و هەمـوو شیـعـە مـەزەبەکانیش بە لە دین وەرگەڕاو دەزانێ، بۆیێ لە لای القـاعـدە شیـعـەکان شایستەی کوشتنن.

لە مـاوەی چەند سـعـاتێکی کـەمی پاشـی ڕووخـاندنـی مـەرقـەدەکـە، ئەندامـە ڕەشپۆشـەکانی سوپای مەهدی، ئـەو میلیـشیایـەی خۆی بەناوی ئیـمامی دوازدەمین کردووە، خاڵە سـەرەکییـەکانی دەردۆری بەغدایان کۆنـتـرۆڵ کرد. ئینجا، لە دەوری بەغدا، شیـعـەکان پەلاماری مزگەوتەکانی سوننەکانیان دا چونکە سوپای مەهدی هەڕەشـەی کـرد، بۆیە نە لەشکری ئێـراقی و نە سـوپای ئەمـێـرکی دەسـتـیـان لە بارودۆخـەکە وەرنەدا. هەندێ لە پۆلیسانی ئێراقی، لەوانەی کە وەڵاتە یەککگرتووەکان چەندەهـا بلـیـۆن دۆلاری بـۆ مـەشـقـپـێـدانیـان خـەرج کـرد، چوون پەیوەندیـیـان بە پەلامـاردەرانەوە کرد و ئەوانی تریش دەست لەئەژنۆ وەسـتـا بوون سـەیریـان دەکرد. ئەو ڕۆژی سێ ئیـمامی سوننە لە بەغدادا کوژران. لە بەسراشـدا، کۆمـەڵێک شیـعـە هەڵیـان کوتا سـەر بـەندیخـانەی شـارەکە و دە زیندانی عـارەبی بیـانییـان گرتن، کە لەوێ بەگـومـانی تیـرۆریسـتـیـیـەوە بەند کـرابوون، پاشـان گـولله بارانیـان کـردن و کوشـتـیـانن. ڕۆژی پاشـتـر سوننە عـارەبەکان لە شـاری باقووبەی شـیـعـە و سـوننە نشیندا، چل و حـەوت ڕێبواریان لە ناو باسەکاندا دابەزاندن و لە سێدارەیان دان. لە هەینی دوو ڕۆژ پاشـتر، حکومەتە زۆرینە شیـعـەکەی ئێراقی؛ بۆ ڕێگە گرتن لە توندی و تیژی پتر، بۆ مـاوەی بیست و چوار کـاتی تـەواو، هـاتووچۆی لە ناو بەغدا قـەدەغـە کرد. لەگـەڵ ئەمەشدا لە هەمـوو شارەکەدا بیـست و نۆ تەرم دۆزرانەوە. قوربانییـەکان دەسـتـیـان بەسـترابووەوە، ئینجا گـوللەیان لە سـەری درابوو. ئەمـەش نیـشـانەی ئەوە

بوو کە سوننە بوون - یان لەلایەنی پۆلیسە شیعەکان یان لە لایەنی ئەو میلیشییە شیعانەوە کوژرابوون کە جلی پۆلیسیان دەپۆشی.

حەفتەی پاشتر ١٨٤ مزگەوتی سوننەکان یان وێران کران یان هەر تێکدران. توندوتیژی مەزهەبگەری بووە هۆی کوشتنی پتر لە هەزار کەسی سوننە و شیعە. لەو گەڕەکانەی کە زۆرینەی دانیشتوانەکەی سوننەنە، زێرەڤانەکانیان خانەوادەی شیعە مەزهەبەکانیان ئاگادارکردنەوە کە دەبێ لە گەڕەکەکەیاندا بارکەن و لەهەمان کاتیشدا سوننەکان لە گەڕەکە شیعەکاندا دەرکران. ئەوانەی خۆیان لە گێلی داو باریان نەکرد کوژران. گەڕەکە هاوبەشەکانی سوننە و شیعە لە بەغدادا بوونە سەربازگە و پڕیان لە چەکدارانی هەردوولا بوو.

أطوار بەهجەت، خانمی پەیامنێری تەلیڤزیۆنی العربیە، کە هەواڵی تەقاندنەوەکەی بیست، لە بەغدادەوە ڕا بە هەڵەداوان چووە سامەڕا، کە شاری خۆی بوو. دوای دە خولەک لە ڕاپۆرتێکی زیندی لە نزیکی مەرقەدەکە، چەند چەکدارێک بەخۆی و بەخالد محمد الفلاحی کامێرامان و عدنان خیراللەی دەنگسازیان ڕفاندن و گوللە بارانیان کردن. باوکی أطوار بەهجەتی شیعە و دایکیشی سوننە بوو. وەک ئەوەی بڵێی چیتر لە ئێراقی نوێدا جێی پێکەوە ژیانی شیعە و سوننە نەماوە، چەکدارانی سوننە پاشتر هێرشیان کردە سەر کاروانی جەنازەکەی و یەکێکیان لێیان کوشت و کەسێکی تریشیان زامدار کرد.

لەو دەمەی شەڕی ناوخۆ پەرەی سەند، ئێراق تەنیا حکومەتێکی کاتی هەبوو. لە دیسێمبەری ٢٠٠٥دا، ئێراق سێیەمین هەڵبژاردنی سەرتاسەری لە یەک ساڵدا کردو پارلەمانێکی هەمیشەیی لە سایەی دەستورێک هەڵبژارد کە لە ١٥ ئۆکتۆبەر، بە دەنگ پەسند کرابوو. هەڵبژاردنەکە بەو مەبەستە ئەنجام درا تا کۆتایی بە ساڵێک لە ئیدارەی کاتی بێنێ، بەڵام دەمارگیری ئایینی و نەتەوەیی هێشتا گرژتر کرد. شیعەکان دەنگیان بەپارتە شیعە ئایینییەکان داو کوردیش دەنگی بە پارتە نەتەوەییە کوردییەکان و سوننەکانیش دەنگیان یان بە پارتە سوننە نەتەوەییەکان یانیش بەپارتە سوننە ئایینییەکان دا. کەمتر لە دە لە سەدی دەنگدەرانی ئێراقی دەنگی خۆیانیان دا ئەو پارتانەی کە نە ئایینی و نە نەتەوەیی بوون. وا پێشبینی

دەكرا كە دەستوری ئێراق ببێتە هۆی كۆكردنەوەی زۆرینەی دەنگەكان چونكە بۆ پێكهێنانی حكومەت پێویستی بە زۆرینەی دوو سێیەكی دەنگەكان دەبێ. بەڵام هەر سێ چینی كۆمەڵگەی ئێراقی عارەبی شیعەو عارەبی سوننەو كوردەكان هیچیان نە بەهای هاوشێوە و نە پرۆگرامێكی هاوبەش و نە هاوپەیمانێتی و نە پابەند بوونێكی تەواویان بە یەكێتی خاكی ئێراق هەیە. هەرچەندە بە شێوەیەكی زۆر هەموو لایەنەكان دەیانویست كە حكومەتێكی یەكێتی نیشتمانی پێك بهێندرێ كە هەر سێ گروپە سەرەكییەكانی ئێراقی تێدا هەبێ، بەڵام هێشتا، دوای هەڵبژاردنەكە، چوار مانگی تەواوی برد تا تواندرا سەرۆكێك و دوو جێگری سەرۆك و سەرۆكی پارلەمان و بریكارەكانی و سەرۆكێك بۆ ئەنجومەنی وەزیران بۆ وەڵات دەستبژێر بكەن.

وەڵاتە یەكگرتووەكان لە ناوەڕاستی ئەو شەڕە ناوخۆییەی ئێراقێ دایە. عارەبە سوننەكان لەو باوەڕەدانە كە وەڵاتە یەكگرتووەكان ئێراقی خستە بەردەستی عارەبە شیعەكان و ئێرانییەكانەوە. لە ئەنجامی ئەو كۆشتارەی لە ٢٢ی شوباتی ٢٠٠٦ دا كرا، سوننەكان گلەیی ئەوەیان لە سوپای وڵاتە یەكگرتووەكان كرد كە لەو دەمەی شیعەكان مزگەوتەكانی سوننەكانیان دەڕووخاند، لەشكرەكە خۆی دوورەپەرێز گرت. شیعەكانیش وڵاتە یەكگرتووەكانیان وا گومانبار كرد كە بەر لە ڕووخاندنی مەزارەكەی سامەڕا، لای سوننەكانی گرتبوو. عبد العزیز الحكیمی سەركردەی گەورەترین پارتی شیعەكان، باڵیۆزی ئەمێركای بۆ ئێراق، زالمای خلیل زادی، بەوە تۆمەتبار كرد كە لە میانی ئەو رەخنانەی ئاراستەی تۆماری مافی مرۆڤی هێزەكانی ئاسایشی كرد كە شیعەكان ڕێنمایی دەكەن، "ڕووناكی سەوزی" بۆ تیرۆریستەكان پێكرد. چونكە خلیل زاد سوننەیە و بە ڕەچەڵەک خەڵكی ئەفغانستانە و ڕەگەزنامەی ئەمریكی وەرگرتووە، بۆیێ شیعەكان بە "أبو عمر" ناوزەدی دەكەن؛ ئەمەش ئاماژەیە بۆ دووەمین خەلیفەی سوننەكان، كە، بە بۆچوونی شیعەكان، لە سەدەی حەفتەمین، مافی خەلیفایەتی بۆ خۆی پاوان كردووە. مقتدی الصدریش كە سەركردەی سوپای مەهدی دەكا، وڵاتە یەكگرتووەكانی بەڕووخاندنی مەرقەدی عەسكەری تاوانبار كرد و گوتی كە ئەمریكییەكان لە صدام حوسێنیش خراپترن. بەقسەی مقتدی الصدر ئەمریكییەكان بۆ ئەوە ئێراقیان داگیر كرد تا مەهدی بكوژن، چونكە ئەمریكییەكان دەزانن كە ڕۆژێك دێ هەر دێتەوە.

لەو دەمــەی ئەو ڕووداوە تۆقـێنەرانـە لە سـامـەڕا و لە بـەغـداد دەقـەومـان، من لە بارەگـای سـەرۆکی کـوردسـتـان مـسـعـود بارزانی، لە بەغداد بـووم و دوا بەندی ئەم کتێبـەم ئامادە دەکرد. چونکە بارەگایەکە لە سـەنتەری گرین زۆونی بەغداد بوو، زۆر بەچڕیش دەپارێزرا، بۆیێ سەرکردە ئێراقییەکان لەوێ کۆ ببوونەوە و بابەتی شەڕی ڕێبـازگـەری و پێکـهـێنـانی حکومـەتیـان تـاووتوێ دەکـرد. لەو دەمـەی کـە قـەیرانی وڵاتەکەیان تێکەوڵێکە دەکرد، ئاشکرا بوو کە تەنگژەکەیان بەشەڕی ناوخۆ دەبینی و زۆر لەوانەی قسەیان لەگەڵ مندا کرد، بەڕاستی ئەم دەستەواژەیەیان بەکار هێنا. وەک ئەوەی تا جەخت لەو خاڵە بکەنەوە و لەو دەمەی کە دوا بڕگەکانی ئەم کتێبەم دەنووسـینەوە، سێ مووشـەکی کـاتیۆشـای نۆ پێیی لە مـەودایێکی نزیکی بارەگـای بارزانی کـەوتنە خـوارەوە. خـۆشـبـەخـتـانە، نزیکتـرینیـان کـە لە دەوروبەری بیـست یاردێک لە من دوور کەوتەوە، چرووکی کرد. سـەرە پڕ لە تەقـەمـەنییـەکـەی سێ پێ لە قیرِی گەراجەکە شتر بوو، بەڵام هیچ زیانێکی نەگەیاند.

بەپێچەوانەی ئێراقییەکان، بەڕێوەبەرایەتی بوش وا دیار بوو کە نەیدەتوانی تێبگا، چ بوو کە ڕووی دەدا. تەنیا چەند کاتێک لەدوای تەقاندنەوەی مـەرقـەدی عـەسکەری، وەزیری دەرەوەی وەڵاتە یەکگرتووەکـان، کـۆندۆلیـزا ڕایس، هاتە سـەر تەلیـڤـزیۆنی میـسـری. مێرڤت مـحـسن، کە دیمانەکەی دەگەڵدا ساز دەکرد، باری ئێراقی بە پێی بۆچوونی سوننەکان کورت کردەوە و لێی پرسی.

دەست تێـوەردانـی بێ ئەندازەی ئـێـران دەسـەڵاتی بە شـیـعـەکـان دا. ئێـرانی دراوسێ شـیـعـەیە. سـوننەکـان بووینە جێی گـومـان. هـاوپەیمانە عـارەبە مـتـمـانە پێکراوەکانی وەڵاتە یەکگرتووەکان سوننەنە. ئەرێ ئێوە چتان کرد و چ دەکەن؟

ڕایس مکوڕ بوو لە سـەر ئەوەی کـە پرۆسـەی سیـاسی ئێراقی بـەڕاسـتی بەڕێوە دەچوو. باشە، من وا مەزندە ناکەم کە شەڕی ناوخۆ لە ئێراقیدا هەبێ. بەڵکو وای بۆ دەچم کە ئەوەی لە ئێراقیدا هەیە ئەوەیە کە ئێراق وڵاتێکە لەمێژ بوو لە بن چەنگی دیکتاتۆرێکی تۆقێنەر بوو، هەر ئەو دیکتاتۆرەش بوو کە نائارامی لەم هەرێمەدا بەرپا کـرد و چەندین شـەڕی لە دژی دراوسـێکانی گـڕ دا. ئێـسـتـاش وا ئەو دیکتـاتۆرە ڕۆیشت و گـەلی ئێـراق وا سـەری مـەیدانی گرتووە، ئەو گەلەش لە چەندین پارچەی

جودا پێکهاتووە، لە چەندین ڕەچەڵەکی جیاواز پەیدانە. ئەو گەلە ئێستا خەریکە بە پرۆسەیێکی سیاسی، چارەسەرێکی مامناوەندی بۆ سەرکوتکاری دەدۆزێتەوە."

سەرۆک بوش و گەورە ڕاوێژکارانی خۆزگەکانیان سەبارەت بەئێراق بەبەردەوامی لەجێی توێژینەوە ڕاستەکان دادەنێن؛ لە بری دانانی ستراتیژی گونجاویش هەر ئومێد دەخوازن. لە تەموزی ٢٠٠٤، ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی، هەستا خەملاندەی هەواڵگری نەتەوەیی (خــــەن) National Intelligence Estimate NIE دەربارەی بارودۆخی ناوەوەی ئێراقیی، ئامادە کرد. (خەن) بە پێی هزری کۆمەڵێک لە باشترین لێکۆڵەرەوەی پسپۆر لە کاروباری ئێراق کە پشتیان بە باشترین هەواڵگری بەردەستی وەڵاتە یەکگرتووەکاندا بەستووە، (خەن) وشیاری مەترسی شەڕی نێوخۆی دا. کە لە سێپتێمبەری ٢٠٠٤یش، پرسیاریان دەربارەی (خەن) لە سەرۆک بوشی کرد، بایەخێکی پێی نەداو گوتی:- "سی ئای ئێی گوتی، دەشێ ژیان بە دەروێشی بچێتە سەر، دەشبێ باش بێ، دەکرێ باشتریش بێ. گەلی ئێراقی وەک ئەوان ڕەشبین نییە.

لە ٤ی حوزەیرانی ٢٠٠٥، لە هەولێری باکووری ئێراق، ئامادەی یەکەم کۆبوونەوەی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان بووم کە تازە هەڵبژاردرا بوو. لەوانەی ئامادەی دانیشتنەکە بوون، سەرۆکی ئێراقی، جەلال تاڵەبانی بوو. تاڵەبانی کە کوردە، تەنیا یەکەم سەرۆک نییە کە لەوەتی ئێراق ئێراقە بە شێوەیێکی دیموکراسی هەڵبژاردرابێ، بەڵام یەکەم سەرۆکە لەوەتی ئەو وڵاتە هەیە، کە مێژووەکەی تا سەردەمی باخەکانی عەدن دەڕوا، ئەمە یەکەم جارە سەرۆکێک لێرە ئاوا هەڵبژێردراوە. بە قسەی برادەرێک تاڵەبانی، "یەکەم سەرۆکە لەوەتی ئادەم بە تەنیا لێرە دەژیا تا ئیمڕۆ، کە بە ئازادی هەڵبژاردرابێ." لەو دەمەی کە کوردەکان شانازی بەو دەستکەوتە دەکەن، ئاڵای ئێراق، کە تاڵەبانی سەرۆکییەتی، بە ڕاشکاوی دیار بوو کە نە لە ئاهەنگی دەستپێکی پارلەماندا هەبوو، نە لە هیچ شوێنێکی هەولێریشدا دەبیندرا. هەولێر شارێکی یەک ملیۆن کەسییە و پێتەختی هەرێمی کوردستانی ئێراقە.

ئان بۆودین، کە سەرۆکی ئۆفیسی باڵیۆزخانەی ئەمێریکایە لە کەرکووک، لە ئاهەنگەکەدا قسەی کرد و پیرۆزبایی لە پارلەمانتارەکان کرد و جەختیشی کردەوە

کە وڵاتە یەکگرتووەکان پا بەندە بەئێراقێک کە، بە قسەی ئەو، "دیمۆکرات و فیدراڵ و فرەلایەن و یەکگرتوو دەبێ." بە ئاشکرا لە هەولێر دیار بوو کە ئەو دەستەواژەیە پەیرەو نەبوو. لە میانی سوێند خواردنەکەیاندا، لە پارلەمانتارە کوردەکان داوا کرا سوێند بخۆن کە بۆ یەکێتی خاکی هەرێمی کوردستانی ئێراق دڵسۆز بن. زۆربەیان بەوردییەوە ی ئێراق" یان نەگوت.

کورتترین گوتار سەرۆکی دەزگای ئیتیلاعاتی ئێرانی لە هەولێر، کە پیاوێکە کوردەکان بەئاغای پەنایی دەیناسن، خوێندییەوە. تەماشای ناو چاوی خانمی بۆودین دەکرد کە بە شێنەییەوە گوتی، "ئەمە ڕۆژێکی گەورەیە. ئەو خەڵکەی کە ئێمە، لە سەرتاسەری ئێراق پشتیوانیمان دەکردن، ئەمڕۆ وا دەسەڵاتدارن." هەرچەندە پەنایی نەیگوت، "سوپاس، جۆرج بوش. بەڵام وا لێی تێگەیشترا.

لە ئەنجامی ئەو داگیرکردنەی ئەمێریکایە کە کوردستان باری خۆی ڕێک خستووە و لە ڕاستیدا بووەتە دەوڵەتێکی سەربەخۆ و بەمەش هەڵەیێکی مێژوویی ڕاست کردۆتەوە. وینستن چێرچڵ لە ۱۹۲۱دا، کاتێک کە لە حکومەتە هاوپەیمانەکەی لۆید جۆرج وەزیری ئەنجومەنی وەزیران و بەرپرسی ڕۆژهەڵاتی ناڤین بوو، کوردەکانی ئاخنیە نێو ئێراقی عارەبییەوە. کوردەکان زۆربەی ساڵانی سەدەی بیستەمین لە دژی ئەم بڕیارە یاخی بوون و شۆڕشیان کرد. ساڵ لە دوای ساڵ وەڵامی سوپای ئێراقی لە دژی کوردەکان توندوتیژتر دەبوو، تا لە سەردەمی صدام حسینی، لە ساڵانی ۱۹۸۰کان و لە میانی شاڵاوەکانی ئەنفال ئەو پەلامارانە گەیشتنە ترۆپکی توندی و تیژییەوەو بە خەستی گازی ژاراوی لە دژی گوندەکانی کوردان بەکار هات. چێرچڵ بە زۆری لکاندنی کوردانی بە ئێراقەوە بە گەورەترین هەڵە ناساند کە کردوویەتی، هەرچەندە سەرۆک بوش پەیکەرێکی نیوەی چێرچڵی لە نۆڤەڵ ئۆفیسی داناوە، بەڵام ڕەنگە ئەو هەڵەیەی چێرچڵی ڕاست نەکاتەوە و بەم کارەشی هەڵەیێکی هێندەی هەڵەکەی چێرچڵ دووبارە دەکاتەوە.

هەر وەک ئاغای پەنایی چۆن لە گوتارەکەی ئاماژەی پێ دا، ئێران لە هەموان پتر، سوودی لە شەڕی ئەمێریکی لە ئێراق وەرگرتووە. تەنانەت لەوەتی عوسمانییەکان و پارسەکان لە پەیمانی قەسری شیرین، لە ۱٦۳۹دا، ڕێککەوتن کە هێڵێکی سنووری

لە نێوانی هەردوو ئیمپراتۆرییەتەکان بکێشن، ئەو هێڵە تا ئێستاش سنووری نێوان ئێراق و ئێرانەو پارسەکانی لە عارەبان جودا کردۆتەوەو ئەو خاکەشی کە شیعەکان فەرمانداری دەکەن لەوە هاوێر کردووە کە سوننەی تێدا حوکمرانی دەکا. بەڵام لە ۲۰۰۳وە، ئەو حیزبە سیاسییە شیعانەی کە ئێران پشتی گرتوون نۆ پارێزگا لە باشووری ئێراق و بەغدادی پایتەختیش بەڕێوەدەبەن. پارتە ئایینییە شیعەکان دەستیان بەسەر حکومەتی ناوەندی بەغداد داگرتووەو کۆنترۆڵی وەزارەتی ناوخۆ دەکەن و بەمەش توانیویانە ئەو ملیشیایانەی کە ئێران مەشقی پێ کردوونە بخزێننە نێو هێزی پۆلیسەوە. ئێران چەنگی خۆی لەو سوپایەی ئێراقێ گیر کردووە کە وەڵاتە یەکگرتووەکان دروستی کردووە و پەیوەندی ئابووری لەگەڵ بەهێز دەکەن و بەم زووانەش دەزگا نەوتییە ستراتیژییە گرینگەکانی هەردوو وڵات بەیەکەوە دەبەستنەوە.

ئەم پێشکەوتنانە بایی هیچ تۆزقاڵێکیش سەیر نییە. لەو دەمەی سەرۆک بوش لە گوتاری باری یەکێتی State of Union کە لە یەنایری ۲۰۰۲، پێشکەشی کردو کردییە دەستپێکی ئامادەکردنی گەلی ئەمێریکا بۆ شەڕ دەگەڵ ئێراقیدا، لە هەمان کاتیشدا تەوەری خراپەکاری Axes of Evil، کە ناوی ئیران و ئێراق و کۆریای باکووری تێ کردبوو، ڕیسوا کرد. لەو دەمەدا هیچ جووتە دەوڵەتێک لە سەر ئەم زەمینەدا نەبوو کە هێندەی ئێرانی ئایەتوڵڵایەکان و ئێراقی سەددام حوسێنی دوژمنی یەکتری بن. ئێستاش لە ئەنجامی شەڕەکەی سەرۆک بوش هیچ دەوڵەتێک نییە ئەوەندی ئیراقی ئایەتوڵڵایەکان هاوپەیمانی ئێران بێ. ڕەنگە ئەو تەوەرەی بەغداد تاران دەرئەنجامی شۆڕشگێرانەی بۆ ڕۆژهەڵاتی ناڤین هەبێ. ئێراق ئێستا تاکە وڵاتی عارەبییە کە شیعە فەرمانداری دەکەن. ئەو سەرکەوتنەی شیعانیش لە ئێراقێ، بێگومان کاریگەری خۆی لەو کەوانە شیعەنشینە دەبێ کە لە باشووری ئێراقێوە ڕا بۆ ناو هەرێمی ڕۆژهەڵاتی عارەبستانی سعودی درێژ دەبێتەوە و تا ناو بەحرێنیش نابڕێتەوە. ئەم کەوانە شیعەنشینە لە سەر گرینگترین کۆگەی نەوتی ئەم جیهانە پەلی لێ کێشاوە.

لەو دەمەی کە وڵاتە یەکگرتووەکان پێی لە چوارەمین ساڵی داگیرکردنی ئێراقێ نا،

١٣٠ هەزار سەربازی لەوێدا هەبوو کە لە دژی عارەبە سوننە یاخییەکان شەڕیان دەکرد، ئەم کەمینەیە لە ٢٠ لە سەدای دانیشتوانی ئێراقێ ڕەت نادەن. ئەو عارەبە سوننە یاخییانە، ناتوانن لە ڕووی سەربازییەوە، سەرکەون و ناکرێ بە ئاسانیش بیانبەزێنین. وەڵاتە یەکگرتووەکان دەتوانێ یاخییە چەکدارەکان لە ناو شارەکان ڕامالێتە دەرەوە، بەڵام هێندە لەشکرەی نییە کە خاکەکە بگرێ و ئیتر چۆلی نەکا. کە یاخییەکان لە شوێنێک ڕاودەندرێن، دەچنە شوێنێکی تر و هەرکە ئەمێریکییەکان لەو جێیە دەردەچن، یاخییەکان دیسان بۆ شوێنەکانی خۆیان دەچنەوە.

یاخی بوون، شەڕی ناوخۆ، سەرکەوتنی ستراتیژی ئێرانی، لەباریەکتری شکانی ئێراق، کوردستانێکی سەربەخۆ، گرفتی سەربازی. ئەمانە هەموو دەرئەنجامی داگیرکردنی ئێراقە لەلای ئەمێریکا و سەرۆک بوش نەیتوانی پێشبینییان بکا. کە سەرۆک بوش و گەورە ڕاوێژکارانی باسی هەندێ لەو بابەتانەیان کرد؛ بۆ نموونە دانیان بەوە دانا کە سەریان لە یاخیبوونی سوننەکان سوڕمابوو. هەمیشە نکوڵیش لە هەندێ لە بابەتەکانی تر دا دەکەن. سەرۆک بوش لە گوتاری ٢٠٠٦ی تایبەت بە باری یەکێتی دا گوتی:- "دەرەنگ تێگەیشتن ناکاتە زیرەکی و دووەم جار خەملاندنیش، ستراتیژێک نییە. بێگومان ئاشکرایە بۆچ سەرۆک لە ڕابردوو وردبوونەوەی پێ پەسند نییە. لەبەر ئەوە نییە کە نەیتوانی هەندێ لە دەرئەنجامەکانی شەڕ پشتەوشار بکاتەوە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە هەموو ئەو ئەنجامانەی لە کیس چوو. مرۆڤ کە ستراتیژ دادەنێ ئومێدی چاکترین ئەنجامی لێ دەکا، بەڵام خۆ پێویستە خۆی بۆ خراپترین ئەنجامیشی تەیار بکا. بەڕێوەبەرایەتی بوش هیوای ئەوەی خواست کە لەشکری ئەمێریکی وەک ڕزگارکەر پێشوازی لێ بکرێ و ئێراقییانیش بەپیری دیمۆکراسییەوە دەچن، بەڵام هیچ جۆرە پلانێکی بۆ باری نائاسایی ڕێک نەخستبوو بۆ ئەوەی پەیڕەویان بکا، ئەگەر ڕووداوەکان بەپێی پێویست بەڕێوە نەچوون.

لە ئێراق، هەندێ لە بەرهەمەکان، دەرئەنجامی حەتمی داگیرکردنن. لە دوای جەنگی یەکەمی جیهان، بریتانیا هەر سێ ویلایەتی عوسمانی موسڵ، بەزۆرینەی کوردەوە لە باکوور و بەغدادی بەزۆرینەی سوننەوە لە ناوەڕاست و بەسرەی

شیعەنشین لە باشوورەوەی، بە شێوەیێکی ڕەمەکی، پێکەوە پینەکردن و ئێراقی لێ پێک هێنان. بەشە عارەبەکانی دەوڵەت ناسنامەیێکی هاویەشیان هەبوو، بەڵام کوردەکان نەیانویست ببنە بەشێکی ئەو دەوڵەتە تازەیە. لە ۱۹۲۱، بریتانییەکان میرێکی بیانی سوننەیان لە حجازەوەڕا هێناو کردیانە پاشای ئێراق. ئەو میرە ناوی فەیسەڵ و خەڵکی حجاز بوو. فەیسەڵ و نەوەکانی لە ڕێگەی بیوروٚکراسی و سەربازییەکی عارەبی سوننەوە ئێراقیان بەڕێوەبرد. لە ۱۹۵۸، لەشکری ئێراق حوکمی پاشایەتی ڕووخاند و فەیسەڵی دووەمی کوڕەزای فەیسەڵی یەکەمی گوللەباران کرد، بەڵام هەر عارەبی سوننە باڵادەست مانەوە و بۆ ئەوەی دەسەڵاتیان لە دەست نەچێ و ئەو ٥٥ لە سەدای شیعە و ۲۰ لە سەدای کورد هەر حوکم بکەن، بە شێوەو جۆری جیاجیا هێزیان لە دژیان بە کار برد.

وڵاتە یەکگرتووەکان لە ۲۰۰۳، دوا دڵڕەقترین دکتاتۆری عارەبی سوننەی لە ئێراق لە سەر کورسی حوکم دەرکرد. یەکەمجار سوپای ئێراقیی بەزاند، پاشان بە شێوەیێکی یاسایی سوپای ئێراق و دەزگاکانی موخابەرات و حیزبی بەعسی هەڵوەشاندنەوە. سوپاو پۆلیسی نهێنی وایان کردبوو کە کەمینە عارەبە سوننەکان بۆ ماوەی هەشتا ساڵ فەرمانداری ئێراقێ بکەن. دوای ئەوەی ئەو دەزگا سەرکوتکەرانە نەمان، زۆرینەی شیعەکان لە ئەنجامی هەڵبژاردنێکی دێموٚکراتی لە ۲۰۰٥، دەسەڵاتیان هاتە دەست و دەزگا سەرەکییەکان، لەوانە پۆلیسیشیان خستە ژێر جەڵەوی فەرمانی ڕێبازگەری خۆیانەوە. لە دانوستانە دەستوورییەکەی ئابی ۲۰۰٥دا، کوردەکان توانییان سەربەخۆیی خۆیان بتەو بکەن و ئاواتە هەمیشەییەکەی خۆیان بەجێ بێنن. عارەبە سوننەکانیش بە لەدەستدانی دەسەڵاتە تاکڕەوییە مێژووییەکەیان نیگەران بوون و دەستیان بە بەرهەڵستی چەکداری حوکمی شیعەکان کرد. شەڕی ناوخۆ هەمیشە لەگێن بووە ڕوویدا. ئەوەی لەبەر چاو دیار بێ تەنیا ئەوەیە کە بەڕێوەبەرایەتی بوش سەری لەو ئەنجامە سوڕماوە.

بەڕێوەبەرایەتی بوش وای گری کردبوو کە گواستنەوەی دەسەڵات لە دکتاتۆرییەتی سەددام و عارەبی سوننەوە بۆ فەرماندارییەکی سەقامگیر لە ئێراقێ، کارێکی ئاسان دەبێ، هێندە ئاسان دەبێ کە بەڕاستی پێویستی بەوە نابێ پلانێکی چڕوپڕی بۆ ڕێک

بخریَ. زۆربەی ئەو گرفتانەی کە ئێستا ڕووبەڕووی وەڵاتە یەککگرتووەکان دەبنەوە، لە ئەنجامی نەبوونی پلانێک پەیدا دەبن کە بۆ یەکەم ڕۆژی دوای چوونی سوپای ئەمێریکی بۆ ناو بەغداد، ئامادە نەکرابوو. بۆ باش سەقامگیرکردنی ئێراق، پێشەوەرە سەربازییەکان ویستبوویان لەوە پتر لەشکر بنێرن کە سەرکردە سیڤیلەکانی پێنتاگۆن دایاننابوو. بەڵام تەنانەت لەگەڵ ئەوەش کە سوپای لە ئێراقیدا هەبوو، وەڵاتە یەگرتووەکان دەیتوانی وەزارەتەکانی حکومەتی ئێراقی و گرینگترین دەزگا نەتەوەییەکانی وەک مۆزەخانەی شوێنەوارە دیرۆکییەکان بپارێزێ، ئەگەر پلانێکی بۆ ڕێک بخرابا. لە هەشت حەوتە گرینگەکەی دوای ڕووخانی سەددامی، لە کاتێکدا کە دزو پاتارچییان دەزگا گشتییەکانی پایتەختیان هەموو دزی، کاربەدەستانی وەڵاتە یەککگرتووەکان لە ئێراقێ خۆیان دوورەپەرێز گرت و ئاشکرا بوو کە سوپای وەڵاتە یەککگرتووەکان یان نەیدەویست یان نەیدەتوانی بارودۆخەکە سەقامگیر بکا.

لە دوای ئەو کارەساتەدا، چواردە مانگ لە بندەستی هەر لە سەرەتاوە تا کۆتایی هەمووی بەخراپی بەڕێوە چوو. سەرۆک بڕیاری نەدا ئایا دەسەڵات بداتەوە حکومەتێکی کاتی ئێراقی یان وڵاتە یەککگرتووەکان، بەخۆی، چۆن لە دوای شەڕ ئەڵمانیا و ژاپۆنی بەڕێوەبرد، ئاواش ئێراق بەڕێوە ببا. بەڕێوەبەرایەتی بۆ ماوەی یەک مانگ دوای ڕووخانی بەغدا هەردوو سیاسەتی شانبەشانی یەکتری پەیڕەو کرد. کە وەزیری بەرگری دۆونەڵد ڕامسفیلد بەڕێوەبەرێکی بۆ ئێراق نیشان کرد، دیپلۆماتێکی خانەنشینی بژار کرد کە هیچ شارەزاییەکی دەربارەی وڵاتەکە نەبوو؛ تەنیا دوو حەفتەی ماوە پێدا بۆ ئەوەی خۆی بۆ ئەرکەکە تەیار بدا. بەڕێوەبەر ل. پۆوڵ بریمەری سێیەم دوای سێ ڕۆژی لە ئێراقێ بڕیاری دا کە ئەو بە خۆی وڵاتەکە بەڕێوە دەبا، نەک ئێراقییەکان. لە ئەنجامدا هەوڵێکی زۆر بۆ دووبارە دروستکردنەوەی وڵات درا، کە هیچی کاریگەر نەبوو. ڕووی سیاسەتی گۆڕی، نەتواندرا ڕاژەگوزارییە بنەڕەتییەکان (بەتایبەتیش کارەبا) وەک خۆی لێ بکاتەوە، ئاستی ئابووری داتەپی و ئەو بڵێۆنەها دۆلارەی ئێراق و وەڵاتە یەککگرتووەکان بە شێوەیەکی ناڕەوا دەست بڵاوی لێ کرا، گەندەڵی پەرەی سەند، هەوڵەکانی بۆ

دووباره دروستکردنەوەی سوپای پۆلیسی ئێراق دران هەمووی بەفیڕۆ چوو.

ئەو ئاواتە گەورانەی کە بەڕێوەبەرایەتی بوش داینابوو لە ئێراقێ پیادەیان بکا، هەموویان بەقوربانی فیزو نەزانی و ترسی سیاسی کران. هەرچەندە شارەزایان لە بواری ئێراقی وشیارییان دا، هێشتا بەڕێوەبەرایەتی خۆی بۆ داتەپینی یاساو کاروباری گشتی خۆی ئامادە نەکردو وایان دەزانی کە ڕۆژی پاش ڕووخانی سەددام حسێنی پۆلیس و بیورکراتی ئێراقی بەخۆیان دێن و ڕاپۆرتی پێویست پێشکەش دەکەن. ئەم دیاردەیەش هاوکات بوو لەگەڵ ئەوەی کە نەیانویست ژمارەی سەربازی پێویست لە ئێراقێ بڵاوە پێ بکەن و دەسەلاتیش بەو سەربازانە بدەن کە ڕەوانی ئەوێ کراون تا یاسا بپارێزن و نەهێڵن پشێوی ڕووبدا. لەو دەمەش کە ئازایانە خۆیان بۆ بنیاتنانەوەی وڵات ئامادە دەکرد، بەڕێوەبەرایەتی لە بری ئەوەی کە گوێ لە بیروبۆچوونی ئەوانە ڕابگرێ کە شتێکیان دەربارەی وڵاتەکە دەزانی، چوو پشتی بە بۆچوونی ستافێکی ناپسپۆرو بێ توانا بەست. لە میانی ئەو سەردانییانەی دوایم بۆ ئێراقێ، لە سەرکردە سیاسی هەڵبژێردراوەکانم پرسی ئایا وڵاتە ئەککرتووەکان لە کوێ بەهەڵەدا چوون. هەموویان هەمان وەڵامیان دامەوە: کە وڵاتە یەککرتووەکان لە بری هێزێکی ئازادکەر، بووە هێزێکی داگیرکەر؛ بە کورتی، کە بەڕێوەبەرایەتی بوش بڕیاری دا بۆ دەستنیشانکردنی ئایندەی وڵات خۆی لە خەڵکی خودی وڵاتەکە بەتواناترە، تا بن ملی سەرچیغ چوو.

سەرۆک بوش باسی ئێراقێ دەکا وەک ئەوەی نەواوکەری خەباتێکی بەرفرەتربێ تا ئازادی بۆ ڕۆژهەلاتی ناڤین وەدەست بێنێ. لە میانی خۆ تەیاردان بۆ شەڕ، جێگری سەرۆک ڕیچەرد چێنی و سیڤیلە بەرپرسەکانی پێنتاگۆن ڕەمسفیڵدو بریکاری وەزیر پۆوڵ وۆڵفوودز و جێگری وەزیری بۆ کاروباری سیاسی دۆگلەس فێیت پشتیوانی شەڕیان کرد چونکە ئەوپەڕ ئاواتیان بوو کە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بکەنە لایەنگری ڕۆژئاواو بیکەنە دیمۆکراسییەکی بازاڕی ئازادو وا بکەن کە پەیوەندی باشیان لەنێوان خۆیان و دەگەڵ ئیسرائیلیش هەبێ. ئێراق پەلاپیتکەی گەمەکەی داگرت بۆ ئەوەی پاشتر ئێران و سوریاش برووخێنێ. بۆ ئەنجامدانی ئەم ئیشەش، پێویست بوو بەڕێوەبەرایەتی بەخەیاڵ چەند وێنەیێکی زۆرینەی شیعەی ئێراقێ بکێشێ و

بزانێ دوای دەسەڵات بە دەستەوە گرتن چۆن هەڵسوکەوت دەکەن. وۆڵفوودز پێشبینی ئەوەی کرد کە شیعەکانی ئێراقێ لە دژی دەوڵەتی مەلایان دەبن و حکومەتێکی لایەنگری رۆژئاوای وا پێکدێنن کە لەڕاستیدا جێ بە ئایەتوڵڵایەکانی ئێرانیش تەنگ دەکا. سیناریۆکە هێندی ڕاستی پشتگوێ خست: ئێران دەیان ساڵ بوو یارمەتی شیعە ئێراقییەکانی دەداو پارەی بۆ پارتە سیاسییەکانیان وێر دەکردو میلیشیاکانی مەشق دەدا و کەرستەی شەڕیشی بۆیان مسۆگەر دەکرد. ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی لە ئێراق کە گەورەترین پارتی سیاسی شیعییە، لە ١٩٨٢، لە بەر سایەی ئێران، لە تارانێ دامەزرا. ناوەکەی خۆی لە خۆیدا، کلیلی ئەجێندەی سیاسی حزبەکەی پێوە دیارە. بەشێک لە ئامانجی ئەو شەڕە ئەوەبوو کە جمهوری ئیسلامی ئێرانی بنکۆڵ بکا، کەچی لە ڕاستیدا تاران گەورەترین دەستکەوتی ستراتیژی لە چوار سەدەدا، وەدەست هێنا.

بۆ بەرەواکردنی شەڕ، سەرۆک بوش گوتی کە:- وڵاتە یەکرتووەکانی ئەمێریکا ڕێگا نادا ڕژیمە هەرە ترسناکەکانی جیهان بە چەکە ئەوپەڕ کاولکارەکانیان لە جیهاندا، هەڕەشەمان لێ بکەن. ئێراق چەکی کۆمەڵکوژی (چکک) نەبوو. بەڵام چونکە سەرجەم سەرچاوەکانی وڵاتە یەککرتووەکان بۆ ئێراقێ تەرخان کرا، کۆریای باکوورو ئێران ئازاد بوون بۆ ئەوەی پرۆگرامی ئەتۆمی خۆیان ڕابپەڕێنن. کە وڵاتە یەککرتووەکان لە ٢٠٠٢ و ٢٠٠٣ خۆی بۆ شەڕی ئێراق ئامادە دەکرد، کۆریای باکوور پشکنەرانی نەتەوە یەککرتووەکانی دەرکردو لە پەیمانی پەرت نەکردنی چەکی ناووکی Nuclear Non-Proliferation Treaty کشاوەو دووبارە بۆ وەدەستهێنانی کەرستەی دروستکردنی چەکی ناووکی، دەستی بە پیتاندنی پلۆتۆنیەم کردەوە، ئەو پرۆسەیە پێشتر چاودێری دەکرا. سەرۆک بە ئاشکرا مکوڕ بوو لە سەر ئەوەی کە وڵاتە یەککرتووەکان ڕێگە نادا کۆریای باکوور بۆمبی ئەتۆمی هەبێ، بەڵام لە ڕاستیدا هیچی نەکرد.

لە سەرەتای ٢٠٠٦دا، ئێران جاڕی دا کە دەست بە پیتاندنی یۆرانیەم دەکا؛ ئەو بەرهەمەش دەشێ چەکێکی ناووکی لێ دروست بکرێ. چونکە هێزەکانی وەڵاتە یەککرتووەکان لە ئێراقێ بەستراونەتەوە؛ بۆیێ ئێران دڵنیا بوو کە ئەمێریکا ناتوانێ

ڕێی لێ بگرێ. موقتەدا سەدر وشیاری داو گوتی:- "ئەگەر پەلاماری وڵاتە ئیسلامییە دراوسێکانمان بدرێ، بە ئێرانیشەوە، ئێمە پشتیوانییان دەکەین. سوپای مەهدی تەنیا سوپای ئێراقێ نییە. بەڵکو بۆ ئەوە دامەزراوە بەرگری لە ئیسلام بکا." ئەم هەڕەشەیە گاڵتە نییە. لە کاتی ڕاپەڕینەکەی ٢٠٠٤ی سوپای مەهدی لە دژی داگیرکاری وڵاتە یەکگرتووەکان، سوپای مەهدی بە شێوەیێک ڕێی ئازووقەو تفاقی ئەمێریکییەکانی لە ئێراقێدا گرت، کە زۆری نەمابوو برێمەر بەشە خۆراک بەسەر ئەو هەزاران هەزار ئەمێریکییانە دابەش بکا کە بۆ حکومەتە داگیرکەرەکەی لە بەغداد، کاریان دەکرد. سوپای مەهدی لە ٢٠٠٦، بەلای کەم دوو هێندەی ٢٠٠٤ بە هێزە و ئێرانیش پشتیوانی شیعەکانی تر دەکا.

لە ئەنجامی داگیرکردنەکەی ئەمێریکایە، ئێستا زۆربەی ئێراقییەکان لە جاران باشترن. شیعە ئێراقییەکان دوای هەشتا ساڵ سەرکوتکردن، ئێستا ئازادن. هەرچەندە ئاواتەکانیان لەگەڵ ئاواتەکانی بەڕێوەبەرایەتی بوش یەکتری ناگرنەوە، بەڵام بەشێوەیێکی دیمۆکراتییانە پاشەڕۆژی خۆیانیان دیار کرد. کوردە ئێراقییەکانی خەریکن دەوڵەتی سەربەخۆی خۆیان پێک دێن و جێی شادمانییە کە ببینین یەکێک لە گەلە هەرە زوڵم لێکراوەکانی مێژوو وا بە سەر لووتکە دەکەوێ. عارەبە سوننە ئێراقییەکان وا تێدەگەن، ئەوان باریان لە جاران خراپتر بووە، بەڵام ئەوان تەنیا ٢٠ لە سەدای هەموو دانیشتوانی وڵاتەکەن.

لەگەڵ ئەمەشدا ناکرێ بڵێی وڵاتە یەکگرتووەکان لە جاران باشترە. هەرچەندە دەست پێ کراوە وڵاتە یەکگرتووەکان لە چەکە کۆمەڵکوژەکانی (چکک) بەر دەستی ڕژێمە خوێناوییەکان بپارێزرێ، بەڵام جەنگی ئێراقێ وڵاتە یەکگرتووەکانی پتر خستە بەر سێرەی چەکە ناووکییەکانی کۆریای باکوورو ئێرانەوە. هەروەها بە هۆی هەرەسهێنانی پلانەکانی بەڕێوەبەرایەتی، دزان بە ئازادی پرۆگرامەکانی ناووکی و پتر بایۆلۆژی ئێراقییان وەبەر دەستی کەوت. ڕەنگە هەندێ لەو کەرستانە بۆ ئێرانێ چووبێ، یانیش وەبەر دەستی تیرۆریستان کەوتبێ. بەمەش وڵاتە یەکگرتووەکان ئێستا لە جاران پتر کەوتۆتە بەر مەترسی چکک و کەرستەکانی تری ئێراقییەوە.

چونکە مەلایانی ئێران باشترین هەلی مێژوویییان بۆ ڕەخساوە تا بەئامانجە

دیرۆکییەکانیان لە ناو عارەبە شیعەکان بگەن، بۆیە شەڕەکە کۆسپەیێکی گەورەی لە سەر ڕێی وڵاتە یەکگرتووەکان لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین داناوە. تاکە "دەرکەوتەی دیمۆکراتی لە شەڕی ئێراقی، تا ئێستا تەنیا هەڵبژاردنی توندڕۆیەکان بووە کە لە فەلەستین و لە ئێران هەڵبژاردران. لایەنگرانی ئەمێریکا لە وڵاتانی عارەبی لە هەموو زەمانێک کەمتر بووەو لە هەندێ لەو وڵاتانەدا، ئوسامە لە سەرۆک بوش پەسند تر دەکەن. شەڕەکە پەیوەندی وڵاتە یەکگرتووەکانی دەگەڵ نزیکترین هاوپەیمانە ئەوروپاییەکانی تێک دا. هیچ کام لەو سەرۆکە ئەمێریکییانەی کە لە بیرمانن، هێندەی سەرۆک جۆرج و. بوش لە ئەوروپا بە چاوێکی سووک سەیر نەکراوە.

شەڕی ئێراق نەیتوانی سوود بە تاکە یەک بەرژەوەندی دەرەکی وڵاتە یەکگرتووەکان بگەینێ. وەڵاتە یەکگرتووەکانی ئارامتر نەکردووە؛ دیمۆکراسی لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین بڵاو نەکردەوە؛ ڕێگەی بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانیش خۆش نەکرد تا دەستی بە ئاسانی بە نەفت بگات. نرخەکەی زۆر گران کەوتووە. تا کاتی نووسینی ئەمە؛ ٢,٥٠٠ سەربازی ئەمێریکی کوژراوە، پتر لە چل هەزاریش زامدار بوونەو ٣٠٠ بلیۆن دۆلاریش خەرج کراوە. هەندێ لە ئابووریناسان وایان لێکداوەتەوە کە سەرکۆی خەرجی ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆی شەڕەکە، ڕەنگە لە ٢ تریلیۆن دۆلار ڕەت بدا[1] هەر چەندە دەڵێن، بەڵام بەردەوامی ئەم چالاکییە سەربازییانە وڵاتە یەکگرتووەکان لە سەرکەوتن نزیک ناکاتەوە.

(١) خاوەنی پاداشتی نۆبێل جۆزیف ستیگلیتزو شارەزای بودجەی هارڤاردی لیندا بیلمێس گرییان کردووە بەلایەنی کەم ١ تریلیۆن دۆلار بەهای شەڕەکەیەو ئەگەریش هەیە لە ٢ تریلیۆن ڕەت بدا لێکدانەوەکەیان بەهای مسۆگەر کردنی ژیانی ئەو جەنگاوەرانەش دەگرێتەوە کە لە ئەنجامی شەڕ پەکیان دەکەوێ و پێویستییان بە چاودێری دروستی هەمیشەیی دەبێ. بەهای ئابووری لەدەستدانی کوژراوەکانیشیان ڕەچاو کردووەو کاریگەری وەبەرهەمهێنانیشیان خستۆتە بەر تای تەرازوو و کاریگەریشی لە کەمی دارایی فیدراڵیشیان لە بیر نەکردووە.

# بەشی ٢

## ماستاو ساردکردنەوە

لە بەرەبەیانی ٢٢ی سێپتێمبەری ١٩٨٠، فڕۆکە جەنگییە تەکاندەرە ئێراقییەکان بۆردومانی فڕگە و دەزگا سەربازییەکانی ئێرانییان کرد. لەهەمان کاتیشدا، سەربازە ئێراقییەکان سنووریان بەزاندو لە باکوورەوە ڕا چوونە ناو هەرێمی کوردستان و لە باشووریشەوەڕا سنووری هەرێمی عارەب نشینی خوزستانیان بەزاند و بۆ ناو خاکی ئێران چوون. خۆزستان شوێنێکی ستراتیژییە، چونکە پیشەسازی نەفتی ئێران لەسەرەتای سەدەی بیستەمین لەوێدا دەستی پێکردو کۆگەیەکی گەورەی ئەو نەوتەشە. لەناوەڕاستی نۆڤێمبەری هەمان ساڵ ئێراق بەندەری گرینگی خوڕەمشەهری گرت و دەزگا نەوتییەکانی ئابادانیشی گەمارۆ دان. سەددام حسێن کە لە ساڵی پێشتر ببووە سەرۆکی ئێراقێ، وای بۆ چوو بوو کە ئەو گێرەشێوێنییەی لەدوای شۆڕشی ئیسلامی لەو دراوسێیە لەخۆ مەزنترەی دا بەرپا ببوو، یارمەتی دەدا تا خێرا بەسەریدا سەرکەوێ، هەر لەبەر ئەوەش بوو کە وەک جۆرە قومار کردنێک، پەلاماری دا

شەڕی ئێراق ئێران هەشت ساڵی ڕەبەقی خایاند. یەک ملیۆن کەسی تێدا چوو. دوو ملیۆنی تریش یان بوونە کەسانێکی پەککەوتە یانیش هەر بریندار بوون. پتر لە ١ ترێلیۆن دۆلاریشی تێدا خەرج کرا شەڕەکەی ئێراق ئێران لەلایەنی بەرەی شەڕو ئەو سەنگەرانەی تێیدا سازدران و جۆری بۆردومانی توندوتیژییەوە، هاوشێوەی شەڕی یەکەمی جیهانی بوو. ئەمەشیان وەک ئەو شەڕ، بووەگرێ کوێرەیەک و لایەنە شەڕکەرەکان نەیتوانی نەسەرکەوتن وەدەست بێنن نە لەسەر ئاگربەستێکیش لەنێوانیاندا ڕێک بکەون. لەلایێکی تریشەوە بەیەک دەچن: لە سەرەتای ١٩٨٣؛ بۆ ئەوەی ئێراق بەر پەرچی ئەو ژمارە زۆرەی سەربازانی ئێرانی بداتەوە، بەچڕی چەکی

کیمیایی پێشکەوتووی بەرهەم هێنا. ئەمەش یەکەمجار بوو ئەو چەکە لەدوای قەدەغەکردنی بەپێی پرۆتۆکۆلی ژنێڤی ١٩٢٥، بەکار بێت. ئەم پەیمانە لە ئەنجامی ترسی گازی ژاراوی شەڕی یەکەمی جیهانی، لە ژنێف مۆر کرا.

شەڕەکە بەڕواڵەت لەسەر شوێنێکی سنووری ناو ڕووبار بەرپا بوو. هەردوو ڕووباری ئێراق، دەجلە و فرات، لەباشووری ئێراقێ یەک دەگرن و ڕووباری شەتولعەرەب پێکدێنن، کە تاکە دەروازەی ئێراقە بۆ ناو دەریا. لە باشووری شاری بەسرە، کە پێشان بەندەری سەرەکی ئێراق بوو، شەتولعەرەب دەبێتە سنووری نێوان ئێراق و ئێران. ئێراقییەکان بەپشتیوانی بریتانییەکان، هەمیشە مکوڕ بوونە لەسەر ئەوەی کە سنووری ڕاستەقینەی وڵاتەکەیان دەبێ بکەوێتە ئەوبەری کەناری لای ئێرانەوە و ئێرانییەکانیش گوتوویانە سنوورەکە دەکەوێتە تالوێگ، واتا قووڵترین شوێن لە ناوەندی ئاوەڕۆی ڕووبارەکە دەبێتە سنوور. لە ١٩٧٥و لەمیانی پەراوێزی کۆبوونەوەکانی ئۆپێک لە جەزایر، شای ئێران و جێگری ئەوسای سەرۆکی ئێراق، سەددام حوسێن، ڕێک کەوتن کە تالۆێگ ببێتە سنوور و لە بەرانبەریشدا، شا قایل بوو هەموو یارمەتییەک لە شۆڕشی کورد لەئێراقێ ببڕێ و دەستی پێکرد کێشەکە لە بەرژەکی ئێراقێ بکاتەوە.

لە یەنایری ١٩٧٩، شا دەرکراو ئایەتوڵلا ڕوحوڵڵا خومەینی بووە حاکمی دیفاکتۆ لەئێران. خومەینی ڕقی لە ڕژیمی بەعسی ئێراقی دەبووەوە. خۆ هەر کەسایەتییە سێکۆلارە نەتەوە پەرستەکەی ئەو ڕژێمە نەبوو دژایەتی بەهایەکانی شۆڕشی ئیسلامی دەکرد، بەڵکو ئەو ڕژێمە شیعەکانی لەو وڵاتەدا سەرکوت دەکرد کە زۆرینەی دانیشتوانەکەیان پێکدێنا. ئەمەش شوێنە ئایینییە گرینگەکانی ئیسلامە شیعەکانیشی دەگرتەوە. خومەینی بۆ ماوەی چواردە ساڵ لە بانشگە لە نەجەف ژیابوو، کە مەرقەدی عەلی لێیە، کە ئیمامی یەکەم و دامەزرێنەری مەزهەبی شیعەیە (شیعە بەواتا ئەدەبییەکەی دەکاتە "لایەنگرانی عەلی"). خومەینی ڕاستەوخۆ دڕندەیی بەعسییەکانی بەچاوی خۆی دیت. بەخۆیشی بەتایبەتی ڕقی لێیان دەبووەوە. چونکە سەددام لە ١٩٨٧، بەخواستی شای، خومەینی لە ئێراقێ دەرکرد بڕیارەکەی دەرکردنی خومەینی هەڵەیەک بوو کە شا و سەددام کردیان. لە

بلانشگەکەی لە گەڕەکێکی پاریس، خومەینی سەرپەرشتی ڕاپەڕینەکەی ئێرانییانی لە دژی شا کرد، هەرگیز لە دەوڵەتێکی پۆلیسی وەک ئێراقێ ئەوەی پێ نەدەکرا.

هەر کە هاتەوە ئێرانێ، خومەینی ڕاستەوخۆ داوای لە شیعەکانی ئێراقێ کرد دا ڕژیمی عیلمانی برووخێنن و سستەمێکی ڕاستی ئیسلامی لە شوێنی دابمەزرێنن. سەددام زانی قافی هاتووە و زۆر بەتوندی وەڵامی داوە. ئەو هەوڵە نەزۆکەی لە١ی نیسانی ١٩٨٠، کابرایێکی شیعەی توندڕۆ دای بۆ کوشتنی بریکاری سەرۆک وەزیران تاریق عەزیز بووە بیانوویێک بۆ هێزەکانی ئەمنی ئێراقی و یەکسەر ئایەتوڵڵای گەورە محەمەد باقر سەدر و بنت و لهودای خوشکیان گرت. محەمەد باقر سەدر لە هەموو مەرجەعەکانی شیعەی ئێراقێ گەورەتر بوو. ئایەتوڵڵایان ناچار کرد کە سەیری خوشکەکەی بکا کاتێک کە دەستدرێژییان کردە سەر ئابرووی و پاشان کوشتیان. ئینجا ئەشکەنجەدەرەکان ئاگریان لە ڕیشی سەدر بەردا و پاشان بزماریان لە کەللەی سەری کوتا. خومەینی هێندە تووڕە بوو داوای ڕووخانی سەددامی کرد. لە ١٧ی سێپتێمبەر، سەددام ڕێککەوتنەکەی جەزایری هەڵوەشاندەوە و بڕیاری دا کە شەتولعەرەب هەمووی لەبن دەسەڵاتی ئێراقی دەبێ. پێنج ڕۆژ پاشتر جاڕی شەڕی لە دژی ئێرانێ دا. جگە لەو دوژمنداریییەی کە لە نێوان خومەینی و سەددامدا هەبوو، لەو بەربەرەکانییەی لەسەر خاک هەیانبوو، شەڕەکەی نێوان ئێران و ئێراق دەکەوتە ناو چوارچێوەی ئەو ململانێ ئایدیۆلۆژی و شارستانییەی کە لە نێوان هەردوو لادا هەبوو. سەددام وا خۆی بینی کە نوێنەری نەتەوەپەرستانی عارەبە و لەدژی پارسەکان دەجەنگێ. تەنانەت ناوی قادسییەی سەددامی لە شەڕەکەنا، ئەمەش بەناوی ئەو شەڕەوەبوو کە عارەبەکان لە سەدەی حەفدەمین، پارسەکانیان بەزاند و ئیسلامیان بۆ ئێراقێ هێنا. خومەینیش شەڕەکەی وا نەدیت کە تەنیا بەرگرییەکە لە شۆڕشە تازەکەی ئیسلام دەیکا، بەڵکو بۆ ئەو هەلێک بوو تا شۆڕشەکەی بۆ شیعە هاومەزهبە ئێراقییەکانی ئاودیو بکا.

هەرچەندە لەسەرەتادا ئێراق توانی چەند دەستکەوتێک لە دراوسێیە نارێکەکەی وەدەست بێنێ، بەڵام تەرازووی شەڕەکە هەمیشە بەلای ئێرانەوە دەشکا. هەر ئەوە نەبوو کە ژمارەی دانیشتوانی ئێران سێ هەندی ئێراقییان بوو، بەڵکو قووڵایی

ستراتیژی وڵاتیش لەبەرژەوەندی ئێران بوو. لە دەزگا نەوتییەکانی ئابادان و خورەمشەهر بترازێ، شارەکانی تری ئێران لە سنوورەکانی ئێراقەوە دوور بوون. بەپێچەوانەی ئەوەشەوە، زۆربەی زۆری دانیشتوانی ئێراق لەڕۆژهەڵاتی وڵات نیشتەجێنە، فڕۆکە جەنگییەکانی ئێران بەئاسانی دەیانگەیشتێ. بەسرە، کە دووەم گەورەترین شاری ئێراقە، کەوتۆتە سەر کەناری شەتولعەرەبەوە. ئێرانییەکان بەخەستی لەکاتی شەڕدا بۆردومانیان کرد. هەر لە دەسپێکی شەڕەکەوە ئێران هەناردەی نەوتی ئێراقیی بەکەنداوی پارسدا ڕاگرتووە دەزگاکانی بارکردنی نەوتی لە کەناری فاو تێکشکاند[٢].

ئێران کەنارێکی دەریایی درێژی هەیە هەر لە کەنداوی پارسەوەڕا تا ئۆقیانووسی هیندی دەڕوا و ئەمەشیان لە بەرژەوەندی ئێرانێ بوو. گەورە بەندەری هەناردنی نەوت لە بەندەر عەبباس، پێنج سەد مایڵ لەئێراقیوە دوورە و تا دوا قۆناغەکانی شەڕەکە بۆردومان نەکرا[٣].

سەددام و خومەینی هەردووکیان داوایان لە هاووڵاتییانی وڵاتەکەی تر کرد، تا چیتر پشتیوانی دەسەڵاتدارانیان نەکەن. بەڵام هەردووکیان تووشی نائومێدی بوون. سەددام ئومێدی دەخواست کە عارەبەکانی خوزستان، وەک ڕزگارکەرێک، پێشوازی لەسوپای ئێراقێ بکەن. بەڵام وایان نەکرد، هۆی سەرەکی ئەوەبوو کە ئەوان شیعەبوون و نەیاندەویست ئێرانی شیعە بەدکتاتۆرێکی سوننەی عارەب بگۆڕنەوە. کوردە ئێراقییەکانیش خێرا پشتیوانییان لە ئێرانەوە وەرگرتووە شەڕەکەیان بەهەل دانا بۆ ئەوەی چالاکی خۆیان لەدژی سوپای ئێراقێ پتر بکەن. خومەینیش لەلای خۆیەوەڕا ئومێدی خواست لە سەربازە شیعەکان، کەزۆرینەی سوپای ئێراقییان پێک دێنا، تا بچن و پەیوەندی بەئێرانەوە بکەن. ژمارەیێکی کەم وایان کرد، بەڵام زۆرینەیان لەماوەی هەشت ساڵی جەنگەکە، شەڕێکی بێ فرتوفێڵیان بۆ ئێراقێ کرد.

---

(٢) ئێراق هەر دەیتوانی نەوتی خۆی بە بۆرییەکانی نەوتەوە لە کێڵگەکانی نەوتی باکوور لە کەرکووکەوە ڕا بنێرێتە بەندەری جیهانی تورکی و لەوێوەشرا بۆ هەموو جیهانی بنێرێ.

(٣) دوورگەی خەرگ، کە جاران بەندەری سەرەکی هەناردنی نەوتی ئێرانی بوو لە باکوور، لە ١٩٨٢وەوەڕا کەوتە بەر بۆردومان و لە ١٩٨٦یش لە کار کەوت.

له ۲۰۰۲، لێکۆڵەرەوەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان سەیری ئەو شەڕەیان کرد، کە چۆن شیعەکان لە شەڕەکەی ئێران و ئێراقدا، لایەنگری ئێرانییان نەکردو کردیانە بەڵگە بۆ ئەوەی بڵێن شیعەکان لەدوای سەددامی بەبەر ڕکێبی ئێران ناکەون. ئەم خوێندنەوەیەش تا ڕادەیێکی زۆر هەڵە بوو. سەربازە شیعەکان لە خۆشەویستی ڕژێم نەبوو شەڕیان بۆ سەددامی دەکرد، بەڵکو لەبەر ئەوەبوو چونکە هیچ ڕێگەیێکی تریان لەبەردا نەبوو. وەک لەئاییندەدا دەبینین، ڕەنگە لێکۆڵەرەوەکان کارێکی باشتریان ئەنجام بدابا، ئەگەر لە قسە و چالاکییەکانی سەرکردە ئایینی و سیاسییە شیعەکانی ئێراقیّ ورد ببوونایەوە.

لە۱۹۸۲، ئێرانییەکان دەستیان بەهێرشی بەرانبەر کرد و ئێراقییەکانیان لە خوزستان وەدەرنا و هێزەکانیان دەربازی ناو خاکی ئێراقیّ بوون. خومەینی تەجنیدکراوەکانی ئێرانی بەپاداشتی ئایینییەوە هان داو پەیمانی دا بەوانەی کە لەبەرانبەر ئێراقییە کافرەکاندا دەکوژرێن، شەهید دەبن و یەکسەر بۆ بەهەشت دەڕۆن.

منداڵانی تەمەن دوازدە ساڵان خۆیان ناونووس کردو بوونە دەستپێشخەر بۆ ئەوەی کێڵگەی مینەئێراقییەکان بتەقێننەوە. چەند کەسێکیان بەزنجیر بەیەکەوە جەلە دەکران و هەر یەکێکیشیان کلیلێکی پلاستیکی بەملیەوە هەڵدەواسرا بۆ ئەوەی دەرگەی بەهەشتی پێ بکاتەوە و ئینجا بۆ ناو ناوچەکانی نێوان هێڵی بەیەک گەیشتنی هەردوو لایە نەشەڕکەرەکان دەچوون[٤]

(٤) لە ۱۹۸۷، لە یەکێک لە کامپی دیلەکانی شەڕ (کدش) کە ئێراقییەکان لە ڕەمادی لە کەناری فرات سازیان دابوو، سەردانی هەندێ لەو منداڵانەم کرد کە چووبوونە ناو کێڵگەی مینەکان. کامپەکە شوێنی دیداری خاچی سووری نێو نەتەوەیی و هەندێ میوانانی وەک خۆم ناسا بوو. منداڵەکان کە لە کاتی سەردانییەکەی من گەورە ببوون، لە چەند کۆرسێکی پیشەوەری بەشدارییان دەکرد، لەوانە تەونیان دەکردو وێنەی سەددام حوسێنیان لە مافوورەکان دەنەخشاند. دیار بوو کە چالاکییەکە بەمەبەستی سەردانییەکەی من سازدرابوو. زۆر لە دیلە ئێرانییەکان پێیانەوە دیار بوو کە تووشی مات و مەلوولی هاتبوون و هەندێکیان دووچاری نەخۆشی دەروونی ببوون. نەخۆشییەکانیشیان پەیوەندی بە زیندانی کردنی بێ کۆتاییانەوە هەبوو. هەندێکیان تا ۱۹۹۰ هەر لە دیلی مانەوە.

زۆرینەی سەربازانی سوپای ئێراقی، پلەی نزمیان هەبوو؛ یان شیعە نیگەرانەکان و یان کوردە یاخییەکان بوون، ئەمانەش ئامادە نەبوون خۆیان بکەنە قوربانی. دوای هێرشە بەرانبەرەکانی ئێران، سەددام حوسێن داوای ئاگر بەستی کردو پێشنیازیشی کرد کە هێزەکان بۆ سەر سنووری نێودەوڵەتی بەر لەهەڵگیرسانی شەڕ بچنەوە. خومەینی نکوڵی لێ کردو مکوڕ بوو لەسەر ئەوەی کە ئێران ئەو کات شەڕ ڕادەگرێ ئەگەر سەددام بڕوا.

خومەینی ڕاستەوخۆ بەشیعەکانی ئێراقیی گوت:- "ئێمە بەرگەز و نەریت و ئایین پەیوەندیمان لەگەڵ یەکتریدا هەیە...نەهیچ حکومەتێک و نەهیچ وڵاتێکی تر لەم دونیایەدا مافی ئەوەی هەیە کە بایەخ بەئایندەی ئێراقێ بدا." لەهەمان کاتیشدا ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی لەئێراق حکومەتێکی ئێراقی لەبانشگەی تارانێ دامەزراند. حکومەتەکە بەسەرۆکایەتی محمد باقر حەکیم بوو، ئامانجە دیارکراوەکەشی ئەوەبوو کە حکومەتێکی لە شێوەی حکوومەتی ئیسلامی ئێرانی لە ئێراقدا پێک بێنێ(٥)

کە باری سەربازی ئێراقی لە ١٩٨٣دا، خراپ بوو، سەددام گازی ژاری بەشێوەیێکی بەربڵاوو کاریگەر بەکار هێنا لەنۆڤێمبەری ١٩٨٣وەڕا تا ئابی ١٩٨٨، ئێراق ڕۆژ لەدوای ڕۆژ پتر گازی ژاری بەکار هێنا و ئەو گازە ژارەش کە بەکاری هێنا جار لەجار کوشندەتر بوو. لە هێرشی یەکەمین کاری خەردەلی بەکار هێنا، کەدەبێتە هۆی هەڵاوسانی پێست و یەکەمجار ئەڵمانییەکان لە١٩١٧ لەیپرێس، فلاندەرز بەکاریان هێنا. لەکۆتاییەکانی شەڕی ئێران ئێراق، ئێراق چەند جۆرە گازی ئاڵۆزی دەماری بەکار هێنا، جگە لەمە تێکەڵەیێکی گازی دەمارو ساینایدو گازی خەردەلی تاقی کردەوە.

لە سەرەتادا، وڵاتە یەکگرتووەکان، سەبارەت بەشەڕی ئێران ئێراق، هیچ دەنگێکی لێوە نەهات. سەرۆک جیمی کارتەر چەند مانگێکی لە پۆستەکەیدا مابوو، کە سەددام

---

(٥) لە ٢٠٠٣ باقر حەکیم گەڕاوە ئێراقێ و لە نەجەف، بە هۆی تەقینەوەی ئۆتومبێلێکی مینرێژکراو کوژرا. عەبدولعەزیز حەکیمی برای سەرۆکایەتی لیستی هاوپەیمانی شیعەکانی لە هەڵبژاردنەکانی یەنایری ٢٠٠٥ دا کردو لە قسانیش بە هێزترین سیاسەتڤانی ئێراقییە.

هێرشەکانی خۆی دەست پێ کرد. کارتەر هیچ بیانووێکی بەدەستەوە نەبوو تا لای ئێران بگرێ، بەتایبەتیش کە لەو کاتدا ئێران پەنجاو دوو دیپلۆماتی ئێرانی بەبارمتە گرتبوو. ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان، بەپشتیوانی ولاتە یەکگرتووەکان، لە٢٨ی سێپتیمبەری ١٩٨٠، بڕیاری ژمارە٤٧٩ی دەرکرد، لەو بڕیارە داوای ئاگربەستی کرد، بەلام لە ئێراقی نەخواست تا لەو خاکەدا بکشێتەوە کە گرتبووی. ئێرانییەکان لەو لاگرتنەی نەتەوە یەکگرتووەکان تووڕەبوون، کەچی دەبوو تەنیا گلەیی لەخۆیان بکەن؛ چونکە بەردەوامبوونیان لە گرتنی بارمتەکان ئاوا ئێرانی دوورەپەرێزو بێ پشتیوان هێشتبووەوە. بەرپابوونی شەڕەکە چیتر بواری ئەوەی نەدا تا ئێرانییەکان پتر سەرنج بەو دانوستانە بدەن کە بەمەبەستی ئازادکردنی بارمتەکان دەکراو هیچ هەلێکیشی لەبەر دەم کارتەر نەهێشتەوە بۆ ئەوەی دووبارە بۆ پۆستی سەرۆکایەتی هەڵبژێردرێنەوە.

لە١٩٨١ یش، بەڕێوەبەرایەتی ڕێیگن بەهەمان ڕێچکۆڵەی سەرۆکی پێشی خۆیدا چوو، ئەویش بابەتی شەڕی پشتگوێ خست. بەلام کە لە ١٩٨٢ ئێران شەپۆلی شەڕی وەرچەرخاندەوە، ولاتە یەکگرتووەکان لە ئەنجامی سەرکەوتنی ئێرانییان ترسا. هەروەها بەهەلیشی زانی کە ئێراق لە هاوپەیمانێکی لەمێژینەی یەکێتی سۆڤییەتی بۆ لای خۆی بسووڕێنێتەوە. گەشبینەکان لە بەڕێوەبەرایەتی وایان پێشبین کرد کە ئێراق جێی شای بگرێتەوە بۆ ئەوەی بەرژەوەندییەکانی ولاتە یەکگرتووەکان لە باکووری کەنداوی پارسی بپارێزێ.

لەو دەمەی سەددام دەستی بەبەکارهێنانی گازی ژاراوی کرد، لەو دەمە بەڕێوەبەرایەتی ڕێیگن دەستی پێ کرد خۆی لە سەددام حوسێن نزیک بکاتەوە. هەرچەندە کە دۆونەڵد ڕەمسفیلد سەرۆکی ئەرکان و وەزیری بەرگری سەردەمی سەرۆک جیرەڵد فۆرد بوو؛ بەلام هێنستا ڕۆنەڵد ڕێیگن، لەکاتی دامەزراندنی دەستەی بەڕێوەبەرایەتییەکەی، ڕەمسفیلدی پشتگوێ خست. لە ١٩٨٣، بۆ جۆرەدڵدانەوەیەکی، ڕێیگن داوای لە ڕەمسفیلد کرد ببێتە نوێنەری تایبەتی و بچێتە لای سەددام حوسێنی بۆ ئەوەی ئەو پەیوەندییە ببەستێتەوە کە ئێراق لە ١٩٦٧، لەگەڵ ولاتە یەکگرتووەکان پچڕاندبووی چونکە ئەمەیان لەشەڕی شەش ڕۆژەدا

پشتیوانی ئیسرائیلی لەدژی عارەبان کردبوو. چەند ساڵ پاشتر، لە ٢٠٠٢دا، ڕێیگن گوتی کەپرۆتستۆی گازی ژاراوی ئێراقیی کردبوو، بەڵام لەمیانی دوو جار چاوپێکەوتنەکەی لەگەڵ سەددام حوسێنی، ئەو باسەی لەگەڵدا نەکردبوو. لەمیانی دیدارەکەی ١٩٨٣دا، باسی سێ بابەتی لەگەڵ سەددام حوسێنیدا کردبوو. دژایەتی ئەمریکاو ئێراقی لەگەڵ ئێران و سوریا تاووتوێ کردبوو. باسی ئەو هەوڵانەشی کردبوو کە وڵاتە یەکگرتووەکانی دەیدا بۆ ئەوەی نەهێڵێ چەک بەدەستی ئێرانێ بگا. ئەو بابەتەشی ورووژاندبوو کە وڵاتە یەکگرتووەکان دەیویست هێڵێکی بۆری نەوت لە ئێراقەوە بۆ بەندەری عەقەبەی ئوردنی ببا تا نەوتی ئێراقیی پێ بگوازێتەوە. دیدارەکەی دووەم لە ١٩٨٤، دوای ئەوە هات کە وەزارەتی دەرەوەی وڵاتە یەکگرتووەکان بەئاشکرا نیگەرانی خۆی لەوە دەربڕی کە ئێراق گازی کیمیایی بەکار دەهێنا، بەڵام ڕەمسفیلد هیچ قسەیێکی لەو بابەتە، لەگەڵ دکتاتۆردا نەکرد. بەڵام بەجێگری سەرۆک وەزیران، تاریق عەزیزی، گوت کە کۆمەڵگەی نێودەوڵەتی لە بەکارهێنانی گازی ژاراوی ئێراقێ بێزارە، باسکردنی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لەگەڵ تاریق عەزیزی، نەک لەگەڵ سەددام حوسێنی، ئاماژەیەکی ڕاشکاوی دا کە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لەلایەن ئێراقێ وە، لەلای بەڕێوەبەرایەتی ڕێیگن کێشەیێکی لاوەکی بوو.

لە١٩٨٤، سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان ڕاپۆرتێکی دەربارەی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لەلایەنی ئێراقیی، پێشکەشی ئەنجومەنی ئاسایش کرد. هەردوو نمایندەی هۆڵاند و بریتانیا لە نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیارێکیان ئامادەکرد کە بەکارهێنانی چەکی کیمیایی ڕیسوا دەکرد (بێ ئەوەی بەشێوەیێکی تایبەتی ناوی ئێراقیی لێ بێنن) بەڵام وڵاتە یەکگرتووەکان هیچی نەکرد بۆ ئەوەی پشتیوانی هاوپەیمانەکانی بکات. وەزارەتی دەرەوە لەگەڵ نزار حەمدونی باڵیۆزی ئێراقی لە نەتەوە یەکگرتووەکان کۆبووەوە. لەگەڵ حەمدونی باسی ئەوەکرا چۆن دەشێ ئەنجومەنی ئاسایش کێشەکە بەجۆرێک تێکەولێکە بکات کە بەکەمترین شێوە بەغداد نکوڵی لێ بکا. ئێراقییەکان نەیانویست ئەنجومەنی ئاسایش بڕیارێک لەم بارەیەوە دەربکا (کە دەشیا دەرئەنجامی یاسایی لێ بکەوتبایەوە) لە جیاتی ئەوە

داوای کرد کە ولاتە یەکگرتووەکان پشتیوانی لەوە بکا کە لەبری بڕیار، سەرۆکی ئەنجومەنی ئاسایش بەیانێک دەر بکا. بەڕێوەبەرایەتی ڕێیگن ملکەچ بوو، ئێراقییەکانیش چیان ویست وایان بۆ کرا. بەڕێوەبەرایەتی ڕێیگن لە بەرانبەر کۆمسیۆنی مافەکانی مرۆڤی سەر بەنەتەوە یەکگرتووەکان، هێشتا هەنگاوێکی تریش چووەپێشەوە و چالاکانە لە دژی بڕیارێک وەستا کە بەکارهێنانی گازی کیمیایی لەلایەنی ئێراقێی ڕیسوا دەکرد.

هەرچەندە هیچ دیار نەبوو کە ئێراق سیاسەتی خۆی گۆڕیبێ و چیتر پاڵپشتی ئەو گرووپە توندڕۆیە فەلەستینییانە نەکا کە لەو کاتدا جێی گومان بوون، بەلام ڕۆنەڵد ڕێیگن لە١٩٨٢، ئێراقی لە لیستی ناوی ئەو ولاتانە دەرهێنا کە پشتیوانی تیرۆریزمیان دەکرد. بەڕێوەبەرایەتی لە١٩٨٣ دەستی پێ کرد لە دەزگای متمانەی کەلوپەل Commodity Credit Corporation گەرەنتی کڕینی بەرهەمی کشتوکاڵی ولاتە یەکگرتووەکانی بەئێراقێ دەداو پاشان لە١٩٨٤ پەرەی پێ دا و متمانەی بانکی دەرکردە- هاوردە Export-Importی بەئێراقێ دا. لەو کاتەی ئەو متمانانە بۆ ئەوە تەرخان کرابوون کە بەرهەمی کشتوکاڵی و کالای دروستکراوی ولاتە یەکگرتووەکانی پێ بکڕێ، بەلام پشتیوانی باری شەڕی ئێراقێی کرد، چونکە پارەکانی تری ئازاد کرد کە دەشیا بۆ ئامانجی سەربازی بەکار بێ. یارمەتییە داراییەکانی ولاتە یەکگرتووەکان بۆ ئێراقێ تا ١٩٨٨، سالانە خۆی لەیەک بلیۆن دۆلار دەدا

بەڕێوەبەرایەتی ڕێیگن، لە ١٩٨٣، فەرمانی بە سی ئای ئێی دا، تا هەواڵگری مەیدانی شەڕی بەئێراقییەکان بگەیێنێ. ئەفسەرانی پەیوەندی شوێنی یەکە سەربازییەکانی ئێرانیان بۆ ئێراقییەکان ئاشکرا کرد و بەمەش توانییان پێشبینی جموجۆڵی سەربازی ئێرانی بکەن و خۆیان بۆ هەر هێرشێکیان ئامادەباش بکەن. بەهۆی ئەو یارمەتییە هەواڵگرییە ئەمێریکییە بوو کە ئێراقییەکان توانییان شوێنی کۆمەڵە چڕەکانی سەربازە ئێرانییەکان بزانن و بەچەکی کیمیایی پەلاماریان بدەن. بێگومان بەڕێوەبەرایەتی دەیزانی هەواڵگرەکەی چۆن بەکار دەهات. بەم جۆرە، لە کاتێکدا کە وەزارەتی دەرەوە بەهۆی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی، بەراشکاوی

ڕەخنەی لە ئێراقێ دەگرت، بەڕێوەبەرایەتی ڕێیگن بەنهێنی کاری بۆ ئەوە دەکرد کە چەکە کیمیاییەکە کاریگەرتر بکا(٦).

ڕۆنەڵد ڕێیگن بیانووی چاکی بەدەستەوە هەبوو بۆ ئەوەی نەهێڵێ کە ئێران لە شەڕەکەی ئێراق ئێران بباتەوە. ئەگەر ئێران سەرکەوتبا، هەڵدەستا بەدامەزراندنی شیعە هاوبیرەکانی وەک بەکر حەکیمی لەسەر حوکم دادەنا و ئەویش کۆنترۆڵێکی دیفاکتۆی سەرچاوە نەوتییەکانی لە هەردوو وڵات دەخستە بەردەستی ئێرانەوە. ستراتیژی ڕێگن لەوە تۆقی بوو کە، لە کەنداوی پارسی، ئێران ببێتە هێزێکی باڵا دەست و دەسەڵاتی ئەوەی هەبێ کە بتوانێ پەیامی شۆڕشە ئیسلامییەکەی بەناو کەوانە شیعییەکەی کەنداودا بڵاو بکاتەوە. کەوانەکە بەحرێن و هەرێمی ڕۆژهەڵاتی پڕ نەوتی عارەبستانی سعودی و کوێتیش دەگرێتەوە.

خۆ مێچکە مێچکەی کارتەری لە پێش سەددامی هەر تەنیا لەبەر ئەوەنەبوو کە نەهێڵێ ئێرانییەکان شەڕەکە ببەنەوە. بەڵکو سەرۆک و تیمەکەی وایانزانی کە سەددام ڕەنگە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و لە هەردوو بواری سیاسی و ئابووریدا ببێتە هاوکاریان. چونکە ڕێگن ئەوەی خۆی دەیویست لە سەددام ببینێ، هەر ئەوی دیت، بۆیێ ئەو هەموو پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ و بەکارهێنانی چەکی ژاراوی و پاشتریش جینۆسایدی نەهاتە بەرچاو، تا لە کۆتاییدا ناچار بوو کە داوای بەخشین بکا

ئەو کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجومەنی پیران کە من وەک ئەندامێکی کارای دەستەی ئەندامەکانی کارم بۆی دەکرد، لەهاوینی ١٩٨٤، شاندێکی پێنج کەسی ڕەوان کرد بۆ ئەوەی بزانن بەرژەوەندییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان لە کەنداوی

---

(٦) هەندێ لە نووسەرەکان بەڕێوەبەرایەتی ڕێیگنیان بەوە تاوانبار کرد کە کەرستەی کیمیایی بە ئێراقێ داوە بۆ ئەوەی چەکی لێ دروست بکا. نە هیچ بەڵگەیەک نییە کە ئەمە ڕووی دابێ، نە هیچ دەرئەنجامێکی ئەم یارمەتییەی وڵاتە یەکگرتووەکانیش بە دیار کەوتووە. زۆربەی پێکهاتەکانی چەکە کیمیاییەکان بەپێی بازرگانییەکی یاسایی بەکاردەهێندرێن و لە لای چەند سەد فرۆشیارێکیش بە دەست دەکەون. بەڵام تەنیا وڵاتە یەکگرتووەکان دەیتوانی ئەو هەواڵگرییە بخاتە بەردەست کە وای کرد ئێراق چەکە کیمیاییەکانی بە شێوەیێکی کاریگەر بەکار بێنێ.

پارسی چ بوو. دوای یەک حەفتە کۆبوونەوە لە کوێت و میرنشینەکانی یەکگرتووی عارەبی و عومان، من و هاوکارانم کاسیمێر یۆست و گرایمی بانەرمان لە ئەندامانی شاندەکە، فڕین و چووین بۆ بەغداد[٧].

فڕگەی سەددام حوسێنی نێودەوڵەتی هێندە نوێ بوو دەبریقاوە- فڕگەکە بۆ ئەوە کرابوو پێشوازی لە سەرکردەکانی جیهان بکا، لەوانەی کە بەتەما بوون بۆ کۆنگرەی سەرانی وڵاتانی بێلایەن، لە١٩٨٢دا، بچن بۆ بەغداد، بەڵام لە ترسی شەڕی بەکار نەدەهات.

ئێراقییەکان پێشوازییەکی بێ ئەندازە گەرمیان لێ کردین، بەدرێژی چەند جار لەگەڵ تاریق عەزیزی بریکاری سەرۆک وەزیران کۆبووینەوە و تاها یاسین ڕەمەزانی جێگری سەرۆک کۆماریش بۆ یەکەمجار قایل بوو کە لەگەڵ شاندێکی ئەمێریکی کۆ ببێتەوە. ئەو پەیوەندییە تازەیە تا ڕادەیێکی گەلێ زۆر سەرنجی هاوکارەکانی ڕاکێشام. چونکە هەندێکیان ئومێدیان دەخواست کە ئێراقیش بۆمان وەک میسرێکی دیکەی لێبێت[٨]؛ ئێراقییەکان ئێمەیان وەبەر پرسیاران دا و دەربارەی ئاسایی کردنەوەی پەیوەندییە دیپلۆماتییەکان و ڕۆڵی ئێراقێ لە پرۆسەی ئاشتی ڕۆژهەڵاتی ناڤین، پرسیاریان لێ کردین.

من نەبێ، مشک لەباخەڵم گەمەی دەکرد. دەربارەی بەکارهێنانی گازی ژاراوی لە دژی ئێرانێ، پرسیارم لە تاریق عەزیزی کرد و ئەویش نکوڵی لە ئیشەکە کرد. ڕەمەزان زەیتوونی لەبەردا بوو، دەمانچەیێکیشی بەنێکیدا شۆڕ ببووەوە. بۆی ڕاڤەکردین کە وڵاتە یەکگرتووەکان هێشتا هێندەی نەکردووە تا ئێراق پەیوەندی خۆی بەشێوەیێکی تەواو دەگەڵیدا دابمەزرێنێتەوە، وەک ئەوەی بیەوێ کە وڵاتە یەکگرتووەکان دەبێ بەسەر هەموو بەربەستەکاندا باز هەڵبدا و خواستەکانی ڕژێمە

---

(٧) پاش ئەوەی ئێران هەڕەشەی بۆردومانکردنی کۆبوونەوەکانی کرد، شوێنی کۆنگرەکەی سەران گۆڕاو ڕەوانی نیودێلهی، هیندستان، کرا.

(٨) لە دوای شەڕی یۆم کیپوری ١٩٧٣، سەرۆکی میسری ئەنوەر سادات ڕووی وڵاتەکەی خۆی لە هاوپەیمانێتی سۆڤییەت بەرەو هاوپەیمانێتی ئەمێریکا سووڕاندەوەو پاش چەند ساڵێک، بە سەردانێکی مێژوویی، بە مەبەستی ئاشتی، بۆ قودس چوو.

دکتاتۆرییەکەی جێبەجێ بکا.

بەڕواڵەت بەغداد شارێکی گەورەی پێشکەوتوو بوو. ئێمە لە هوتێلی شێراتۆن ماینەوە کە تازە لەسەر کەناری دجلە دروست کرابوو. هەر شەو ئاهەنگی زەماوەندی لێ دەگەڕا و ئێراقییە دەست ڕۆییوەکان بەهۆی بڵندکەرە شووشەییەکانەوە بەتەلاری هوتێلەکە هەڵدەگەڕان و بۆ خارنگەکانی سەر بانی دەچوون. لەو گۆمەی لەخوارەوەی ژوورەکەی منەوە بوو، چەند ئافرەتێک بەسینگ ڕووتی مەلەوانییان دەکرد، ئەم دیمەنەم پێشتر لە عارەبەکانی ڕۆژهەڵاتی ناڤین بەرچاو نەکەوتبوو.

بەڵام زۆر شت لە بەغداد هەبوو کە ئاسایی نەبوون. پۆرتەرێتی سەددام حوسێنی لە هەموو شوێنێکدا هەبوو. جارێک بەجلی ئەفسەر و وێنەیێکی تری بە بەدلەیێکی ڕەش و سیگاری بەرز کردبووەوە، وێنەیێکی تری بەپۆشاکی کوردی هەڵواسرابوو. لەسەر چۆک لە مزگەوتێکی شیعان نوێژی دەکرد. ئەو وێنانە وێنەکانی لینین و مارکس و ئینجلزی وەبیر هێنامەوە کە لە سەفەرێکی کاتی لاوێتیم بۆ یەکێتی سۆڤییەت بینیبووم لە هەموو گۆشەیێکی ئاوەدانییە گشتییەکان هەڵواسرابوون. ترس بەسەر هەموو کەسێکدا زاڵ بوو. ئاگادار کرابوومەوە کە لە هیچ ژوورێکی هۆتێلەکەدا نابێ وێنە بگرم، چونکە هەر لەبەر ئەوە نەبوو کە بەسەر دجلەی دادەڕوانی، بەڵکو بەسەر کۆشکی کۆماری سەددامیشدا زاڵ بوو. پێیان گوتم چەند جاران ئەو میوانانەی ئەو ئاگادارییانەیان پشتگوێ خستووە گیراون، سەرم سوڕما! دەبوو چەند لە پیاوانی ئەمن ڕۆژانە کاتی خۆیانیان بەسەر بردبێ بۆ ئەوەی چاودێری پەنجەرەکانی ئەو هۆتێلە بکەن. تێبینیم کرد کە خزمەتچییانی گەورە سەرکردەکانی ئێراقێ لە چ تەنگەتاوییەک دابوون. لە سەرەکانی خۆیان دەترسان، لەوە دەترسان قسەیێکی چەوت لەگەڵ ئێمەدا بکەن و لەگەڵ هەر جوولە کردنێکی من ئەوان لە شوێنی خۆیانەوەڕا ڕادەپەڕین. هەموو لە هەمووی ئۆفیسەکەی ڕەمەزانی سپی بوو، (کەوڵی قەنەفەی ژوورەکەی سپی بوو، مێزەکەی سپی بوو، هەمووی هەر سپی بوو)، ڕەمەزان سیگارێکی دەرهێناو چوار لە بەردەستەکانی بەئاگرەکانیانەوە، بەهەڵەداوان هاتن، دا سیگارەکەی بۆ دابگیرسێنن. (هیچیان پێیان نەکرا.)

دوای سەردانی کردنی گۆڕی سەربازی ون، کە لەسەر پانتاییەکی گەورەی زەوی، دوور لە کۆشکی سەرۆکایەتییەوە دروست کرابوو، نیگەرانییەکەم پتر بوو. ئاخر ئەو گومبەتە بۆ یادکردنەوەی کوژراوانی ئەو شەڕە کۆتایی نەهاتووەی ئێران ئێراق دامەزرابوو. گۆڕەکە لە شێوەی شیرێک دروست کرابوو (ڕەنگەکانی ئالآی ئێراقێی لەخۆ گرتبوو) بەرەو هەوراز هەڵدەکشا و قەلغانێکی گەورەشی لە تەنیشتەوە بوو. ئەندازەسازییەکی مەزن نەبوو. لە ٢٠٠٥ لەگەڵ ئەحمەد چەلەبی بریکاری سەرۆک وەزیرانی ئێراقی، لە نزیکییەوە ڕەت دەبووین کاتێک تێبینی دا و گوتی کە زۆر لە دەرخوونەی ئاودەست و فرچە دەکا. کەس نەبوو لە١٩٨٤ بوێرێ بەم شێوەیە باسی بکا لەبن قەلغانەکە و لە سەرەوەی پەیکەرەکەدا گۆڕێکی ئاسنینی سەربازێک هەبوو؛ کڵاو گوڵینەیێکی پلاستیکی پەمبەشی لێ بوو کە سەرۆکی کۆریای باکوور دکتاتۆر کیم ئیل سۆنگ ناردبووی. لە مۆزەخانەیێکی بن گۆڕەکە ١٤٤ وێنەی لە قەوارەی پۆستەرم ژمارد؛ هەر هەموو وێنەکان هی سەددام حوسێنی بوون.

سەرم لەو سەرکردەیە سوڕما کە بۆ یادکردنەوەی شەڕ ١٤٤ وێنەی فۆتۆگرافی خۆی دانابێ. کە یەکەم ڕەشنووسی ڕاپۆرتەکەی ستافی خۆمانم نووسی، باسی شێوە ستالینییەکەی ئێراقی سەددام حوسێنم کرد. هاوکارەکانم مکوڕ بوون لەسەر ئەوەی یان دەبێ شێوەکەی نەرمتر بکرێ، ئەگەریش نا هەر ڕەش بکرێتەوە. لەسەر داڕشتنی ئەو قسەیەی کەعەزیز گوتی کە چەکی کیمیاییان بەکار نەهێناوە، لەگەڵ هاوکارەکانم شەڕێکمان کرد. هەندێ لە ماندەڵکردنەکە لەو بەڕێوەبەرایەتییەی ڕێیگنەوە هات کە ڕەشنووسەکەمان بەهاوبەشی ئامادەکرد.

ڕاپۆرتەکەمان بەناوی (شەڕ لەکەنداو) بوو، لەئابی ١٩٨٤ بڵاومان کردەوە. یەکسەر لە دوای دووبارە هەڵبژاردنەوەی ڕێیگنی لە نۆڤێمبەری، وەڵاتە یەکگرتووەکان پەیوەندییەکی دیپلۆماتی تەواوی لەگەڵ ئێراق دامەزراندەوە.

# بەشی ٣

## گەلەکەی خۆی بەبەر گاس دا

بەڕێوەبەرایەتی ڕێیگن لە ١٩٨٥، بە شێوەیێکی ڕەمەکی ستراتیژی خۆی گۆڕی و دەستی بەپرۆگرامێکی نهێنی کرد بۆ ئەوەی چەک بداتە ئێران. ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی، ڕۆبێرت ماکفارلن، بەپاسپۆرتێکی ئایرلاندی ساختەوە، سەردانی تارانیی کرد و ئینجیلێک و کێکێکی لە شێوەی کلیلی[٩] لە سەرۆک ڕێیگنەوە بۆ خومەینی بە دیاری برد

چەند فڕۆکەیێک بەنهێنی چەکی ئەمێریکییان گەیاندە تارانێ. هەرچەندە چەکەکان زۆر نەبوون، بەڵام لە بواری سەربازیدا گرینگ بوون، چونکە زۆربەی چەکەکانی ئێرانی لە کارخانەکانی ئەمێریکی دروست کرابوون؛ شای ئێرانێ لە دوای گرانبوونی نرخی نەفت لە ١٩٧٠کاندا، ئەو چەکانەی کڕی بوون، بەڵام لەگەڵ سەرهەڵدانی قەیرانی بارمتەکان، لە ١٩٧٩ وەڕا، ئیتر ئێران نەیدەتوانی پارچەی یەدەک بۆ ئەو چەکانەی خۆی پەیدا بکا

ئەم لایەن گرتنەی ئێرانێ لە ٢٦ی نۆڤێمبەری ١٩٧٩ کۆتایی هات. ڕۆژنامەی (الشراع)ی لوبنانی گوتارێکی بڵاو کردەوە، تێیدا بەدڵنیاییەوە ئاشکرای کرد کە حکومەتی ئەمێریکی چەکی بۆ ئێران دەنارد تا لە بەرانبەردا ئەو بارمتە ئەمێریکییانە ئازاد بکا کە میلیشیاکانی لای ئێران، لە لوبنان، گرتبوویانن. لە دوای مانگێک میدیای ئەمێریکی چیرۆکەکەی هەڵقۆستەوە. پاشان بە دیار کەوت کە

---

(٩) وا پێدەچێ کە کلیلەکە هێمای ئەو کلیلەی بەهەشت بووبێ وەک ئەوانەی بەو گەنجانە دەدرا کە خۆیان لە پێناوی جمهوری ئیسلامی شەهید دەکرد. خومەینی هەرگیز کێکەکەی بەدەست نەگەیشت، چونکە دەستی بەسەر داگیرا وا پێدەچێ ئەفسەرانی گومرگ لە فڕگەی میهرابادی لە تارانی، خواردبیان.

داهاتی فرۆشتنی چەکەکان دەکرا یارمەتی و بۆ بەرەی کۆنترا ڕەوان دەکرا  کۆنترا هێزێکی چەکداری باڵی راستی سەربازی بوو لە دژی حکومەتی ساندینیستا دەجەنگا. ئەم ڕووداوە لادانێک بوو لەو یاسایەی وڵاتە یەکگرتووەکان کە ئەم چەشنە یارمەتییانە قەدەغە دەکات.

کۆنگرێس کۆمیتەیێکی پێکهێنا بۆ ئەوەی لە ناقانوونییەتی بکۆڵێتەوە، بەڵام هەر لە یەکەم دانیشتنی بۆ بیستنی بابەتەکە، کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی پیرۆان لە دەستپێکی ١٩٨٧، بریاری کۆتایی هاتنی کۆمیتەکەی دا. چونکە لە دوای ئەوەی دێمۆکراتەکان لە هەڵبژاردنەکانی ١٩٨٦ بوونە زۆرینەی ئەنجومەنی پیران، دێمۆکراتێکی دوورگەی رهۆد کە ناوی کلایبۆرن پێڵ بوو، بووە سەرۆک. ئەویش نەیویست لە چوارچێوەی ئەو سیاسەتە دەرچێتە دەرەوە کە ڕێیگن بۆ پرچەککردنی دوژمنێکی وەک خومەینی بریاری لێ دابووی. من وەک کارمەندێکی کۆمیتەکە، بەرپرسی ڕۆژهەڵاتی نزیک بووم و ئیشەکەشم ڕێکخستنی دانیشتنەکان بوو. ئەوەی جێی سەرسوڕمان بوو، ئەوە بوو کە هەموو گەڤاهیدەرەکانمان، بە جۆرج شوڵتزی وەزیری دەرەوەشەوە، هەموو لەسەر ئەوە کۆک بوون کە چەک دانە ئێران ستراتیژییەتێکی دیاری نیشتمانی نەبووە.

میدیا بایەخێکی زۆری بە دانیشتنەکان نەدا، چونکە هەر خەریک بوو بە دوای ریسوا کارییەکەدا دەگەڕاو هێندە سەرقاڵی دەرئەنجامە ستراتیژییەکان نەبوو. باڵیۆزخانەی ئێراق لە نزیکەوە ڕا بەدوایاندا دەچوو. نزار حەمدوونی باڵیۆزی ئێراقێ وای بۆ چوو کە دەبێ من لایەنگری ئێراقێ بووبم، چونکە من دانیشتنەکانم بەشێوەیێکی دژ بەئێرانێ، رێکدەخستن. پێی گوتم ئەگەر سەردانی ئێراقێ بکەم، وا دەکا ڕێگەم بدرێتێ تا سەردانی هەر شوێنێک بکەم کە خۆم بمەوێ.

لە ١٩٨٧، لە لایەکەوە وا پێدەچوو کە بە هۆی یارمەتییەکانی ئەمێریکا، ئێران خۆی بۆ سەرکەوتن لە شەڕەکەی ئێران - ئێراق ئامادە کردبێ. سوپای پاسدارانی شۆڕشی ئێرانی نیمچە دوورگەی فاویان گرت. بەر لە دەستپێکی شەڕ، ئێراق زۆربەی نەوتی خۆی لەو بەندەرەوە ڕا دەناردە دەرەوە. ئێرانییەکان لە باکووریش یارمەتی جەنگاوەرانی کوردیان دەدا کە بەپێشمەرگە ناسراون و ڕووبەرێکی زۆری

زەویـیـان لـەبەر دەسـتـدا هەیە، لەوانە بـەرزاییـیـەکـانی باکـووری هـەولێـر کـە دەشتاییـیـەکانی میـزۆپۆتامیـاش دەگرێتەوە. مـەترسی ئەوە لە ئارادا هەبوو کە بە یارمـەتی پێـشمـەرگە[10] ئێران بتوانێ تۆپخانەی خۆی بێنێتە پێش و هەڕەشـە لە کێڵگەکانی نەوتی کەرکووک بکا.

بەڕێوەبەرایەتی ڕێیگن بۆ ئەوەی ئەو پشـێوییـە نەهێڵێ کـە لە بواری سـیـاسـی و سـتـراتیژی بەلایەنگری ئێرانێ پەیدای کردبوو، هەسـتـا هێـشـتـا سـەنگی خـۆی پتر بەلای ئێـراقێ وە داگـرت. چونکە ئێـران ڕێگەی دەریایی لە ئێـراقێ گـرتبـوو، بۆیێ ئێراقییەکان پێداویستییەکانیان تەنیا لە بەندەرەکانی کوێتەوە ڕا بۆ دەهات. کوێت یارمـەتی شـەڕەکەی ئێراقێی داو نـەوتی خۆی بۆی فـرۆت. بۆ ئەوەی بەجـارێک ڕێگەی کـەیشتنی پێداویسـتـییـەکان لە ئێراقێ بگرن، ئێرانیـیـەکان پەلامـاری کـەمـییـە کوێتـیـیـەکـانیـان دا. کـوێتـیـیـەکـان هاواریان بردە بەر یەکێتی سـۆڤـییـەت و وڵاتە یەکگرتووەکانەوە تا یارمـەتی بدەن و لە لایەکیشـەوە دەیویست پشتـیـوانی سۆڤـییـەت بەدەست بێنێ و بیـهێنێتە ناو گـەمـەکەوە. لە ١٩٨٧، ڕێیگن ڕێگەی بەکوێت دا ئاڵای وڵاتە یەکگرتووەکان لە سـەرەتا یازدە کـەشـتی تانکەری نەفتی خۆی بەرز بکاتەوە و زێرەڤـانی دەریایی وڵاتە یەکگرتووەکـانیـشی بۆ ناردن. ئینجـا لە ١٧ی ئایاری ١٩٨٧، فڕۆکـەیێکی جـەنگی ئێراقی دوو مـووشـەکی ئێکسۆسـێتی کـارخـانەی فـرەنسـایی لە کـەشتی وڵاتە یەکگرتووەکان USS Stark گرت، لەو دەمەی کە بەناو دەریای کـەنداوی پارسـیـدا دەگـەڕا. سی و حـەوت دەریاوانی ئەمـێریکی کـوژران، بـەڵام بەڕێوەبەرایەتی ڕێیگن بەپەلە شـێوەی ڕاڤەکردنی ئێراقێی وەرگرت و ڕووداوەکەی بەکردەوەیەکی بێ نیـاز پەسـند کـرد. سـەرۆک گلەیی لە (ئێـران)ی کـرد، مکوڕ بـوو لە سـەر ئەوەی کـە ئێـران "تاوانبـارە. وڵاتە یـەکگرتووەکـان خـۆی لە گـەڵ ئەو هـەوڵە بێ بنچ و بـنەوانانە تێکەڵ کرد کە مقۆ مـقۆیان لـەبەر دکتـاتۆرێک دەکرد زۆر لە گینە بە نیـازەوە پەلاماری کەشتییەکی شـەڕی وڵاتە یەککگرتووەکان دابێ.

سـینەتۆر پێڵ بەوە نیگەران بـوو کـە کـاردانـەوەی تـوندی ڕێیگن لە دژی ئەو هـەڵە

---

(١٠) پێشمەرگە، بە واتا کوردییەکەی دەکاتە "ئەوانەی ڕووبەڕووی مردن دەبنەوە." لە دوای ١٩٩١، پێشمەرگە بووە لەشکرێکی ئاسایی هەرێمی کوردستان.

سیاسییانەی ساڵی پێشتری، دەشێ وڵاتە یەکگرتووەکان لەگەڵ ئێرانێ تووشی شەڕی بکا. یاسایەکی پێشکەش کرد بۆ ئەوەی بەکار هێنانی ئاڵاێ وڵاتە یەکگرتووەکان لەلایەنی کەشتییە کوێتییانەوە ڕابگرێ و بڕیاری دا شاندێکی دیکە بۆ کەنداوی پارس بنێرێ. بەشێکی شاندەکە چوونە ئەو وڵاتانەی لە نیوەدوورگەی عارەبین و منیش بۆ ئێراقێ چووم. کارێکی ئاسایی بوو داوا لە نزار حەمدوون بکەم پەیمانەکەی بە جێ بگەینێ و ڕێگەم بدەن بۆ هەر شوێنێکی دەمەوێ بچم. پێم گوت دەمەوێ بچمە کوردستان.

لە سێپتێمبەری ۱۹۸۷، من و هێیوود ڕانکنی ڕاوێژکاری سیاسی باڵیۆزخانەی وڵاتە یەکگرتووەکان لە بەغداد، دوو ڕۆژئاوایی بووین کە ڕێگەمان پێ درا سەردانی سلێمانی لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانی ئێراقێدا بکەین. ئەمەش کارێکی زۆر دەگمەن بوو. گومانم هەیە، کاتێک کە حەمدوون ئیجازەی سەردانەکەی بۆ وەرگرتین، نەیدەزانی ڕەنگە ئێمە چ دەبینین.

لە ڕۆژێکی خۆڵبارانی وا من و هێیوود پایتەختمان جێهێشت، کە بەغدادی هەموو زەرد هەڵگێڕا بوو. بەناو باقووبەدا ڕەت بووین. باقووبە شارێکی هاوبەشی سوننە و شیعە نشینە و لە ۲۰۰٦دا دەبێتە هێڵی پێشەوەی شەڕی ناوخۆ، پاشان گەیشتینە جەلەولا و، کە دوا شاری عارەبنشینە و پێش ئەوەی کە بگەینە کوردستان. لە خاڵێکی پشکنینی دەرەوەی جەلەولا، چەند سعاتێک بۆ مەفرەزەیێکی سەربازی چاوەڕێمان کرد. مەفرەزەکە کە هات لە دوو لۆری سەربازی پێکهاتبوو. یەکەمیان شەش سەربازی کڵاو ئاسنی تێدا بوو لە هی دووەمیشیان چەند پیاوێکی تێدا بوو کە تۆپێکی دژە ئاسمانییان پێبوو.

لە دووری یەک مایل کەمتر گەیشتینە شوێنێک کە پێشان شارێکی گەورەی کوردنشین بووە. لە بەشێکی بچووکی لای ڕۆژئاوای بترازێ کە هێشتا خاپوور نەکرابوو، ئەوەی تری هەمووی وێران کرابوو. لە نێوان جەلەولا تا سلێمانی، بیست و نۆ گوند و شاری کاولکراومان ژمارد. بەڵام خۆ ئاشکرا بوو کە گەلێکی هاوشێوە لەو ناوچەیەدا هەبوو. لە هەندێ شوێن بلدۆزەرەکان هێشتا هەر خەریکی کاولکاری بوون و لە نزیک هەندێ خانووی نیوە ڕووخاو پارکیان کردبوو. لە هەرشوێنێک کە تەواو خاپوور کرابوو، سوپای ئێراقێ ڕەز و کێڵگەکانیشی سووتاند بوو،

مزگەوتەکانی تەقاندبووەوە و کێلی قەبرەکانی ڕامالیبوو و وایەری کارەباشی لە دارتێلەکان پچڕاندبوو. لە نزیکی سلێمانی، بە باخی گوندێکدا ڕەتمان دا کە دارەکانی هەموو بەری دابوو، بەڵام هیچ ئاوەدانی لێ دیار نەبوو، تەنانەت تاقە شوانەوێڵەیێکیشی لێ نەمابوو.

لە دۆڵە مەیلەو ئارامەکانی ناوچەکەدا، دیتمان شاری تازە دروست دەکران، شەقامی بەرینیان بەناودا دەچوو (تا بە ئاسانی تانکی بە ناودا ڕەت ببا). لە ناو موجەممەعەکان و لە دەرەوەشیاندا، سەربازو هێزەکانی ئەمن خەریک بوون قەڵای سەختیان دروست دەکرد، بۆ ئەوەی لەوێوەڕا بتوانن کۆنترۆڵی دانیشتوانەکە بکەن. ئەو شارانە بەتەوسەوە پێیان دەگوترا شارەکانی سەرکەوتن Victory Cities و جیاوازییەکی کەمیان لەگەڵ گرتووخانەکانی نازییەکان هەبوو؛ چونکە دانیشتوانە کوردەکانیان پێیان نەدەکرا بە ئاسانی لێیان دەرچنە دەرەوە. لەو شارانەی سەرکەوتندا بواری ئیشکردن بۆ کەس نەبوو، وای لە خێزانەکان کردبوو، بۆ بژێوییان، تەنیا پشت بەو بەشە خۆراکە ببەستن کە میری دابەشی دەکرد. پیاوەکان لە پەیوەندی بە میلیشیاکانی سەر بە حکومەتەوە بترازێ، واتا لە بوونە بە جاش (بێچووی کەر یان بێچووی نێرەکەر) بترازێ، هیچ ڕێگەیێکی دیکەیان لەبەردا نەبوو.

هەرچەندە پێشتر هیچمان دەربارەیەوە نەدەزانی، بەڵام من و ڕانکن بەڕێکەوت گوێمان لە ئەنفال[11] بوو. ئەنفال هەڵمەتێکی سەربازی بوو، بە مەبەستی نەهێشتنی ژیان لە لادێیەکان، لە کوردستانی ئێراقێ، بەڕێوەچوو. سەددام حوسێن، لە ئاداری ١٩٨٧، عەلی حەسەن مەجیدی پسمامی خۆی کردە فەرمانداری باکوور و دەسەڵاتی چارەسەرکردنی کێشەی کوردی پێ دا. مەجیدیش زۆربەی ناوچەکانی کوردستانی بە مەنتیقە موحەڕەمە ڕاگەیاند، لەوێ "هێزە چەکدارەکان پێویست بوو هەر مرۆڤێک یان هەر ئاژەڵێک بکوژن کە لەو ناوچانەدا دەبیندرێن[12]."

(١١) ئەنفال لە سورەتێکی قورئانەوە هاتووە و بە شێوەیێک لێکدراوەتەوە کە ماف بە خواناسان دەدا تا ماڵ و سامانی خوانەناسان بە تالان ببەن.

(١٢) ئەم مەرسومەی حوزەیرانی ١٩٨٧، یەکێک بوو لەو چواردە تەن بەڵگەنامە شاردراوانەی لە ڕاپەڕینی ١٩٩١، بەبەر دەستی کوردەکان کەوت و لە ئارکایڤی نەتەوەیی کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی ئەنجومەنی پیران هەڵگیراوە.

لە سەرکۆی ئەو ٤٥٠٠ گوندەی لە کوردستان هەبوو، حکومەتی ئێراقیّ تا ٢ی ئابی ١٩٩٠، پتر لە ٤٠٠٠ گوندی قەلاچۆ کرد. لە ڕۆژهەلاتی کوردستانی ئێراقیّ، سویا شارەکانی قەلادزێ و هەڵەبجە و سەید سادقی خاپوور کرد. بە بۆچوونی بەرەی کوردستانی ئێراقی، لە سەرجەمی ٧٥٠٠٠ کیلۆمەتر دووجای ڕووبەری خاکی کوردستان، مەرسوومەکانی مەجیدی ٤٥٠٠٠ کیلۆمەتری دووجایان لەم ولاتەدا چۆڵ کرد. ئەو کوردانەش کە لەو ناوچە موحەرەممانەدا دەژیان، هەموو یان بۆ باشووری ئێراقیّ دوورخرانەوە یان ئیعدام کران. لە دوای ڕووخانی سەددام لە ٢٠٠٣، محمد ئیحسانی وەزیری مافی مرۆڤی حکومەتی کوردستان، سەرکردایەتی چەند تیمێکی پزیشکانی یاسایی کردو چوون لە نزیک سەماوەی باشووری ئێراق و لە ڕۆژئاوای پاشماوەکانی حەزەری سەر بەپارێزگای سەلاحەددین، چەندەها گۆڕی بەکۆمەڵیان هەڵداوە کە تەرمی هەزاران کوردی تێدا بوو. حکومەتی کوردستان بە فەرمی ژمارەی قوربانییانی ئەنفال، لە نێوان سالانی ١٩٨٧ تا ١٩٩٠، بە ١٨٢٠٠٠ کەس دەخەملێنیّ.

بەڕێوەبەرایەتی ڕێگن بەو هەولانەی زانی کە سەددام بۆ خاپوورکردنی کوردستان دەیدا. ڕانکن ڕاپۆرتێکی بیست و حەوت لاپەڕەیی دەربارەی دیدارەکانمان نووسی؛ ڕاپۆرتەکە بە ناو وەزارەتی دەرەوەو هەندی دەزگای تری حکومەتیش بلاو کراوە. منیش لە ڕاپۆرتێکدا باسی شێوەی ڕووخاندنی گوندە کوردییەکانم کردو کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوە لە دوای سەفەرەکەمان، ڕاپۆرتەکەی بلاو کردەوە. ناو لەڕاپۆرتەکەم نا: شەڕ لە کەنداوی پارسی: ولاتە یەکگرتووەکان پشتی لایە شەڕکەرەکان دەگریّ. جەلال تالەبانی سکرتێری گشتی یەکێتی نیشتمانی کوردستان، سەرکردەی کوردە یاخییەکان، لە نیسانی ١٩٨٨، سەردانی واشنتنی کردو کتێبێکی ئەستووری سپی لە گەڵ خۆیدا هێنابوو. کتێبەکە ناوی پتر لە سێ هەزار گوندی کوردانی تێدابوو کە تا ئەو کاتی خاپوور کرابوو. تالەبانی کۆپییەکی کتێبەکەی دا من و یەکێکی دا ڕیچەرد شیفتەری بریکاری وەزیری دەرەوە بۆ کاروباری مافەکانی مرۆڤ و کۆپییەکیشی پێشکەشی لێری پۆپ کرد، ئەمەش لە بیسوروّی ڕۆژهەلاتی نزیک، لە وەزارەتی دەرەوە، بەڕێوەبەری کاروباری باکووری

کەنداو بوو. لەو کاتە سەرنجی پتر کەوتە سەر لایەنێکی تری دراماتیکی ئەنفال، ئەویش، بەکارهێنانی چەکی کیمیایی بوو لە دژی کوردان.

لە میانی هەوڵدانیان بۆ وەدەستهێنانی پشتیوانی بۆ شەڕە تایبەتەکانیان، هەردوو سەرۆک، جۆرج هـ. و. بوش و کورەکەشی جۆرج و. بوش، جەختیان کردەوە کە سەددام حوسێن دکتاتۆرێکی دڵڕەق بووەو "گەلەکەی خۆی بەبەر گاز داوە." لەو دەمەی کە سەددام گازی بەکار دەهێنا، بەڕێوەبەرایەتی ڕیێگن چۆن گوێی بەوە نەدا کە ئێراق گازی لە دژی سەربازانی ئێرانی بەکار هێنا، بە هەر هەمان شێوە گوێی بەوەش نەدا کە ئەو چەکانەی لە دژی کوردە سیڤیلەکانیش بەکار برد. هەرچەندە لە ئاداری ١٩٨٧ـەوە گازە ژاراوییەکان لە دژی کوردان بەکار هات – وا گریش دەکرێ کە بەلای کەمییەوە ئاژانسە هەواڵگرەکانی ولاتە یەککگرتووەکان پێیان دەزانێ – بەلام نە ولاتە یەککگرتووەکان و نە هیچ کەس لە کۆمەڵگەی نێو دەوڵەتی یەک قسەشیان، بە ئاشکرا، لێ نەکرد.

لە بەیانی ١٦ی ئاداری ١٩٨٨، فرەۆکە جەنگبازە ئێراقییەکان بە ئاسمانی ئەو شارە بچووکەی هەڵەبجەدا فرمین کە کەوتۆتە دەشتێکی ڕۆژهەلاتی بەنداوی ستراتیژی دەربەندیخان لە کوردستانی ڕۆژهەلات.

سوپای پاسدارانی ئێرانی و هێزەکانی پێشمەرگە ڕۆژی پێشتر شارەکەیان گرت، بەلام پاشان هەموو لێی کشانەوە، ڕەنگە پێشبینی هێرشێکی ئێراقییان کردبێ. دوای سێ ساڵ لە هەڵەبجە بووم؛ ڕزگاربووەکان بۆیان گێڕامەوە پاشان چ قەوما. فرۆکەکانی هێمای ئێراقییان پێوە بوو جۆرە بۆمبێکیان بەرداوە کە بە نەرمی تەقینەوە. پاشان بۆنێک وەک بۆنی بادەمی سووتاو بلاو بووەوە. گەلاکان وەرین، خەڵکەکەش کەوتن و نردن. تەرمەکان ڕەشداگەڕان. ژێرزەمینی ماڵێکیان پێ نیشان دام – هێشتا لە ترسی کاریگەری گاز هەر داخراوە – لەو ژێرزەمینەدا چل و هەشت پیاوو ژن و منداڵ خۆیان شاردبووەوە کە مردن. ناوماڵەکە تژی جلوبەرگی ڕزی بوو. لە گۆڕستانەکەشی، پیاوێک دەستی خۆی ڕەوانی ناو قۆمەتە خۆڵێک کردو دوو کەللە سەری لێ دەرهێنا. هەردووکیان بچووک بوون، ئاخر کەللەی سەری دوو منداڵ بوون.

لە گازبارانی هەڵەبجە پتر لە پێنج هەزار کەس مردن. ئێرانییەکان ئەمەیان بە

هەڵێکی باش زانی بۆ ئەوەی پروپاگێندە سەرکەوتوو بکەن و چوون ڕۆژنامەنووسانی ئێرانی و بیانییان بردە ناو شارە کوژراوەکە. لە سەر پەیژەی بەر دەرى ماڵێکدا، پیاوێک بە جلی کوردییەوە تەرمی منداڵێکی پێچراوەی لە باوەش گرتبوو و مردبوو. وێنەکە بە هەموو دونیادا بڵاو بووەوە.

ڕای گشتی جیهانی کاردانەوەیەکی پڕ ترسی لە بەرانبەر بە هەڵەبجە هەبوو. لە وڵاتە یەکگرتووەکان، سێنەتۆر جۆرج میچڵ، دیمۆکراتێکە لە مێین، بڕیارێکی ناچارنەکەر non-bindingی لە سێنەت (ئەنجومەنی پیران) دەرکردو تێیدا ئێراقی، بە هۆی پەلامارەکەیەوە، ڕیسوا کرد. پشتیوانی کردنی ڕێیگن لە ئێراقێ خەریک بوو تووشی کێشە دەبوو، چونکە ئەگەرێکی سەرکەوتنی ئێران لە شەڕەکە لە ئارادا هەبوو. هەرچەندە ئەوانەی قورتار ببوون گوتیان کە فڕۆکەکان نیشانەی ئێراقییان پێوە بوو، بەڵام بەڕێوەبەرایەتەی ڕێیگن هەردووک لایەنی ئێرانی و ئێراقی بە بەرپرسیار دانا. ئەمەش درۆیێکی ناماقوول بوو. بۆچ ئێران پەلاماری هاوپەیمانانی خۆی دەدا. بەڵام ئەو درۆیە بوو کێشەکەی لە میدیای ئەمێریکی و لە سیاسەتی بیانییەوە شێواند.

لە میانی چەند مانگی پاشتر باری شەڕ بە گرانییەوە بە لای ئێراقیدا کەوت. ئێراق، لە دوو قۆڵی هیشکەتی و دەریاییەوە، هێرشی کردو دوای سی و پێنج سعات لە بە چڕی بەکارهێنانی گازی دەمار، لە ١٧ی نیسانی ١٩٨٨، نیمچە دوورگەی فاوی گرتەوە. وێنە ڤیدیۆییەکانی پاشتر تەرمی سەربازە ئێرانییەکانی نیشان دا کە شرینقەیان لە هەر چوار لادا کەوتبوو، چونکە بێهوودە هەوڵیان دابوو دەرزی ئاترۆپاین لە خۆیان بدەن تا بەرگەی ژارەکە بگرن. تا ناوەڕاستی هاوینی ١٩٨٨، سوپای ئێراقیّ توانی هەموو ئەو خاکە بگرێتەوە کە ئێرانییەکان لە ١٩٨٢وەوە گرتبوویان. ئێران شەش ساڵ[١٤] شەڕەکەی درێژە پێ دا؛ چونکە خۆمەینی سەری سەددام حوسێنی گەرەک بوو. خومەینی لە کۆتاییدا ئینجا تێگەیشت کە ئەمەی بۆ نەدەهاتە دی. ئێران بڕیاری ٥٩٨ی ئەنجومەنی ئاسایشی پەسند کرد. بڕیارەکە داوای ڕاگرتنی هەموو کردەوەیێکی دوژمنکاری و گەڕانەوە بۆ دۆخی بەر لە

(١٤) دانەر لێرەش سەرچێغ چووە، چونکە شەڕەکە لە ١٩٨٠/٩/٢٢ تا ١٩٨٨/٨/٨ی خایاند، واتا هەشت ساڵ بوو نەک وەک ئەوەی گالبریس دەڵێ شەش ساڵ. وەرگێڕ.

هەڵگیرسانی شەڕی دەکرد. خومەینی گوتی شەڕ ڕاگرتنەکە وەک هەڵقوڕینی ژار بوو.

ئەمە بەراوردکردنێکی شیاو بوو. گازی ژاراوی بوو سەددامی هێشتەوەو ئەو یارمەتیانەی ئەمێریکاش لە بواری دەستنیشانکردنی نیشانەکان بۆ ئێراق، بە قیمەت نەدەهات. هەرچەندە نەمتوانی هیچ بەڵگەیێک لەوە بەدەست بێنم کە لە بواری دیارکردنی نیشانەکان لە هەڵەبجە، بەڕێوەبەرایەتی ڕێیگن یارمەتی ئیراقیی دابێ، بەڵام ناشێ ئەم بابەتەش پشتگوێ بخەین. خۆ تەنانەت لە پاش هەڵەبجە دانە بەر گازیش، بەڕێوەبەرایەتی ڕێیگن بە بەردەوامی یارمەتی ئیستخباری دەدا ئێراق و ئەویش زانیارییەکانی بۆ باشتر ئاراستە کردنی چەکە کیمیاییەکانی بەرەو نیشانەکان بەکار هێنا

ئەو پرۆپاگێندەیەی کە ئێران بۆ هەڵەبجەی کرد، وەک تفی سەر هەوراز بەرووی خۆی کەوتەوە. تەلیڤزیۆنی ئێرانی بە نیشان دانی ئەو وێنانە زەندەقی بینەرانی بردو ژمارەی ئەوانەی دەیانویست بۆ سەربازی بچن بە جارێک کەم بووەوە. چونکە ئێراق لە بن قەردە نێو دەوڵەتییەکان دەناڵی، بۆیێ دەسەڵاتدارانی ئێراقێ ناچار بوون ملیان بۆ خواستە نێو نەتەوەییەکان کەچ بکەن و چیتر چەکی کیمیایی بەکار نەهێنن. کە بەڕێوەبەرایەتی ڕێگن بە درۆ گوتی ئێرانیش لەو هەترەسانە atrocities بەرپرسیارە، بۆ ئەوەی بوو دڵنیابێ ئەم جۆرە فشارە ناکرێ.

لە ٢٠ی ئابی ١٩٨٨، ئاگربەست لە نێوان هەردوو لا دەستی پێ کرد.

لە ٢٨ی ئابی ١٩٨٨، بۆ پشوودانێکی درێژ بەبۆنەی ڕۆژی کرێکاران، لە ڤێرمۆنت، لە ماڵ بووم. تازە لە سێ مایل غاردانە خۆشەکەی بەیانیانم بە پشت زنجیرەیەکی دەریاچەکانی بیڤەر ببوومەوە کە دەستم گەیاندە نیویۆرک تایمز. لە لاپەڕەی A15، ئالان کاوڵ ڕاپۆرتی دابوو کە پەنابەرانی کورد دەچوونە ناو خاکی تورکیاو گوتی گوندەکانیان لە پارێزگای دهۆک بەو چەکی کیمیایی دراون.

دەبێ هیچ گومانێک لەوەدا نەمێنێ کە کێ بەرپرسیار بوو. جگە لەوەی کە ئەو پەلامارانە لە پاش کۆتایی هاتنی شەڕی ئێران ـ ئێراق دران، هەندێ شوێنی دوور لە ئێران؛ لە نزیک مەرزەکانی سوریاو تورکیاش وەبەر هەمان جۆرە پەلامار کەوتن.

من لەخۆوەرا زانیم کە ئەمە کارێکی جینۆساید بوو ئەنجام دەدرا. گەیشتمە ئەو ئەنجامەش کە سەددام کاتێک کە هەستی بەسەرکەوتن کرد ویستی گرفتی کورد لە ڕێگەی نەهێشتنی کوردان لە ئێراقی عارەبیدا چارەسەر بکا. گەلێک لە فاکتەرەکان بەم ئاراستەدا دەچوو؛ کاولکردنی ئەو گوندانەی کە سالّی پێشتر بە چاوی خۆم دیتبووم؛ هەڵەبجە؛ دلّڕەقی خودی سەددام بە خۆی؛ کۆمەڵکوژی؛ زگماکی ڕەگەزپەرستی حیزبە بەعسییەکەی سەددام کە ئێراقی وەک وڵاتێکی عارەبی پێناسە کردو پلەی کوردەکانیشی کەم کردەوە. لە هەمان کاتیشدا باوەڕم وابوو کە قڕکردن تاوانێکی ئەوپەڕە. خۆ لە ئەڵمانیای نازیش، هیتلەر بە کامپەکانی مردن دەستی پێ نەکرد بەڵکو لە ئەنجامی چەند کردارێک کە لە دژی جوولەکەکان کردی بێ ئەوەی کۆمەڵگەی نێو دەوڵەتی بەرپەرچی بداتەوە هێدی هێدی کردەوەی سامناکی کرد تا گەیشتە پلەی قەڵاچۆکردن. تەنانەت ئەگەر خودی سەددامیش ڕانەگیرابا، من هەر نەمدەویست جینۆسایدەکەی ئاوا بێ بەرپەرچدانەوە بە سەر بچێ.

لە دەسپێکی سێپتێمبەر لە واشنتن، نیگەرانی خۆمم بە سینەتۆر پێڵ ڕاگەیاند. ئەویش پێشنیارەکەی پەسند کردم کە یاسایێک پێشکەش بکا بۆ ئەوەی گەمارۆیێکی توند بەسەر ئێراقێدا بسەپێنێ و جەختی لێ کردم بۆ ئەوەی دەمودەست شتێک بنووسم؛ چونکە ئەنجومەنی پیران هێندەی کات لە پێشدا نەمابوو. لە ماوەی کەمتر لە سعاتێک لائیحەیێکی یاسایی چوار لاپەڕەییم نووسییەوە و هەر جۆرە سزایێکی هاتە بیرم بۆ ئەوەی بخرێتە سەر ئێراقێ هەمووم تێی ئاخنی. لائیحەکە هێنانی نەوتی ئێراقێی بۆ وڵاتە یەککرتووەکان قەدەغە دەکرد و هەموو گەرەنتییە داراییەکانی و.ی. بۆ ئێراقێ دەبڕیەوە، نەیدەهێشت نە قەرد بۆ ئێراق مسۆگەر بکرێ و نە یارمەتیشی بدرێ و پێشنیازیشی کرد کە وڵاتە یەکگرتووەکان نەهێڵێ هیچ قەردێکی نێونەتەوەیی بە ئێراق بدرێ. سەرۆک دەیتوانی سزاکان تەنیا بە نووسین ڕابگرێ و بنووسێ: "ئێراق جینۆساید لە دژی دانیشتوانی کوردی ئێراقی پەیڕەو ناکا...و ئێراق ئەو چەکە کیمیاییانە بەکار ناهێنێ کە لە ڕێکەوتنەکانی ژنێف، لە ١٩٢٥دا قەدەغە کراون و متمانەی باوەڕپێکراویشی داوە کە ئەم چەکانە بەکار ناهێنێ." هەر بەخۆشم ناوی لائیحەکەم کردە "یاسای ڕێگەگرتن لە

کـۆمـەڵکوژی ١٩٨٨ "The Prevention of Genocide Act of 1988"چونکە لە لایێک دەمـویست پشـتـیـوانی بۆ بـەدەست بێنم و لە لایێکی تریشـەوە چونکە بـۆیێ بوو ئەو مەبەستە بپێکێ.

رۆبێـرت بایرد، کـە کـارمـەندی دەسـتـەی ئۆفـیـسی سـەرکردەی زۆرینە بـوو، پێی ڕاگەیاندم کە سینەتۆر پێڵ بۆ ئەوەی سوود لە کردەیێکی نهێنی پارلەمـان وەربگرێ دەمودەست لائیحەکەی خستە ناو خشتەی دەنگدانەوە. بایرد بە خۆی و پارێزگاری پارتی کۆماری جێسی هێلمزو دیمۆکراتی تینێسی ئالگۆر پشتگیری لائیحەکەیان کرد. یاسـای ڕێگەگرتن لە کۆمەڵکوژی ١٩٨٨ بەتێکڕای دەنگ لە سـێنەت دەرچوو، ڕۆژی پاشتر نووسراوەو بڵاوکراوە. هەرگیز نەمدیتووە سێنەت، ئاوا خێرا، یاسایێک دەربارەی کێشەیێکی بەم ڕادەیە گرینگ دەربکا.

سـێنەتۆر پێڵ داوای لێ کردم دا بچمـە ڕۆژهەڵاتی تورکیـاو لەوێ هەر بەڵگەیێک بەدەست بێنم کـە پشـتـیـوانی کـردنی پـتـر بۆ لائیـحـەکـە لە هاوس (ئەنجـومـەنی نمایندەکـان) پەیدا دەکا و لەوەش گرینگتـر ئەوەبوو کە بتوانین سـەرۆک ڕێبگن قـایل بکەین لائیـحەکە ڤیتۆ (بەربەست) نەکا. داوام لە کریس ڤان هۆڵن کرد کە لەوکات ڕیکخەری کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوە بوو و کاری لە کێشەکانی ئەورووپا دەکرد (ئێستـا ئەندامی کۆنگرێسـە لە مێریلاند)، داوام لێی کرد تـا لە سـەفـەرەکەم بەگەڵم بکەوێ. بە هـاتنی ڕۆبێرت فین، کە کارمەندێکی سیاسی بوو لە باڵیۆزخانە لە ئەنکارا و هـەمزە ئولوجەیش کە کوردێکی تورکیایی بوو، لە کۆنسۆڵگەری وڵاتە یەکگرتووەکان لە ئەدەنە کاری دەکرد، تیمەکەمان ئامادە بوو[١٥].

یەک حـەفـتـە مـاینەوە، بـە درێژایی سنووری ئێـراقێ لەگـەڵ تورکـیـا، هـەر لە سێگۆشەی سنووری لەگەڵ سوریا تا دەگاتە سێگۆشەی سنووری ئێران دا چووین. هەمووی چیای وشک و درەختی سـەوزو شوێنی کشتوکاڵییەو گوندەکانی لە بەرد دروست کراون. ٦٥٠٠٠هەزار کوردی لادێیی بەخۆو بە کەرو ئەسپ و ئەوەی بە خۆو

---

(١٥) پاشتر کە بوومە باڵیۆز لە کرواتیا، رۆبێرت فینم کردە بریکاری خۆم. پاشان بووە باڵیۆزی باڵیـۆز لە تاجـیکسـتـان و ئینجـا لە دوای ڕووخـانی تالیـبـان بووە یەکـەم باڵیـۆزی وڵاتە یەکگرتووەکان لە ئەفغانستان.

به ئاژەڵەکانیانەوە پێیان هەڵگیرابوو؛ گەیشتبوونە ئەوێ.

لە سەر ئەو نەخشە تۆپۆگرافییانەی کە پێنتاگۆن بۆی ئامادە کردبووین، داوامان لێیان کرد شوێنی گوندەکانی خۆیانمان بۆ دیار بکەن و بۆمان بگێڕنەوە چییان لێ قەوما. توانیمان چلوهەشت گوند لە پارێزگای دهۆک دەستنیشان بکەین کە لە نێوان ٢٥و ٢٧ی ئاب، فڕۆکە هێلیکۆپتەرو باڵنەبزووەکانی ئێراقی بە گازی ژار بۆردومانیان کردبوون. چونکە ئەوانەی ڕزگاریان ببوو، لە دوای هێرشەکان، پەرت و بڵاو ببوونەوەو هەر چینێک بۆ لایێک چووبوو، ئێمەش توانیمان قسەی پەناهەندەکان لە چەند شوێنێکی جیاواز لە تورکیا، لەگەڵ یەکتری بەراورد بکەین و لە ئەنجامدا ڕاستی پەلاماردانی گوندەکانمان بۆ دەرکەوت. (لەو دەمی کە مۆبایل فۆون و ئینتەرنێت نەبوو، بۆیێ هیچ ئەگەرێک نەبوو کە قسەکانیان وەک یەکتری ڕێکخستبێ.)

چونکە شوێنەواری هێرشە گازەکان لە گوندێکەوە بۆ گوندێکی دیکە جیاواز بوو، ئێمە گەیشتینە ئەو دەرئەنجامە کە ئێراق کەرستە کیمیاییەکانی تێکەڵی یەکتری کردبوو؛ چەند (کۆکتێل)ی فرەچەشنی لێ دروست کردبوون، ڕەنگە ئەوەش بۆ ئەوە بووبێ کە ئێراقییەکان ویستبوویان، بە تاقیکردنەوە، توانستی ژاراوی کۆکتێلە جیاوازەکان بزانن. پەنابەرەکان، لە هەندێک لە گوندەکان، لە دوای پەلامارەکان، سەربازی ئێراقییان دیتبوو جلی خۆپاراستنیان پۆشیبوو. زۆر جاران ئەو سەربازە ئێراقییانە ئەو کەسانەیان گوللەباران دەکرد کە نەمردبوون. لە ٢٨و٢٩ی ئاب، سوپای ئێراقێ بەلایەنی کەم هەزار پیاو و ژن و منداڵی لە بازی گورگە Baze Gorge دا بە ڕەشاش گوللەباران کردن.

هەر تاکە پەناهەندەیێک شایێدعەیانێکی پەلامارەکانی گازە ژاراوییەکان بوو، زۆر لەوانە باسی دیتنی تەرمیان دەکرد. باوەڕمان کرد کە بەڵگەی بەکارهێنانی گاز لەلایەنی ئێراقییەوە ڕوون و ئاشکرابوو.

لە گوندی بیرمجنە، ئەسکەندەر لە ٦:٢٠ بەیانی ٢٥ی ئاب لەخەو ڕابوو، کە شەش فڕۆکە هەژدە بۆمبیان بەرداوە. پێی گوتین:- "بەچاوی خۆم دیتم بیست و چوار کەس مردن. کە تۆزێک هاتمەوە سەرخۆ دەستەسڕێکم گرت و خستمە سەر

دەموچاومەوە. هەر لە خانەوادەکەی خۆم هەشت کەس مردن. لە شوێنە دیارەکانی گوندەکەمان هەشتا کەس مردن. خۆزگە فڕۆکەیەکتان بهێنابا، ئینجا من هەموو تەرمەکانم پێتان نیشان دەدا."

کوڕی ئەسکەندەریش بۆی ڕاڤەکردین و گوتی:- "ئاژەڵ و منداڵ مردن. خوێن لە دەمیانەوە هات. شلەیێکی زەرد لە دەم و لووتیان هات. دەنگەکە وەکوو تەقینەوەی بۆمبی ئاسایی نەبوو. کە دەکەوتنە خوارێ دەنگێکی زۆر نزمیان لێوەدەهات و پاشان دەبوونە ئەم هەورە. هەمیشە بڵاو دەبووەوە، هەورێکی زەرد بوو." بەهجەت نایفیش شتێکی هاوشێوەی لە گوندی بەرکوڵێ بۆ باس کردین:- "لە ٦ی بەیانی ڕۆژی ٢٥ی ئاب؛ هەشت فڕۆکە بە سەر ئاوایییەکەماندا فڕین... سی و دوو بۆمبی کیمیاییان فڕێ دا. پاشان ژماردمان. کە بۆمبایەکانیان هاوێشت، دەنگی گەورەیان لێ نەهات، تەنیا ڕەنگێکی زەرد بوو بۆنێ سیری لێ هات. نزیکەی پەنجا ژن مردن. هەندێک کە چوون یارمەتی خێزانەکانیان بدەن، مردن. برام مرد. منداڵەکانم باشن. تا سەددام حوسێن مابێ ناچمەوە.

تیمەکەمان دەگەڵ سەدان لەو ڕزگاربووانەدا قسەی کرد. دوو شت من و کریسی حەپەساند: ئەو شێوە کاریگەرەی کە ڕووداوە تۆقێنەرەکانیان پێ گێڕاوەو دووەمیش کەسیان بریندار نەبیوو. جگە لە چەند پەناهەندەیێک نەبێ، کە شوێنی سووتانیان پێوە دیار بوو، کەس نەبوو کە ئازاری بەر جەستەی کەوتبێ. پاشان دڵنیا بووین کە بریندار نەبوونیان خۆی لە خۆیدا "دەیسەلماند" کە چەکی کیمیایی بەکار هاتبوو. ئەگەر پەلامارەکەی ئێراقێ ئاسایی با، شەڕ لە نێوان پێشمەرگەو سوپا بەریا دەبوو. ئەمەش دەبووە هۆی برینداربوونی کەسانێک کە دەبوو ئێمە چاومان پێیان بکەوتبایە. بەڵام کەسێک نەبوو برینی قووڵی هەبێ. کریس لەم بارەوە گوتی ئەم پەلامارە وەک ئەو سەگەی شارلۆک هۆڵمزە؛_ ناحەپێ.

من و کریس ڕاپۆرتێکی تێروتەسەلمان بۆ واشنتن ناردو سێنەتۆر پێڵ دوو ڕۆژ پاشتر بڵاوی کردەوە. لە کۆتایی ڕاپۆرتەکەماندا هاتبوو: "بۆ ئەوەی باوەڕ بە گەڤاهیدەرەکان نەکەی، دەبێ باوەڕت وابێ کە ئەو ٦٥٠٠٠ پەناهەندە کوردەی لە پێنج شوێنی جیاوازدا هەبوون، توانیبوویان پیلانێک ڕێک بخەن بۆ ئەوەی ناوی ئێراقێ لەکەدار بکەن و توانیبووشیان پیلانەکەیان بە نهێنی بهێڵنەوە."

وەک بەدیار کەوت، کەسێک نەبوو نە لە بەڕێوەبەرایەتی ڕێگن و نە لە ئەنجومەنی نمایندان، کە لەگەڵ ئەنجامی لێکۆڵینەوەکەی ئێمەدا ناکۆک بێ. بەڵام بەرهەڵستییەکی تا ئەوپەڕ هەبوو لە دژی ئەوەی کە هیچ کارێک لە دژی ئێراق بکرێ.

ئەو ڕۆژی کە سێنەت (یاسای ڕێگەگرتن لە کۆمەڵکوژی) دەرباز کرد، جۆرج شۆڵتزی وەزیری دەرەوە لەگەڵ سەعدون حەمادی بریکاری سەرۆک وەزیرانی ئێراقیدا کۆبووەوە و بە ئاشکرا بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لەلایەن ئێراقەوەی ڕیسوا کردو ناوی "ناڕەواو نامۆ"ی لێ نا. بە درەنگانی هەر هەمان ڕۆژ، چارلز ڕێدمەنی گوتەبێژی وەزارەتی دەرەوە، بە ئاشکرا جەختی کردەوە کە چەکی کیمیایی بەکار هاتبوو بەڵام ئەوەی ئاشکرا نەکرد کە وڵاتە یەکگرتووەکان ناوی ئەو فڕۆکەوانە ئێراقییانەی وەرگرتووە کە چەکی کیمیاییان بەکارهێنابوو. ڕێدمەن گوتی: "لە ئەنجامی هەڵسەنگاندنی بارودۆخەکە حکومەتی وڵاتە یەکگرتووەکان هاتە سەر ئەو باوەڕە کە لە میانی هەڵمەتەکەی لە دژی گەریلا کوردەکان، ئێراق چەکی کیمیایی بەکار هێناوە"(١٦).

ڕۆژی چوارشەممەی پاشتر کە دەیکردە ١٤ی سێپتێمبەری ١٩٨٨، ڕێدمەن یاسای ڕێگەگرتن لە کۆمەڵکوژی بە "پێنەگەیشتوو" ناوزەد کرد. ئەمەش گومانی لەوە پەیدا کرد کە دەبێ کەی کاتی ئەوە بێ لە دژی سەددام کار بکەین یان "بگەیی . ئەگەر تا ئەو کات چاوەڕێ بکەین کە هەموو کوردێک دەکوژێ، درەنگ دادێ.

دەستدرێژی و بەرژەوەندی ئابووری و ڕاستی ڕێبازی سیاسی جۆرج شۆڵتزی بۆ هەمووان ئاشکرا بوو. کە لەدوای حەفتەیێک لە سەر سنووری ئێراق – تورکیا بۆ واشنتن هاتمەوە، سەدان پارچە قاقەزی زەردم لەسەر مێزەکەم دیت. هەموو لەو بەرژەوەندییە تایبەتییانەوە بۆم هاتبوون کە زیانی زۆریان لە ئەنجامی سزاکان لێ دەکەوێ. ئێراق گەورەترین کڕیاری برنجی وڵاتە یەکگرتووەکان بوو (لە ئێرکێنسەس لە لویزیانا دەڕوێ) و هاوردەرێکی دیاری دانەوێڵەی وڵاتە یەکگرتووەکانیش بوو.

---

(١٦) ئێراقییەکان هێرشیان بۆ سەر بنکەکانی پێشمەرگە نەبرد، بەزۆری لەبەر ئەوە بوو کە بە شوێنەکانیان نەدەزانی. هەموو هێرشەکان ئاراستەی سەر گوندەکان کران (چونکە شوێنی دیاریان هەبوو)و نزیکەی هەموو قوربانییەکانیش شەڕنەکەر بوون.

بەرژەوەندە کەشاوەرزییە ئەمێریکییەکان بە توندی بەرهەڵستی لائیحەکەیان کرد. کە جۆون بریکسی سێنەتۆری دیمۆکراتی لویزیاناو ئەندامی لیژنەی کیشە کشتوکاڵییەکانی ئەو ویلایەتە، گریا کە پێی گوتم من جوتیارەکانی ویلایەتەکەیم جینۆساید دەکرد. لە ناو کۆمەڵی پیشەدارانی ئەمێریکی وا باوبوو کە لەگەڵ کۆتایی هاتنی شەڕی ئێران ـ ئێراقێ، یەکسەر ئێراق بلیۆنەها دۆلار بۆ دروستکردنەوەی وڵات خەرج دەکا. کێشەی کوردە ئێراقییەکان بەختی هێندە یار نەبوو، بەڵام هیچ هۆیێکیش نەبوو بۆ ئەوەی پیشە ئەمێریکییەکان گۆمڕی زێڕیان لە دەست بچێ. هیچیان نە ئەوەیان ڕەچاو کرد کە ئێراق ١٠٠ بلیۆن دۆلار قەردار بوو، نە ئەوەش کە زۆربەی بازرگانی وڵاتە یەکگرتووەکان لەگەڵ ئێراقێ یارمەتی بوو حکومەت دەبووە دەستەبەرو پێشکەشی ئێراقێی دەکرد. (کە لە ١٩٩٠، ئێراق کومیتی داگیر کرد، باجدەرە ئەمێریکییەکان بلیۆنان دۆلاریان وەرگرتەوە کە بەڕێوەبەرایەتی ڕێیگن و پاشتریش هی بوش بە ئازادی پێشکەشی سەددام حوسێنیان کردبوو.)

هەرچەندە سێنەت یاسای ڕێگەگرتن لە کۆمەڵکوژی دەرباز کردبوو، بەڵام لە بن فشاری پیشەوەرو بەرهەڵستی کردنی بەڕێوەبەرایەتی ڕێیگنی بوو، ئەنجومەنی نمایندان کە دیمۆکراتەکان سەرکردایەتییان دەکرد، یاسایەکەیان ماندەڵ کرد. لە بری ئەوەدا، هاوس لائیحەیێکی نەرمتری سزاکانی سەر ئێراقی دەربازکرد. پاشان، لە دوایین ڕۆژی دانیشتنەکانی کۆنگرێس، دانتێ فاسێلی سەرۆکی کۆمیتەی کاروباری دەرەوەی هاوس و دان ڕۆستێنکۆوسکیی سەرۆکی کۆمیتەی شێوەو هۆیەکان House Ways and Means Committee، بە دژی زمانی سزاکانی سەر ئێراقێیان لادا کە پێشتر وتوێژکارانی هاوس و سێنەت لەسەری ڕێک کەوتبوون. بە بەرهەڵستیکردنی بەڕێوەبەرایەتی و بەرژەوەندییە تایبەتییەکان و پەلەکردن لە دواخستنیدا، یاسای ڕێگەگرتن لە کۆمەڵکوژیان کوشت.

بەڕێوەبەرایەتی ڕێیگن دەیویست پێ لە هێرشە گازییەکانی سەددام حوسێن بۆ سەر کوردان بخشێنێ؛ چونکە هێشتا هەر باوەڕی وابوو کە ڕەنگە بشێ هەڵسوکەوتی دکتاتۆر هێور بکرێتەوەو ئێراق بکرێتە دەستمایەیێکی ستراتیژی. چونکە بەڕێوەبەرایەتی خەونی بەوەوە دەدیت کە ئێراق وا لێ بکات کە خۆی

دەیەویست، بۆیێ ستراتیژسازەکانی هەرگیز نەیانپرسی ئایا دەشێ ئەو ڕژێمەی گەلەکەی خۆی کیمیاباران کرد، ببێتە هاوکارێکی متمانەداری وڵاتە یەکگرتووەکان و بشبێتە هێزێک کە یارمەتی سەقامگیرکردن و بەرپا بوونی ئاشتی لە هەرێمەکەدا بدا بەڵگەی کەسایەتی سەددام حوسێنی بە ئاشکرا لەبەر چاوی هەمووان‌دا بوو دا ببینن _ پەیکەرو پۆرتەرێتەکانی لە هەموو شوێنێک و ئەو هەموو هێمایانەی خۆ خۆشویستنی و ئەو ترسەی کە لە هەموو ئێراقییەکدا هەست پێ دەکرا هەرکاتێک کە دەمەتەقێیەکە دەبووە سیاسی و ئەو ئیعدامە بە ئاشکرایانەو خاپوورکردنی گوندەکانی کوردان و بەکارهێنانی گاز _ بەڵام هێشتا بەڕێوەبەرایەتی ڕیگنی هەموو ئەوانەی خستە ژێر پێ و بە دوای سەرابی هاوکارییەکی ستراتیژی کەوت.

لە ١٥ی سێپتێمبەری ٢٠٠٣، کۆڵن پاوڵی وەزیری دەرەوە سەردانی هەڵەبجەی کرد. لە مۆزەخانەکەدا راوەستا، سەیری وێنەی قوربانییەکانی کردو پەیمانی بە کورد دا کە "ئەوەی لە ١٩٨٨ لێرە رووی دا، هەرگیز دووبارە نابێتەوە." کە پەیامنێرێکیش لێی پرسی ئایا بۆ کاردانەوەی بەڕێوەبەرایەتی ڕیگن هێندە لاوازو بێهێز بوو، پاوڵ پاکانەی بۆ ئەو سیاسەتە کرد کە خۆی لەو دەمی کە ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی بوو، ڕێکی خستبوو. بەڕیوەبەرایەتی لەو کاتدا، باسی هەڵەبجەی کرد. لەو کاتی کۆشکی سپی و وەزارەتی دەرەوە باسیان کرد. بە توندی ماندەڵ و ریسوایان کرد. بەڕێوەبەرایەتی ڕیگنی لەو کاتدا هیچی نەکرد، واتا نە پشتگوێی خست و نە بایەخیشی پێی دا.

# بەشی ٤

## سەرهەڵدان

لە دوای ئەو گوتارەی سەددام حوسێن، لە بەهاری ١٩٩٠، خوێندییەوەو تێیدا هەڕەشەی بەکارهێنانی چەکی کیمیایی لە ئیسرائیل کرد، ئەو هەوڵانەی کۆنگرێس دەیدا تا سزای ئابووری ولاتە یەکگرتووەکان بە سەر ئێراقیدا بسەپێنێ، تەوژمێکی تازەی وەرگرت. سێناتۆر پێڵ، لەگەڵ هەردوو سێناتۆرە نیویۆرکییەکان، دانیێل پاتریک مۆینیهان و ئالفۆنس داماتۆوە یاسایێکی نوێیان پێشکەش کرد. یاسای پابەندبوونی ئێراقێ بە یاسای نێودەوڵەتی Iraq International Law Compliance Act مەرجی زۆری خستە پێش ئەو یارمەتییانەی بۆ ئێراقێ دەچوو. داوای لە ئێراقێ کرد کە پابەندی هەموو ئەو ئیلتزاماتانەی ببێ کە لە ڕێککەوتنی جینۆساید و پرۆتۆکۆلەکانی ژنێڤی ١٩٢٥ی تایبەت بە قەدەغە کردنی بەکارهێنانی گازی ژارو بلاونەبوونەوەی چەکی ناووکیدا هاتووە.

جۆرج هـ. و. بوش بە توندی بەرهەڵستی یاسایەکەو هەر کارێکی تری لە دژی ئێراقێی کرد. لە دوای وەرگرتنی دەسەلاتیش لە ١٩٨٩، یارمەتییە کشتوکاڵییەکانی دووبەرابەر بۆ ئێراقێ ناردو کردیە یەکێک لەو ولاتانەی کە زۆرترین یارمەتی دەرەکیی ولاتە یەکگرتووەکانی بۆ دەچوو. لە ١٥ی حوزەیرانێ، مۆینیهان لە دانیشتنێکی کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی سەبارەت بە فرەجار پێشێلکردنی پەیمانەکان لە لایەن ئێراقەوە، گرێ لە جۆون کێلیی بریکاری وەزیری دەرەوە بۆ ڕۆژهەلاتی ناڤین، بەردا کێلی وەلامی داوەو گوتی من پارێزەر نیم. جگە لەوەی کە جینۆسایدی کوردەکان و هەستانی سەددام بە گازبارانکردنی گەلەکەی و هەوڵەکانی ئێراقێ بۆ بەدەستهێنانی چەکی ناووکی، بەلای ئەمێریکاوە گرینگ نەبوون و لە نزمترین ئاستی تەکنیکی یاساییەوە قسەیان دەربارەوە دەکرا، ڕێگەش بە گەورە

شارەزایە هەرێمییەکانی حکومەتی ولاتە یەکگرتووەکان نەدەدرا کە قسە دەربارەیانەوە بکەن.

هەرچەندە بەڕێوەبەرایەتی بەرهەڵستی دەکرد، بەڵام سینەت، لە ٢٥ی تەموز، یاسای پابەندبوونی ئێراقیی بە یاسای نێودەوڵەتی پەسند کرد، هۆی دەربازکردنەکەشی ئەو پشتیوانییە پڕ لە سۆزە بوو کە سینەتۆری کۆماری لە کێنسەس خانمی نانسی لاندەن کەسیباوم کردی. کەسیباوم گوتی ڕاستە جوتیارانی کێنسەس دەیانەوێ بەروبوومەکانیان بفرۆشن، بەڵام "لەو باوەڕەدا نیمە کە هیچ جوتیارێکی ئەمێریکی بیەوێ بەرهەمەکانی خۆی... بۆ ولاتێک بنێرێ کە چەکی کیمیایی بەکار هێناوەو منداڵەکانی ئەشکەنجە داوە." تەنیا دوازدە سێنەتۆر پشتیوانی هەڵوێستی سەرۆکیان کرد.

ئەوانەی لە ناو بەڕێوەبەرایەتی و لەدەرەوەش هاوسۆزی ئێراقێ بوون، پێشبینییان لە سەددام حوسێن دەکرد پاش ئەوەی لە شەڕەکەی ئێران ئێراق دەرباز بوو، ئیتر ڕوو بداتە خواستەکانی گەلی ئێراق و ژیانیان خۆشتر بکا. لە میانی گەشە پێکردنی ئابووریش، ئومێدیان وابوو سەددام پێداویستییەکان لە ئەمێریکا بکڕێ. دەشیانگوت کە کەمارۆدان سزای ئێراقێ نادا، بەڵکو تێکەولێکەکە بۆ شوێنێکی تر دەبا. هاوسۆزەکانی شتێکی بەهاداریان لە بیر نەبوو؛ ئەویش ئەوە بوو کە: ئێراق شکا.

شەڕی ئێران ئێراق، ئێراقی بە بن قەردی گرت. ٦٥ بلیۆن دۆلار قەرداری ڕۆژئاواو یەکێتی سۆڤییەتی بوو. لەوە بایی چەندەها بلیۆن دۆلار قەرد چەکی لە سۆڤییەت کڕیبوو. عارەبستانی سعودی و میرنشینە عارەبییە یەکگرتووەکان و کوێتیش ٨٠ بلیۆن دۆلاریان بە قەرد، لە کاتی شەڕ، بە ئێراقێ دابوو. کوێت فشاری بۆ وەرگرتنەوەی قەردەکەی دەکرد. سەددام دانی بەوە دانەنا کە شەڕەکە تەنیا هەڵەی ئەو بووەو خاوەن قەردە عارەبەکانیشی بە ناجوامێر ناوزەد کردو گوتی ئەوانە بە دوای ئەو پارانەدا دەگەڕێن کە بۆ بەرگریکردن لە هەموو عارەب خەرج کرابوو و ئێراقییانیش لە ڕاپەڕاندنی ئەو ئەرکە خوێنیان ڕژابوو.

سەددام کەوتە بەر دەمی فاقی بێ پارەییەوە. پێویستی بە داهاتی پتری نەوت هەبوو بۆ ئەوەی قەردەکانی پێ بداتەوە، بەڵام لەو دەمەی ئێراق بەرهەمی نەوتی پتر

کرد کوێتییە بێ منەتەکان قایل نەبوون هەناردەی نەفتی خۆیان کەم بکەنەوە. نرخی نەوت دابەزی و هەرەسی بە پرۆژەکەی سەددام بۆ پتر وەبەرهەمهێنانی نەوت، هێنا. لە حوزەیران و تەموزی ١٩٩٠، سەددام هەڵوێستی توندتری بەرانبەر بە کوێت نیشان دا.

لە ٢٥ی تەموزی ١٩٩٠، سەددام بانگی ئێیپرڵ گلاسپیی باڵیۆزی ئەمیریکی لە ئێراقێ کردو لەگەڵی کۆبووەوە. بەهۆی هەرزانی نرخی نەوت، سەددام گلەیی لە گلاسپی کردو باسی قەرزەکانی شەڕی کرد کە، وەک خۆی ناوی نا، یارمەتی بوون و ئێستا هەندێ لە وڵاتە عارەبییەکان تا ئێستاش هەر وەک قەرز تۆماریان کردووە، و باسی دوژمنداری کردنی سەددامی لە ناو، "هەندێ لە گرووپەکانی، ناو حکومەتی وڵاتە یەکگرتووەکان و دوژمنکاری کوێتی،" بۆ کرد. گلاسپی شارەزاییەکی زۆری لە باری عارەبییەوە هەیەو بۆیێ لە ئۆفیسی بیانی رێزی تایبەتی لێ دەگیرێ؛ ئەمجارە زەمینی نەدا ئەو هەڕەشەیەی سەددام لە کوێتی کرد. جەختی لەسەر ویستی سەرۆک بوش کردەوە کە دەیویست پەیوەند-یەکی باش لەگەڵ ئێراق ببەستێ و نارەزایی بەڕێوەبەرایەتیشی لە سزای بازرگانی نیشان دا. خانمی گلاسپی لێبووردنی خواست لەو سەرگوتارەی دەنگی ئەمێریکا کە ئێراقی سەددامی بە رژیمە کۆمیونیستە تازە ڕوخاوەکانی ئەورووپای بەراورد کردبوو و ئەو دیمانەیەی دایانا سۆیەر بۆ ABC NEWS گەڵیدا کردبووی بە، "بێ بەها و ناڕەوا،" ناوزەد کرد. (لە ڕاستیدا، دایانا سۆیەر بە وردی وێنەی دڵڕەقی رژیمی سەددام حوسێنی کێشابوو، باسی گازبارانکردنی کوردەکانیشی تێدا کردبوو.)

گلاسپی دەربارەی کوێت بە سەددامی گوت: "ئێمە هیچ بۆچوونێکمان نییە دەربارەی ئەو ململانێیەی کە عارەبەکان لەناو خۆیاندا هەیانە، وەک ئەو کێشە سنوورییەی کە لە نێوان ئێوەو کوێتدا هەیە. گلاسپی سەددامی لە پەلاماردانی کوێت ئاگادار نەکردەوەو باسی نیگەرانی ئەمێریکای لەمەڕ چەکە کیمیاییەکان و پرۆگرامی پەرەپێدانی چەکی ئەتۆمی، و کێشەی کوردو ڕێکۆردی ئەویەڕ خراپی مافی مرۆڤی ئێراقیی لەگەڵدا نەکرد. تایتڵی ئەو ڕاپۆرتەی بۆ واشنتنی ناردەوە، "پەیامی دۆستایەتی سەددام بۆ سەرۆک بوش،" نیشانی دەدا کە چەند بە خراپی نەیتوانی لە نیازەکانی سەددام تێبگا.

گلاسپی لەم سەرچیغ چوونەیدا بە تەنیا نەبوو. لە حەفتەی کۆتایی مانگی تەموزو لە کاتێکدا کە قەیرانەکە پەرەی دەسەند، بەڕێوەبەرایەتی بوش سێ پەیامی بۆ سەددام حوسێنی نارد. پەیامێکیان یەک لە بریکارەکانی وەزارەتی دەرەوە گەیاندییە دەستی باڵیۆزی ئێراقێ لە ولاتە یەکگرتووەکان، ئەم پەیامە بەڕاستی وشیاری دا بە ئێراقێ، نەکا هێز بۆ چارەسەر کردنی کێشەی سنووری لەگەڵ کوێت بەکار بێنێ. بەلام پەیامەکەی دواتر سەرۆک بوش بۆ سەددام حوسێنی ناردو تەنیا پەیامێکی دۆستایەتی بوو. کارێکی سروشتی بوو کە سەددام بایەخی پتری بە پەیامەکەی سەرۆک بوش دا، بە تایبەتیش خۆی پتر ڕای لەو پەیامەیان بوو. کە گلاسپی لە ڕۆژی ١ی ئاب بۆ پشووی هاوینەی بەغدای بەجێ هێشت، هیچ هەستی بەو کێشەیە نەکرد کە خەریک بوو سەری هەڵدەدا.

ئەوڕۆژە دوا ڕۆژ بوو کە وەزیری بەرگری ریچەرد چێنی لە واشنتن بەسەری ببا بەر لەوەی بۆ پشوودان بچێتە وایۆمینگ، کە شاری خۆی بوو. وەزیری دەرەوە جەیمس ا. بێیکەر بەڕێوە بوو دەچووە مۆنگۆلیا. پلانەکەشی وابوو کە لەوێ بچێتە ڕاوە مەری کێوی. لەوکات و لە کەمێک پاشی نیوەی شەو، سوپای ئێراقێ سنووری بەزاندو بۆ ناو خاکی کوێتێ چوو. لە ماوەی بیست و چوار سەعاتدا هەموو ولاتەکەیان کۆنترۆڵ کردو کوێتییەکان بە چەکە ئەمێریکییەکانیانەوە بەرگرییەکی کەمیان لە خۆیان کرد.

دوای داگیرکردنی کوێت، حکومەتی ئێراقی دەقی چاوپێکەوتنەکەی سەددامی لەگەڵ گلاسپی بلاو کردەوە. لیبراڵە ڕەخنەگرەکان لە سەرەتادا دەقەکەیان کردە بیانوو بۆ ئەوەی بەرپرسییەتی داگیرکردنەکە بخەنە ئەستۆی دپلۆماسی ولاتە یەکگرتووەکانەوەو کاتێکیش کە سەرۆک بوش خۆی بۆ کردەوەیێکی سەربازی ئامادە دەکرد بۆ ئەوەی سەددام لە کوێت وەدەرنێ، بە ڕاشکاوی گومانیان لە نیازی سەرۆک بوش دەکرد. میدیای عارەبی هێشتا لەمەش دوورتر ڕۆیشت و گوتیان کە سەرۆک بوش بە نیازەوە سەددامی هان دا بۆ ئەوەی کوێت داگیر بکا تا بیانووی هەبێ بۆ ئەوەی بەهێزترین دەوڵەتی عارەبی تێکبشکێنێ.

ئەگەر سەیری ناوەڕۆکی دیمانەکەی گلاسپی لەگەڵ سەددامی بکەین و لە

ئەنجامەکانیشی وردبیینەوە لاوازی پێوە دیار دەبینین، بەڵام ناشێ ببێتە بڵێین کە گڵۆپی سەوزی بۆ سەددام داگیرساند تا کوێت داگیربکا. بەڵام سەددام هەر یەک لەو پەیامـــانەی بەتـەنیـــا هەڵنەســـەنگاند. بەڵکو وایزانی ئەمـــەشـیـــان درێژەی ئەو دیپلۆمـاسـیـیـەتەیە کـە وڵاتە یەکگرتووەکان لە ١٩٨٠وە بەرانبـەر بە ئێـراقێ پەیڕەوی دەکرد. کە سـەددام ئێرانی داگیر کرد، ئەنجومەنی ئاسایش بە پشتیوانی لێکردنی سـەرۆک جـیـمـی کـارتەر، بڕیارێکی دەرکـرد کـە تیـایدا لە ئێـراقـێی نەخـواست دا هێـزەکانی خـۆی لە خـاکی داگیـرکـراوی ئێـرانێ بکشـێنێـتـەوە. سـەرۆک ڕێـیگنیش دەسـەڵاتی هـاوبشکی کـردنی زانـیـاری هەواڵگری و یارمـەتی تریشی بۆ بەردەوامی شەڕی بۆ ئێراق مسۆگەر کرد. لە ١٩٨٣وەڕا ئێراق دەستـیپێکرد گازی خـەردەلی لە دژی سـەربـازانی ئێـران بەکـار بێنێ و پاش مـاوەیێکی کـەم لە دوای ئەوەوە، بەڕێوەبەرایەتی ڕێیگنی بایی سەدان ملیۆن دۆلار یارمەتی بۆ ڕژێمی سەددامی نارد. کە ئێـراق لە ١٩٨٧ پەلامـاری USS Starkی دا، سـەرۆک ڕێیگن گازاندەی لە ئێرانێ کرد. کـە لە ١٩٨٨یش ئێـراق کوردەکـانی گازباران کـرد، بەڕێوەبەرایەتی ڕێـیگن بە توندی بـەربـەرچی هـەوڵەکـانی کـۆنگرێسی داوەو نەیهـێـشت هـیچ سـزایێـک بەسـەر ئێراقێدا بسەپێنێ. دوای ساڵێکیش. بەڕێوەبەرایەتی بوش یارمەتییەکانی بۆ ئێراقێ پتـر کـرد. تەنانەت لەو ڕۆژەی کە ئێـراق کـوێتی داگیـر کـرد، بەڕێوەبەرایـەتی بوش خەریک بوو بەربەرچی هـەوڵەکانی کۆنگرێسـی دەداوە نەکا سزاکان بە سەر ئێراقـێدا بسەپێنێ.

ئەستـەم نییە تێبگەین کە سەددام چۆن تەمـاشای ئەم هەموو پشتیوانی لێکردنەی دەکرد. سیاسەتی ئەمێریکی جەختی لەسەر گرینگی بۆچوونی تایبەتی خۆی کردەوە. وڵاتە یەکگرتووەکان لە ڕابردوودا گەلێ جار چاوی لە پێشێلکردنی یاسای نێودەڵەتی خشاندووە. ڕەنگە هەر بۆیێش سەددام وای مـەزەندە کردبێ کە وڵاتە یەکگرتووەکان ئاخنینی کـوێت بۆ ناو ئێـراقێ ڕیسـواو مـاندەل دەکـا، بەڵام لە کـۆتاییـدا ملکەچی بارودۆخـە تازەکـە دەبێ. ئەوەش لە بیـر نەکـەین کـە وڵاتە یەکگرتووەکـان هەمـیشـە پێوستی بە نەفتی ئێراقێ و کوێتێ دەبێ. (بەلای کەم لە مێشکی سەددامی) ئێراق لە پێشـەوەی هەموو وڵاتانی عارەبی و ئە هەمـووانیش گرینگتر بوو بۆ ئەوەی بەربەرچی

شۆڕشی ئێرانیّ بداتەوە. هێشتا واشنتن دەیویست ئێراق بۆی ببێتە شەریکێک لە بواری ستراتیژی و پیشەکانیشەوە. نە لە سیاسەتی ئەمێریکی و نە لەو چەند پەیامەی دواین ڕۆژەکانی تەموزی ١٩٩٠دا، ئاماژەیێکی وا هەبوو وا لە سەددام بکا کە بە شێوەیێکی جیاواز بیر بکاتەوە.

***

سێ ڕۆژ بوو تانکەکانی سەددامی کوێتیان داگیر کردبوو کە جەلال تاڵەبانی لە دیمەشقەوەڕا تەلیفۆنی بۆ کردم. لێی پرسیم ئایا کاتەکە گونجاو بوو تا سەردانێکی ئەمێریکا بکا؟ نەیدەویست بیر لە وەڵامەکەی بکەمەوە، چونکە لە واشنتن، ئێراق بە پێش هەموو کێشەکانی تر کەوتبوو. ئەگەر تەنیا تاقە یەک جارێک پێویست بە کورد هەبووبێ ئەوا ئێستا بووە. تەنیا تاڵەبانی نەبوو کە لە چارەنووسی ڕژیمی سەددام گەیشت، بەڵکو کوردەکان هاوپەیمانی پێشبینکراو بوون لە هەر شەڕێک ئەگەر بەرپا ببێ. پێم گوت؛ بێگومان دەبێ بێی.

تاڵەبانی لە ١٠ی ئاب گەیشتە واشنتن و لە لا براسێری کە خارنگەیێکی بچووکی فەرەنسییەو دوو کۆڵان لە سێنەت دوورە، بۆ تێشت خواردن بەیەک گەیشتین. ڕۆژێکی خۆشی هاوینە بوو و ئێمەش لەسەر مێزێک لە نزیک سێبەری درەختێک دانیشتین. تاڵەبانی پیاوێکە زۆر حەز لە خواردنی خۆش دەکا و گەلێکیش بەدوای زانستییەوە عەبداڵە. کە گەیشتینە یەکتری منی بە توندی لە باوەش گرت. د. نەجمەدین کەریمی لەگەڵ بوو. د. نەجمەدین کەریم نوژدارێکی مێشکە لە ناوچەی واشنتن کار دەکا و پێشتر لە چیاکانی کوردستان پزیشکی تایبەتی مەلا مستەفا بارزانی بووەو پاشان بە پەناهەندەیی هاتۆتە وڵاتە یەکگرتووەکان و لەوێ دووبارە مەشقی پزیشکی کردۆتەوە[17]. جگە لە د. نەجمەدین کەریم، تاڵەبانی د.لەتیف ڕەشیدی هاوزاوای و بەرپرسی یەکێتی نیشتمانی کوردستانی لە لەندەن، لەگەڵدا بوو[18].

---

(١٧) لە ئاداری ١٩٨١، کاتێک کە جۆون هینکلی سەرۆک ڕێیگنی دا بەرگوللە، د. نەجمەدین کەریم لە نەخۆشخانەی زانکۆی جۆرج واشنتن نۆبەتچی بوو. لەو کاتەی کە سەرۆک چاک دەبووەوە، د. نەجمەدین سەردانی کردو باسی کوردی لەگەڵدا کرد.

(١٨) لە ٢٠٠٣، ڕەشید پۆستی وەزیری سەرچاوەکانی ئاوی ئێراقیی وەرگرت.

باسی ئەوەمـان کـرد دەبێ تاڵەبانی چاوی بە کێ بکەوێ و دەبێ چ پەیامـێکیش بگەیەنێ. کەریم کە خۆی بەتەنیا لۆبییەکی کوردی بوو (زۆریش کاریگەر بوو)، چەند پێشنیـازێکی کـرد. منیش جـەختم لەسـەر ئەوە کـردەوە کـە کێـشـەی کـورد زۆر نەناسراوەو بۆیێ دەبوو زۆر ئاگادار بێ و ئەرکەکەی بکاتە ئەرکێکی پێناسەکردن. من و کـەریم چەند دیدارێکمـان لەگەڵ گەورە ئەندامانی کـۆنگرێس بۆی ڕێکخست. لەوانە سـێنەتۆر پێڵـو سێنەتـۆر ئێدوەرد کێنێدیو سێنەتۆر جۆون کێری بوون. جۆون کێری خۆی لە هەڵمەتی هەڵبژاردنەوەی دزیەوەو لەگەڵ سێنەتۆر پێڵ هاتە دوورگەی ڕۆودو لەوێ ئەویش لە ناوەندی هـەڵمـەتـی هەڵبـژاردنەوەکـەیدا بوو. تاڵەبانی لەگـەڵ دەسـتـەی نووسـەرانـی گـەورە ڕۆژنامـەکـانی ئەمـێـریکی کـۆبووەوەو لە لایەن ئەو ڕێکخراوانەوە بانگێشت کرا کە بارەگاکانیان لە واشنتنەو ئامۆژگاری و زانیاری دەربارەی کێشە ئابووریو نیشتمانیی‌ەکان پێشکەش دەکەن بۆ ئەوەی چەند گوتارێک پێشکەش بکا

هیـچ بەرپرسـێکی بەڕێوەبەرایەتی بوش نەیویست چاوی بە تاڵەبانی بکەوێ. لە مـیـانـی سـەردانی کـردنی واشنتن لە ١٩٨٨، داوام لە چەند برادەرێک لە وەزارەتی دەرەوە کرد کـە ببیـنێ. لاری پۆوپ، ئەو کـات بەڕێوەبەری ئەو ئۆفیسـەی وەزارەتی دەرەوە بوو کە ئێران و ئێراقی بەدەسـتەوە بوو، قـایل بوو چاوی پێی بکەوێ. جێی داخە کە پۆوپ چەند ڕۆژێک بەر لە سەرادنەکەی کەنعان ئێڤرەنی سەرۆکی تورکیا، بۆ واشـنتن چاوی بە تاڵەبانی کـەوت. ئێـڤـرەن ئەو ژەنراڵە بوو کـە لە ١٩٨٠دا، کودەتایێکی سـەربازی لە دژی حکومەتە دیمۆکراتییەکەی تورکیا کردبوو، زۆریش لە دژی کێـشـەی کـورد بوو. هەر ئەو سیاسـەتە سـەرکـوتکارییـەی ئەوبوو کـە لە ناچە کــوردییــەکــانی باشــووری ڕۆژهـەڵاتی تورکـیــادا پەیڕەوی دەکـرد بووە هۆی چەخماخـەدانی شەڕە جوداخوازە کەردییەکەی کە لە ١٩٨٤وە هەڵگیرساو تا ١٩٩٩، درێژەی کێشا.

هەرچەندە تاڵەبانی هیچ پەیوەندییەکی بە کوردە یاخیبووەکانی تورکیاوە (PKK واتا پارتی کرێکارانی کوردسـتـان) نەبوو و ڕای لە تاکتیکە تیرۆریستـییـەکـەی ئەوانیش نەبوو، ئێڤرەن تەنیا جەختی لەسەر ڕەگەزەکەی کرد. کە ئێڤرەن چاوی بە

شوڵتزی وەزیری دەرەوە کەوت، یەکسەر لێپرسی بۆچ وەزارەتی دەرەوە چاوی بە کوردە تێرۆریستەکان دەکەوێ. شوڵتز هیچ ئاگای لە دیدارەکە نەبوو (ئاساییە کە وەزیر لە دیمانەکانی سەرۆک بەشەکان ئاگادار ناکرێتەوە)، بۆیێ زۆر نیگەران بوو. شوڵتز دەیتوانی بە دکتاتۆرەکەی تورکیا بڵێ کە حکومەتی ولاتە یەکگرتووەکان خۆی بڕیار دەدا چاوی بە کێ بکەوێ و تورکیا ناتوانێ پێمان بڵێ دەبێ گوێ لە کامە هاولاتی ئێراقی ڕابگرین. بەلام لەبری ئەوە پۆوپ بە بەر شەپۆلێک تووڕەیی شوڵتز کەوت. کە ئێراقییەکانیش گازاندەی خۆیان کرد، ئینجا وەزارەتی دەرەوە بڕیاری قەدەغە کردنی هەموو جۆرە چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ ئۆپۆزیسیۆنی ئێراقی داو ئەم یاساغکردنە کوردیشی گرتەوە.

لە ١٩٩٠ ئێڤرەن لە حوکم نەمابوو، لە شوێنی ئەو سەرۆکێکی هەڵبژێردراو لە جێی بوو. تورگۆت ئۆزال، شانازی بەوە دەکرد کە داپیری کورد بوو. لە دوای داگیرکردنی کوێت وا پێدەچوو کە بەرپرسانی ولاتە یەکگرتووەکان چیتر گوێیان بە ئازاردانی سەددام حوسێن نەدەدا. لە هەمان کاتیشدا سیاسەتی پەیوەندی- نەکردن non-contacts بە ئۆپۆزیسیۆنی ئێراقی هەر نەگۆڕابوو. ولاتە یەکگرتووەکان سەرچاوەیێکی گرینگی هەواڵگری لەدەست دابوو. کوردو شیعە لە ئەنجامی ئەم سیاسەتە دووچاری کارەسات هاتن.

لە کۆتاییدا داگیرکردنی کوێت لەلای سەددامی، قۆڵی بە تیمی سیاسەتی دەرەوەی بوش هەڵکردو هەموویانی ڕاتەکاند. چێنی، وەزیری بەرگری هانی بردە بەر فەرمانداراتی عارەبستانی سعودی تا بێڵن سوپای ئەمێریکی لە خاکی ولاتەکەیان بلاوە پێبکەن. تۆمەس پیکەرینگی باڵیۆز لە نەتەوە یەکگرتووەکان ئازایانە توانی پێنج بڕیار لە ئەنجومەنی ئاسایش دەرباز دەرکردو فشاری پتری خستە سەر ئێراقێ. لە ٢٩ی نۆڤێمبەری ١٩٩٠، ئەنجومەنی ئاسایش بڕیاری ژمارە ٦٧٨ی دەربازکرد کە ڕێگەی دەدا هێز لە دژی ئێراقێ بەکار بێت ئەگەر تا ١٥ی یەنایری ١٩٩١، هێزەکانی خۆی لە کوێت نەکشێنێتەوە. بێیکەری وەزیری دەرەوە بوو، بەڕێوەبەری هەڵمەتەکەی بوش و برادەریشی بوو. هەوڵێکی بێ پایانی بۆ پارەکۆکردنەوە دا. لە پایزی ١٩٩٠، بێیکەر، بە دیپلۆماسییەتە زیرەکانەکەی خۆی، هێندەی پارە لە ولاتانی بیانی کۆ

کردەوە کە وڵاتە یەکگرتووەکان تەنانەت قازانجیشی لە شەڕی کەنداو کرد. سەرەک بوشیش پشتی دایە پەیوەندییە تایبەتییەکانی خۆی لەگەڵ سەرکردەکانی جیهان و هەوڵێکی چڕوپڕی دا تا توانی هاوپەیمانییەتێکی سەربازی لە سی و پێنج وڵات پێک بێنێ.

بوش ژیرانە بڕیاری دا دەسەڵاتی شەڕ لە کۆنگرێس وەربگرێ و بەرپەرچی هەموو ئەو هەوڵانەی داوە کە دەیانویست ئێراق بکەنە کێشەیێکی پارتیزانیو تا پاشی هەڵبژاردنەکانی کۆنگرێسی ۱۹۹۰ چاوەڕێی کرد ئینجا ڕووی لە کۆنگرێس کرد. لە نۆڤێمبەرو دیسێمبەری ۱۹۹۰، کۆمیتە پەیوەندیدارەکانی هاوس و سێنەت کۆبوونەوەی چڕوپڕیان بۆ بیستنی قەیرانی کەنداوی پارسی کرد. دوای ئەوەی کە کۆنگرێسی نوێ لە ۳ی یەنایری ۱۹۹۱ دەستی بەکار کرد، کێشەکە بەتەواوەتی بۆ هەردوو ئەنجومەنەکە تەتڵەو ئامادەو لەبەردەستیان بوو. قانوونی دەسەڵات دانە سەرۆک بۆ ئەوەی دەست بە شەڕ بکا، بە پێنج دەنگ لە سێنەت دەرباز بوو(۱۹)، بەڵام پەراوێزەکە لە هاوس بەرینتر بوو؛ ۲۰۰ بەرانبەری ۱۸۳ دەنگی دژی شەڕ بوو.

هەرچەندە کەمینەیەکی زۆر لەگەڵ ئەنجامەکەیدا نەبوو، بەڵام هیچ ئەندامێکی کۆنگرێس گلەیی لەوە نەکرد کە فریو درابێ. هەرچەندەش دەنگدانەکە نهێنی بوو، پرۆسەکە بووە هۆی یەکگرتنی هەموو لە هەمووی گەل؛ چونکە هێزەکانی سوپای ئەمێریکا، لە دوای شەڕی ڤییتنام، دەستی بە گەورەترین هەڵمەتی سەربازی کرد.

کە سەرۆک بوش، لە ۱۷ی یەنایری ۱۹۹۱، فەرمانی بە بۆمبا هاوێژەکانی هاوپەیمانان دا تا دەست بە ئۆپەراسیۆنی سەربازی بکەن، کردارەکەی بەپێی یاسای نێودەوڵەتی بوو و نەتەوە یەکگرتووەکانیش پشتیوانییەکی تەواوی لێ دەکرد. لە کاتێکدا کە وڵاتە یەکگرتووەکان گەورەترین هێزی سەربازی لە شەڕدا هەبوو، سی و پێنج دەوڵەتی تریش هاوبەشییان لە هاوپەیمانەتییەکە کرد و پشکداربوونەکەشیان هەر بە قسە نەبوو. ئەو وڵاتانەی لەشکری زۆریان نارد فەرەنساو بریتانیاو کەنەداو

---

(۱۹) سێنەتۆر ئالان کرانستۆن، لە دیمۆکراتی کالیفۆرنیا، تازە لە نەشتەرگەرییەکی کە بۆی کرابوو چاک دەبووەوە، بۆیێ دەنگی نەدا. ئەگەر بیتانیبا دەنگ بدا، دەنگی ویش لە دژی شەڕ بوو؛ بەمەش پەراوێزەکەی بۆ تەنیا چوار دەنگ کەم دەکردەوە.

میسرو عارەبستانی سعودی و میرنشینە یەکگرتووەکانی عارەبی و عومان و بەنگلادیش و سوریا بوون. هێزی ئاسمانی فرەنسی و بریتانی و سعودی و ئەسپانی پەلاماری نیشانە سەربازییەکانی ئێراقیان دا له ئەنجامی ئەو هاوپەیمانییە راستەقینەی کە دروست بوو، سەرۆک بوش لە ئەنجامی شەرەکەی ئێراقێ، ناودەنگێکی زۆری پەیدا کردو له ئەنجامدا توانی ناوبژیوانییەکی کاریگەری نێوان ئیسرائیل و عارەب بکاو توانیشی، بە پێی پرۆسەیەکی ئاشتییانە، لە ۱۹۹۱، شیرازەی یەکێتی سۆڤییەت لەباریەک هەڵبوەشێنێتەوە. وەک ئەوەش کە بەدیارکەوت، شەڕەکە هیچ بارگرانییەکی دارایی لەسەر وڵاتە یەکگرتووەکان نەبوو. لەکاتێکدا کە زۆربەی بەرپرسانی هەردوو بەڕێوەبەرایەتییەکان یەک بوون، بەڵام ئەو ڕێگەیەی کە سەرۆک جۆرج هـ.و. بوش بۆ پەلامارداني ئێراقێ لە ۱۹۹۱ پێیدا چوو، بەتەواوەتی لەو ڕێگەیە دوور بوو کە سەرۆک جۆرج و. بوش لە ۲۰۰۳ گرتییە بەر تا شەڕ لە دژی ئێراقیدا بکا.

شەڕی یەکەمی کەنداو شەش حەفتەی خایاند. هێزی ئاسمانی هاوپەیمانان لە ماوەی چەند ڕۆژی سەرەتای شەڕەکەدا هێزی بەرگری ئاسمانی ئێراقیان تەفروتۆنا کرد. بە دوو ڕۆژ، بۆمبا هاوێژو مووشەکە کرووزەکان دەزگاکانی چەکە کۆمەڵکوژە زانراوەکانی ئێراقیان لە دوو ڕۆژدا خاپوور کرد (بەڵام نەیانتوانی بگەنە ئەو پرۆگرامە ناووکییە نهێنییەی کە لە سەر بنچینەی جوداکردنەوەی یورانیەم بە ڕێگەی کیمیایی دروست ببوو)، تۆڕی کارەبایان هەڵوەشاندەوەو پەیوەندییەکانیان پچڕاند. بۆمبە تاکتیکییەکان تانکەکانی ئێراقییان تێکشکاندن و گورزی باشیان لە سوپاکەی وەشاند زۆربەی ئەوانەی لە سەنگەرەکان لە کوێت مابوونەوە یان سەربازە شیعەکان یانیش سەربازی کورد بوون لە وەڵامدا، ئێراق پەلامارێکی کورتی عارەبستانی سعودییەی دا و چەند مووشەکێکی سکەدیشی ئاراستەی هێزی هاوپەیمانان لە عارەبستانی سعودییەو هەندێکیشی ئاراستەی شارەکانی ئیسرائیلی کرد.

تێکنۆلۆژیای ئەمێریکی ئێراقییەکانی داپۆشی و سەرنجی بینەرانی لە هەموو دونیا بۆخۆی ڕاکێشا. بە درێژایی ڕۆژ سی ئێن ئێن CNN ڤیدیۆی ئەو تەقەمەنییانەی نیشان دەدا کە بە لێیزەر دەچوون و نیشانەکانی ئێراقیان

دەتەقاندەوەو بەغدایشی نیشان دەدا چۆن تەقینەوەکانی شەو دەیانهەژاندەوە. مووشەکی دژە مووشەکی جۆری پێتریۆت ڕۆڵێکی باڵای لە شەڕەکەدا هەبوو. هەرکە فیتەکانی وشیارکردنەوە شالووریان دەدا؛ نیشانەی ئەوەی کە مووشەکێکی سکەد بوو دەهات، تۆڕەکانی تێلیڤزیۆن بە زیندی ئەو پاتریۆتانەیان دەگواستەوە کە لە ئیسرائیل و لە عارەبستانی سعودییە ئاگر دەدران و بە ئاسمان هەڵدەگەڕان و پاشان کە ڕێیان لە مووشەکە ئێرافییەکان دەگرت و دەتەقینەوەو دونیایان دەکردە ڕۆژ. (یان هەر وا پێدەچوو. لە دوای کۆتایی هاتنی شەڕەکە ئاشکرا کرا کە پێتریۆتەکان ڕێیان لە تاقە یەک مووشەکی ئێراقیش پێ نەگیرا.)

لە ١٥ی شوبات و لە کاتێکدا کە دەچووە کارخانەی ڕایتیۆن لە ئاندۆڤەری ماساچوستس، کە مووشەکی پێتریۆت دروست دەکا، سەرۆک بوش ستایشی مووشەکەکەی کرد. لە کارخانەکەش، سەرۆک بوش سوپاسی کرێکارەکانی کردو جەختی لەسەر هاوپەیمانێتی کردەوەو پاشان گوتی:

ڕێگەی تریش هەیە بۆ ئەوەی چیتر خوێن نەڕژێ، ئەویش بەدەستی سوپاو گەلی ئێراقە بۆ ئەوەی کاروباری خۆیان بگرنە دەستەوەو سەددام حوسێنی دکتاتۆر ناچار بکەن وازبێنێ و پاشان ملکەچی بڕیارەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان ببێ و دووبارە بێتەوە نێو خانەوادەی نەتەوەکانی ئاشتی خواز.

کۆشکی سپیش لە واشنتن هەمان قسەکەی سەرۆک بوشی دووبارە کردەوەو هەوڵی دا زۆرترین خەڵک گوێی لێ بێ. تۆڕە سەرەکییەکانی تێلیڤزیۆن خواستەکەیان پەخش کرد، سی ئێن ئێن دەزگای بڵاوکردنەوەی بریتانی BCC بە هەموو دونیایاندا پەخش کردو میدیای عارەبیش کەمتەرخەمی لێ نەکرد.

لەو یادداشتەی کە بە هاوبەشی لەگەڵ برێنت سکۆکرۆفتی ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی پێکەوە نووسیویانەتەوە، جۆرج هـ.و. بوش ڕاڤەی دەکا کە ئەو خۆی "سەرشێتانە" داوای لە گەلی ئێراقی کرد سەددام حوسێن لە سەر حوکم لادەن. سکۆکرۆفت لە پارەگرافی پاشتردا دەنووسێ(٢٠):

(٢٠) هەرچەندە یادداشتەکە هاوبەشە، بەڵام هەر یەکێک لەو دوو پیاوانە بەشە تایبەتییەکانی خۆیان نووسییەوەو ڕێکی خست.

به بۆچوونی من، ئەم سەرشێتییە بێ ئەندازەیە بوو کە بە شێوەیێکی ناڕەوا، بووە هۆی تۆمەتبار کردنی سەرۆک بوش بەوەی کە هانی گەلی ئێراقی دابێ تا لە دژی سەددام راپەڕن و پاشان کە راپەڕین نەیتوانی بە هاواریانەوە بێ. راستە ئێمە ئومێدمان دەخواست کە سەددام بڕووخێ. بەڵام هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبووین یەکێک لەدەرەوەی بازنەی سەربازیدا هەبێ کە بتوانێ ئەو ئیشە بکاو هەرگیز هەوڵیشمان نەدا دانیشتوانی رەمەکی بۆ ئەم کارە هان بدەین. ئەمە وامان لێدەکا خەیاڵی ئەوە بکەین کە قسەیێکی ڕووتینی لە واشنتن کرا ڕقی ئێراقییەکان گرداو هانی شیعەو کوردەکانی دا تا بە ئیشەکانی خۆیان هەستن.

ڕەنگە گوتارەکەی رایتیۆن ڕووتین بووبێ، بەڵام خۆ جۆرج بوش سیاسییەکی ڕووتینی واشنتن نەبوو. ئەو سەرۆکی وڵاتە یەککرتووەکان بوو، کە لەو کاتدا سەرکردایەتی هاوپەیمانییەکی نێودەوڵەتی دەکرد کە هەینێ لەگەڵ ئێراقێ لە شەڕدا بوو. حکومەتی وڵاتە یەککرتووەکان لەو رادیۆی دەنگی ئەمێریکا کە ڕادیۆیێکی میریی خۆیەتی، خواستەکەی خۆی بۆ دەرکردنی سەددامی دوویات کردەوە و ڕادیۆیێکی قاچاغی دەزگای هەواڵگری ناوەندیش CIA کە ئاراستەی ئێراقێ دەکرا هەمان بانگەوازی پەخش کرد. کوردو شیعە ئێراقییەکان وایانزانی سەرۆک قسەکەی بەڕاستی کرد. کە پاشتریش دەرئەنجامی زاندرا چۆن بوو؛ تێدەگەین کە بوش و سکۆکرۆفت، هەردووکیان ویستیان بەرپرسێتی خۆیان لەو دەرئەنجامەدا، تا ئەوپەڕ، کەم بکەنەوە.

لە ٢٤ی شوباتیش هێزی زەمینی هاوپەیمانان هێرشیان دەست پێ کرد. ئێراقییەکان پێشبینییان دەکرد کە هێرشێکی زەمیندەریایی لە کوێتەوەڕا بۆ سەریان بێ. لە بری ئەوەدا، هێزەکانی وڵاتە یەککرتووەکان لە عارەبستانی سعودییەوەڕا دەربازی ناو باشووری ئێراقێ و خۆرئاوای کوێتێ بوون و کەوانەیێکی بەرینیان پێکهێنا. هێزەکانی ئێراقێ لە کوێت پاشەکشەیان کردو بەرەو باکوور بۆ بەسرە هاتنەوە. کەمێک بەر لە لووتکەی هەورازێکی درێژ، هێلیکۆپتەرو تانکە ئەمێریکییەکان ڕێیان لە کاروانێکی لەشکری ئێراقێ گرت کە بە خۆو بە تاڵانیانەوە بۆ ماڵ ڕایان دەکرد و هەر هەموویانیان کوشتن. ئەو ڕۆژنامەنووسانەی دیمەنەکەیان

بینی باسی قەسابخانەیێکیان گێڕاوە و یەکسەر ناوی ڕێیەکە کرا "شاڕێی مردن The Highway of Death.

فڕۆکەوانێکی ئەمریکی لە کاتێکی خراپ و لە پێش ڕۆژنامەنووسان ناوی لە هێرشەکە نا "ڕاوە قەلTurkey Shoot " ئەمەش ئاژاوەیێکی ناوەو سەرۆک بوش دوای سەد سعات بڕیاری ڕاگرتنی شەڕی زەمینی دا. وا پێدەچێ ئەو کات دیار خستنە بە شێوەیێکی سەرەکی لەبەر بەهای پەیوەندییەکانی کۆمەلایەتی بوو. لە ئەنجامی ئەو شەڕ ڕاگرتنەدا، هەندێ لە یەکە سەربازییەکانی گاردی کۆماری بێ ئەوەی هیچ زیانێکیان لێ بکەوێ لە شەڕەکە دەرباز بوون و دەرچوون. سێ حەفتە پاشتر، چوومە دیدەنی ئەو شاڕێیە. ئوتومبێلەکانی پێشەوە هیچیان نەمابوون، بەڵام ئەوانەی کە لەدواوەتر بوون هەندێکیان هەر هیچیان لێنەهاتبوو. زۆر لە قەمەرەکان هی سیڤیل بوون، وا پێدەچوو لە تالانی کوێتێ بن. من هیچ هەستم بە ئەنجامدانی قەسابخانەیەک نەکردو وا پێدەچوو زۆربەی ئەوانەی کە لەگەڵ کاروانەکەدا بوون بۆ بیابان ڕایان کردبێ.

لە ٢٧ی شوبات، لە ژووری دانیشتنی کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی سێنەت، لە بابەتی کورد، سێنەتۆر پێڵ و خۆم سەرۆکایەتی ڕاوێژکارییەکی ناو پارلەمانمان کرد. گوتاربێژەکان ئەمانە بوون: تاڵەبانی؛ هوشیار زێباری، گوتەبێژی کاروباری دەرەوەی پارتی دیمۆکراتی کوردستان؛ سامی عبدالرحمن، پیاوێکی ئەرێتۆکراتی دەنگ نزم و سەرۆکی پارتی گەلی دیمۆکراتی؛ کەندال نەزان، سەرۆکی ئینستیتیۆی کورد لە پاریس؛ ژمارەیەک لە ئەندامانی پارلەمانەکانی ئەوروپا؛ دانیال میتران، خانمی سەرۆکی فرەنساو دیارترین پشتیوانی کێشەی کورد لە هەموو جیهاندا. لە خوانێکی تایبەتی لەگەڵ سێنەتۆرانی کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوە، سەرکردە کوردەکان جەختیان کردەوە کە هاوسۆزییەکی زۆری ئەمیریکا لە کوردستان هەیەو باسی ئەگەری ڕاپەڕینیشیان کرد. هەمان ڕۆژ، لە ئێوارە خوانێک کە لە واشنتن کۆرت هۆتێل بۆ ئامادەبووان سازدرابوو، تەلیڤزیۆنێکمان لە نزیکی سەکۆیێک دانابوو، چاوەڕێمان دەکرد سەرۆک بوش کۆتایی شەڕەکە ڕابگەیەنێ. جەلال تاڵەبانی پێی گوتم ڕەنگە ڕاپەڕین دەس پێ بکاو ئەویش دەیەویست بۆ کوردستان بگەڕێتەوە.

ئەمــە هــەواڵێکی دڵخــۆشکەر بوو، دەبوو بەڕێوەبەرایەتی گــوێی لێ ڕابگرێ. تێلیفۆنێکی ڕیچەرد هاسم کرد کە بەڕێوەبەری ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بۆ ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و هاوپۆلێکی سـەردەمی ئۆکسفـۆردم بوو. نەمـتوانـی بیگرم، بەڵام لە ١ی ئادار قسـەم لـەگـەڵ سـاندی چارلزی بریکارەکـەی کرد. ئەو خانمەش بە توورەییەوە تۆمەتباری کردم کە دەست لە کاروبارێک وەردەدەم کە هی من نییە. بە حەپەساوییەوە لێم پرسی: "ئای ئێمە نامانەوێ ئەو ڕژێمە لەناو بچێ؟" ساندی بە ترشـی وەڵامی دامـەوە: "سـیـاسـەتـی ئێـمـە ئەوەیە کـە سـەددام لەنـاو ببـەین نەک ڕژێمەکەی.

بۆشم نەکـرا تاڵەبانی بۆ ژوورێ ببـەم تـا چاوی بە بیـورۆی ڕۆژهەڵاتی ناڤین لە وەزارەتی دەرەوە بکەوێ. ڕیچـەرد شـفـتـەری یاریدەدەری مافەکانی مـرۆڤ لە پەنای پەردەوەڕا کاری لەگەڵدا کردم بۆ ئەوەی لە ١٩٨٨ سزاکان بەسەر ئێراقیدا بسەپێنن. (شیفتـەر ڕشتی لێ کردم داوا لە سێنەتۆر پێڵ بکەم ئەو یاسایەی مـافەکانـی مرۆڤی وڵاتە یەککگرتووەکـان بە گەڕ بخـا کە یارمـەتیدانی ئەو وڵاتانە قەدەغە دەکا کە بە پێی پلانێکی داڕێژراو مـافـەکـانـی مـرۆڤ پێشـێل دەکـەن.) کە شـیـفتـەر زانـی ئەو لایەنە چۆلاییەکی فرەتری لە بیورۆی هـەرێمایەتی، بۆ دیداری قوربانییانی مافەکانی مرۆڤ بۆ ڕێکدەخـا، قـایل بـوو تاڵەبانی بدینێ. لەگـەڵ ئەمـەشدا، کـە کـوردەکـان گـەیشـتنە وەزارەتی دەرەوە، کەسێک لە تەلاری وەزارەتەکە بردیانییە دەرەوەو لە قاوەخانەیێکی ئەوبەری شەقام داینیشاندن. لە بری دیداری شیفتەر، دوو کارمەندی یاریدەدەری پلە نزم قاوەیان لەگەڵدا خواردنەوە. چەند مـانگێک پاشتر، شیفـتەر دەستی لە کارکردن لە بەڕێوەبەرایەتی بوش کشاندەوە. بەشداری لە هەڵمەتی هەڵبژاردنی بیل کلنتنی لە ١٩٩٢دا کرد.

لە ١ی ئادار بوو تاڵەبانی لێـی پرسیـار کردم ئایا مـانەوەی لە واشنتن هیچ سوودی بۆی دەبێ؛ تورگـۆت ئۆزالی سـەرۆکی تورکـیـا بانگێشـتی تورکـیای کـردبوو. چونکە پشـتـبـوونـی تورکـیـا هۆی سـەرەکی بوو لەوەی کـە واشنتن ئاوا بـە سـاردی وەری گرتەوە، بۆیێ پێم گوت کە پێویسـتـە بچێ. بەر لە سـەفـەرەکەی بانگێشتی کردم لە کوردستان سەردانی بکەم.

لە ٢ی ئادارو لە گـۆڕەپانی سـەعـد لە بەسـرە، ڕانەندەی تانکێک لوولەی تۆپەکـەی

ســووڕاندەوەو لە وێنەیێکی دوو نهــۆم بڵندی ســەددامــی ئاگــردا. ئەو گــوللە تۆپە چەخماخەی یاخیبوونێکی دا کە لە بەسرەوەڕا بەرەو باکوور هەڵکشاو هەردووک دۆڵی ڕووبارەکانی دەجلەو فراتی گرتەوەو هەتا گەڕەکە نزیکەکانی بەغدایش هات.

لە ناسریە، جەماوەر ئەندامانی حیزبی بەعسییان لێکهەڵزڕاندن. دەزگاکانی حکومەت و بارەگاکانی حیزبی بەعس و ڕێکخراوە سەربازییەکان تالان کران و پاشان سووتێندران. بە بۆچوونی من ئەو زێدە تووڕەییەی شیعەکان لە ڕووداوێکەوە هات کە چەند حەفتەیێک بەر لە ئێستا خۆم بینیم.

لە سـەر سنووری ئێــراق ــــکوێت، لە کــامـپـێکی پەناهەندان بووم کـاتێک کـە دکتۆرێکی سەربازی وڵاتە یەکگرتووەکان بە هەمڤییێک هاتە ناو کامپەکە. گوتی کـاتێک کە چوار منداڵ لەناو سنووری ئێراقیدا تەماتەیان دەڕنی پێیـان لە گــوڵە تۆپێکی نەتەقیوەی ئەمێریکیدا نا. گوللە تۆپەکە تەقییەوە. پرسی ئایا هیچ دکتۆرێک لەناو پەناهەندەکاندا هەیە. لە ناو کامپەکە بانگی ئەو تاکە کەسەم کە شارەزای پیشەکە بوو، ئەویش قوتابییەکی کۆلێژی پزیشکی کوێتی بوو، لەگەڵ خۆمدا بۆ ئێـراقـێم برد. سێ لە منداڵەکـان بۆ نەخـۆشـخـانەیێکی مــەیدانی ئەمێـریکی گواسـترابوونەوە. پزیشکەکە ڕووناکی لایتێکی بچووکی ئاراستـەی ناو چاوی منداڵەکە کرد. هیچ وەڵامێکی نەبوو.

تەماشـام دەکرد کاتێ کە دایکی منداڵەکە هاتە سەر ڕێمان، ئاگـای لێ نەبوو چ قـەومـابوو. پاشـان تەرمی کـوڕەکـەی خـۆی بینی، ئەژنۆکـانی لەرزین. پڕی دا قـژو جلوبەرگی خۆی و یەکەم قسەی کە کردی گوتی: سەددام ئەمەشی کرد.

دوای دە ڕۆژ لە دەسپێکی ڕاپەڕین، سـەددام بایی ئەوە دەستی هاتەوە بەرەخۆی کە بتـوانێ چەند یەکەیێکی گاردی کۆماری بۆ باشوور ببا. گـاردی کۆماری وەک هەمـــوو لەشکری ئێــراقێ نەبوو، ئەمـــانە زۆربەیان عـــارەبی ســـوننە بوون و ئەفسەرەکانیشیان بە زۆری کوڕگەلی هۆزی سەددام و تکریتی بوون. گاردی کۆماری دوا هێـڵی بەرگری ڕژێم بوو، سـەددامیش بە نیـازەوە لە دووری شـەڕی ناو کـوێتی ڕاگرتبوون و نە هیچ گورزێکیان وەبەرکەوتبوو و نە لە ئەنجامی بەزینی سـەربازی ورەیان ڕمابوو.

له ناوەڕاستی ئاداری، سوپای ئەمێریکا هێشتا باشووری ئێراقیی هەر داگیر کردبوو، سەنگەرەکانی له نزیکی شارەکانی دۆڵی ڕووباری فرات هەر مابوو. ئەو هێرشەی ئێراق کردیه سەر شیعه یاخییەکان، بەقسه، بەندەکانی ئەو ئاگربەستەی بەزاند کە شەڕی کەنداوی ڕاگرت. فەرماندەی مەیدانی هێزەکانی ئەمێریکا ژەنراڵ نۆرمەن شوارتزکۆمپف بەندەکانی نووسیبووەوەو ئێراق له ٣ی ئادار پێیان قایل ببوو. لەشکرەکەی ئەمێریکا له ئێراق، دەیتوانی گاردی کۆماری ڕابگرێ و ژیانی دەیان هەزار کەسیش له مردن ڕزگار بکا. بەڵام فەرمانی توندیان پێ درابوو کە خۆیان تێکەڵ نەکەن.

تۆڵەکردنەوەکەی سەددام خێراو کوشندە بوو. تانکەکانی گاردی کۆماری سەنتەری شارە کۆنەکانی تەقاندەوە. مەزارەکانی شیعەکان بوونە مەیدانی شەڕو کوشتارو پاشان کرانە قەسابخانەو یاخی و مەلاو سیڤیله بەستەزمانەکانی تێدا سەربڕان. گاردی کۆماری قەنارەیان بە لوولەی تانکەکانیاوە هەڵواسی و هەر جارەی چەند پیاوێکی شیعەیان پێوە دەبەستانەوە ئینجا لوولەکانیان بەرز دەکردەوەو بەمجۆرە له سێدارەیان دەدان. ئەو هەموو ڕووداوانە ڕوویان دەداو لەشکرەکەی ئەمێریکا هەر تەماشای دەکرد، زۆر له سەربازەکان له تووڕەییان کەفیان دەکرد؛ چونکە ڕێگەیان پێ نەدەدرا ئەو هەموو کوشتارە بوەستێنن. یەکێک لەو سەربازانەی ئەو هەموو خوێنڕشتنەیان بە چاوی خۆیان بینی، پاتریک لۆوی بوو. چەند ساڵ پاشتر، پاتریک گوێی لێم ببوو له ڕادیۆ قسەم کردو ئەویش ئەو ئیمەیڵەی بۆ ناردم، تێیدا بۆم باس دەکا چی بەچاوی خۆی دیت:

(لەگەڵ فرقەی زرێپۆشی یەکەم بە دەورییەی دەرچووبووم. ئەرکی من دەبوو قەبرو دیلەکانی شەڕی دوژمن بۆ فەسیلەکەی خۆم تۆمار بکەم. له دوای کۆتاییهاتنی شەڕی زەمینە، واجبم له نزیکی ٢ مایڵ له دەرەوەی شاری بەسرەو له سەر ئەو شاڕێیەی بوو کە بۆ بەغدا دەچوو. تەماشام دەکرد کە هێلیۆکۆپتەرە سەمتییە ئێراقییەکان بەرەو شارەکە چوون و هەرچی کەوتە سەر ڕێیان هەموویان گوللەباران کرد. چاودێریم دەکرد کە لەشکریش چووە ناو شارەکەو دەتوانم پێت بڵێم له ناو بەسرە چ ڕوویدا.

من ئەو تاکە کەسە بووم کە دەبوو ئەو سیڤیلانە ناونووس بکەم کە لە شارەکە هەڵدەهاتن. هاواریان دەهێنە بەرم بۆ ئەوەی شتێک بکەم، هەرچی پێم دەکرێ بیکەم بۆ ئەوەی ئەو قەسابخانە بەکۆمەڵکوژە بوەستێنم. گوێم لە باسی ئەو ژن و منداڵانە گرت کە چۆن لە ماڵەکانی خۆیان بە زیندوێتی سووتێندران. چەندین ژن هەتا مردن وازیان لێ نەهێندراو بەردەوام دەستدرێژی کرا سەر ئابڕوویان و پیاوەکانیش بە زیندیتی کەرت کران. سیڤیلەکان کرانە نیشان و مەشقی گوللە هاوێشتنیان لەسەر کراو بە کۆمەڵ هەڵواسران. دەنگیان تا ئێستاش لە گوێم دەزرینگێتەوەو شەوم لێ تاڵ دەکا. تا ئێستاش ئەوەم بە تایبەتی هەر لە بیرە، سێ ڕۆژ بوو هاوارم دەبردە بەر سەرووی خۆم تا ڕێگەم پێ بدا شتێک دەربارەی ئەو ڕووداوانە بکەم. فەرماندەی فەسیلەکەم فڕێ و هاتە شوێنەکەی من و ڕووبەڕووی یەکتر ڕاوەستاین. فەرمانی پێ دام هیچ نەکەم ئەگەر فەرمانی بەپەلەم بۆ نەیێ. لە ماوەی ١٢ ساڵی سەربازیم بۆ یەکەمجار فەرمانێکی ئاوا توندم جێبەجێ نەکرد. گەیشتمە ئەو ئاستەی کە دەورییەیێکم ڕەوانی نزیکی مەیدانەکانی کوشتارەکە کرد بۆ ئەوەی وا بکەم کە سەربازانی ئێراقێ تەقەیان لێ بکەن و منیش بیانووێکم بۆ دروست دەبێ تا پەلاماریان بدەم و ئەو سیڤیلە بێ تاوانانە بپارێزم. تەقەیان لە دەورییەکەمان نەکردو ئێمەش بەناچاری دانیشتینەوەو هەر سەیرمان کردن. لەبەر ئەم هەڵوێستەی وەڵاتەکەم، من هەرگیز هێندەی ئەو وەختە خۆم بە شەرمەزار نەزانیوە.

تا ئیمڕۆش، ئەوکاتەی لە سەر شارێی نێوان بەغداو بەسرەم بەسەر بردووە بێزارم دەکا. نەدەبوو ئاوا لەوێ هەر دانیشم و چاودێر بم. پێویست بوو بەرگریم لێیان بکردبا. دەبوو شتێک هەر بکەم، هەر شتێکم بکردایە بۆ ئەوەی ئەو گەرماوەی خوێنە بوەستێنم. سوێندی پاراستن دراوین، بەڵام هەر دانیشتین، من هەر دانیشتم و چاودێری سەدان هەزار کەسم بە ترسناکترین شێوەی لواو دەمردن).

هەر لە ئادارەوەڕا تا سێپتێمبەری ١٩٩١، سوپای ئێراقێ ٣٠٠,٠٠٠ شیعەی کوشت. قسە وایە کە تەنیا یەک لە گۆڕە بەکۆمەڵەکانی نزیکی شاری حیللە ٣٠,٠٠٠ تەرمی تێدا بووە.

لە کاتێکدا ڕەنگە بانگەوازەکەی جۆرج هـ.و. بوشی بۆ سەرهەڵدان، زمانخزی

بووبێ، بەڵام خۆ شیعەکان بەم شێوەیە سەیری ناکەن. باوەڕیان وایە بوش هانی دان بۆ ئەوەی ڕاپەڕن و بە نیازەوە ڕێگەی سەددام حوسێنی دا سەرکوتیان بکا، چونکە بوش ویستی شیعەکان بکوژرێن.

ڕاپەڕینی کوردان لە شێوەی سەرهەڵدانی شیعەکان دەستی پێ کرد، بەڵام بە شێوەیێکی تەواو جیاواز لە هی وان کۆتایی پێ هات. لە ٦ی ئاداری ١٩٩١، ئاپۆرەی دانیشتوانی ڕانیە پەلاماری بارەگاکانی حیزبی بەعسیان لە شارەکەیان دا. ڕانیە کەوتۆتە بناری شاخەکانی کوردستانی ڕۆژهەڵات.

تا ی١٤ ئادارێ، یاخییەکان زۆربەی خاکی کوردستانیان کۆنترۆڵ کردو لە ٢١ی ئاداریش کەرکووکیشیان گرت، کە هەندێک پێی دەڵێن قودسی کوردستان.

کوردەکانیش لە شێوەی شیعەکانی باشوور سفتوسۆی دڵی خۆیانیان بە ڕژێم داخست. کە یاخییەکان بارەگای بەڕێوەبەرایەتی ئەمنی سلێمانییان گرت نمایندەکانی ئەمنییان لە کاتێکدا گرت کە خەریک بوون ئەو زیندانییانەیان ئیعدام دەکرد کە لەلایان مابوون. لە بری زیندانییەکان، نمایندەکان گوللەباران کران. پیرێژنێک کوتایە سەر یەک لە تەرمەکان و دایە بەر گەزەو شەق و پێلەقە. کە خەڵکەکە ویستیان لێی دوو بکەوێننەوە، پیرێژن گێڕایەوە: "ئەوە سێ کوڕی کوشتم. ئایا من مافی ئەوەم نییە کە ئاوای لێ بکەم؟"

ناچار لە ٣٠ ئادار، بانگێشتەکەی تاڵەبانیم قەبووڵ کرد کە پێش مانگێک کردبوومی. قوتابییەکی کۆلێژی نوژداری لە دیمەشقەوە تا قامشلی بەگەڵم کەوت. قامشلی شارێکی تۆزاوییەو لە سێگۆشەی سنووری نێوان سوریاو ئێراق و تورکیاوە نزیکە. لەوێش کەمال کەرکووکی کە سەرکردەیێکی پێشمەرگەیە، لەگەڵ کاربەدەستانی سوریا بۆی ڕێکخستم تا بۆ ناو ئەو شوێنانەی ئێراقێ دەربازببم کە لەبەر دەستی کوردان دابوو. ئەویش عبدالکریم ناوێکی بۆ دەستنیشان کردم کە ئەندازیارێک بوو تا هاوڕێم بێ و ڕانەندەییشم بۆ بکا کەریم سەلماندی کە پیاوێکی ڕاست و هەموو شتە ڕاستەقینەکانیشی پێ بوو.

لە کەناری لای سوریای ڕووباری دەجلەوەڕا بە چاوی خۆم بینیم و فیلمیشم گرت، کاتێ کە تۆپەکانی سوپای ئێراقێ لە نزیک سەنگەرەکانی پێشمەرگەی کەناری

ڕووبارەکەی لای ئێراقیّ دەتەقینەوە. هەندێ هۆکار هەنە کە ڕێم نادەن لەوە پتر بەم بابەتەدا بچم، من هیچ ترسم لەوە نەبوو ئەگەر بکوژرێم. بەڵام ترسم لەوەدا هەبوو کە لەبەر ئەو تۆپبارانە، نەتوانم بگەڕێمەوە بۆ سوریاو ئامادەی ئەو کۆبوونەوانە ببم کە بۆ چەند ڕۆژێک دواتر ڕێکخرابوون. ڕەنگ بوو ئامادەنەبوونم ببێتە هۆی ئەوەی کارەکەمم لە ئێراقیّ لەدەست بدەم. هەرچەندە کە ئێدوەرد جۆرجیانی باڵیۆزی وڵاتە یەکگرتووەکان بۆ سوریا، دەیزانی چوونە قامشلیم بۆ بەسەربردنی جەژنی ئیستەر هیچ پەیوەندییەکی بە ڕێی سەفەرەکەی منەوە نەبوو، بەڵام من ماوەیێک بوو بەنیازەوە باڵیۆزخانەی وڵاتە یەکگرتووەکان لە دیمەشق و سەرەکانی خۆمم لە کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوە دەستخەڵەت دەدا سەبارەت بە ئەو ڕێیەی کە سەفەری پێدا دەکەم و دەمگوت باکووری ئێراقیّ لە سەر ڕێی سەفەرەکەم دایە. کەریم دڵنیایی کردم کە هیچ ترسێکم نەبێ، چونکە پێشمەرگە خەریک بوون ئەو شەو هێرشێک بکەنە سەر مۆڵگەکانی ئێراقیّ و لەو هەندەرانەیان نەهێڵن.

سواری بەلەمێکی بچووک بووین کە مەکینەکەی لەدەرەوەڕا لێی قەیم کرابوو. پاشان سواری ئەو تۆیۆتا لاندکروزە بووین کە لە سوپای ئێراقیّ گیرابوو و چاوەڕێی ئێمەی دەکرد. دوو جێ کونی گوللەی بە جامی پێشەوەی ئۆتۆمۆبیلەکەوە بوو، بەڵام من نەمپرسی لەچییەوە پەیدا ببوون. لە شوێنێک قیر نەمابوو، ڕێگایەکە هەڵکۆڵدرابوو. کەریم و ڕانەندەکە بارەکەیان لە نێوان خۆیاندا تاووتوێ کرد، تا کامە ڕێگا بگرن و پاشان بە وشیارییەوە وەشوێن تایەی ترۆمبێلی پێش خۆیان کەوتن و لە دووری سەد یاردێک قیرەکە هاتەوە. کە گەیشتینەوە سەر شەقامەکە ئینجا زانیم کە بە یەک لە کێڵگەکانی مینی ئێراقیدا ڕەت ببووین. یەکەم ڕاوەستانمان لە زاخۆ بوو، کە شارێکی ١٠٠,٠٠٠ کەسییە وە لە سەر ڕیبارا خابیرییە. لە سەنتەری شارەکە، سیاسەتڤانان گوتاری هاوسۆزییان بۆ دانیشتوانەکە دەخوێندەوەو پۆستەری سیاسیش لە هەموو شوێنێک هەڵواسرا بوو. وێنەیێکم لە پێش یەک لەو پۆستەرانە گرت کە بە ئینگلیسی لەسەری نووسرابوو— "ئێمە کوردستانمان لە دوژمنان پاک کردەوە." — پاشان چووینە دهۆک، ئەویش شارێکی ٢٠٠,٠٠٠ کەسییەو پەنجا مایلێک پتر بۆ باشوور چووە.

ترومبێلەکانی ئێمە تاک بوون کە بەرەوە باشوور دەچوون. هەموو ئۆتۆمۆبیلەکانی تر بەرەو باکوور دەبوونەوەو نەک هەر تەنیا پڕیان نەفەر بوو، بەڵکو هەموویان کەرستەی ناوماڵیان لە سەر سێپایەکانیشیانەوە لێ بارکرابوو. ئەمەش هێمایێکی باش نەبوو.

کە گەیشتینە دهۆک، شەو لە ئامێزی گرتبوو. گوێم بۆ گرمەی تۆپی ئێراقیێ شل کردو بریسک و باسکی تەقینەوەکانیش قورسی ئاسمانیان ڕووناک دەکردەوە. لە نزیکی شاری بە ناو شاخێکدا ڕەت دەبووین، کە لەنەکاو ئاسمان سپی داگەڕاو دووکەڵ بڵند بوو. چەند چرکەیەک بەر لە گەیشتنمان، تۆپێکی فسفۆری لەسەر ڕێگاکەمان تەقیبەوە. کەریم خێرا خۆی لادا نەکا ڕووناکی و دووکەڵەکەی بەرکەوێ.

لە تەلاری شارەوانی جەلال تاڵەبانیم بینی ڕۆڵی یاساو مافەکانی کەمینەی بۆ نزیکەی حەفتا کەس لە سەرکردەکانی شارەکە تاووتوێ دەکرد. مامۆستایێک لێی پرسی کە چ جۆرە هەڵسوکەوتێک لەگەڵ ئەو کەسانەدا دەکرێ کە هاوکاری ڕژێمی سەددامیان کردووەو ئومێدی خواست بە سزای توندی خۆیان بگەن. تاڵەبانی جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە دەبێ دادگایێکی یاسایی بکرێن. ئاشوورییەکیش پرسیاری دەربارەی مافە ئایینییەکان کرد. تاڵەبانی گوتی یەکێک لە بنەما سەرەکییەکانی پرۆگرامی بەرەی کوردستانی پاراستنی کەمینە ئایینییەکان بوو. ئەو بینەوبەردەیە لە هەموو شتێک پتر کۆبوونەوەی شاری ڤێرمۆنتی وەبیرهێنامەوەو خۆم لە بیرکرد کە لەو ئێراقە بووم کە پێشتر دەمناسی ـــ کە ئامادەبووان هێدی هێدی پتر پشکداری قسەکان بوون، گومانم نەبوو کە ئەمە یەکەمجاریان بوو بتوانن ئاوا مشتومڕ لەگەڵ سەرکردەیێکیان بکەن ـــ هێندە چووبوونە نێو بابەتەکەوە، هیچ ئاگایان لە گرموهۆڕی تۆپان نەبوو، دەتگوت تەنیا منم گوێم لە گرمەی تۆپخانەی ئێراقیێ دەبوو.

تاڵەبانی لێی خواستم دا قسە بکەم. ڕەنگە تۆزێک ئومێدەوار بووبم بۆیێ ئەو پەیمانەی ودرۆ ولسنم وەبیر هاتەوە کە بە کوردانی دابوو دەوڵەتی خۆیانیان بۆ پێکبێنێ. ئای چەند شادمان بووم کە زانیم من یەکەم کارمەندی ئەمێریکیم لەسەر ئەو خاکەدا قسە دەکەم کە کوردەکان بەخۆیان حوکمی دەکەن. کە قسەم کرد ئاگام

لەوە هەبوو کە هیچ پەیمانێکی بتەوم لەکن نەبوو تا بەو گەلە بدەم کە دیار بوو لە بارودۆخێکی ناهەموار دابوون، بەڵام دیاربوو کە تێبینییەکانی منیان بەهەند هەڵگرت.

لە دوای کۆبوونەوەکە، بۆ تێشت خارن، چووینە ماڵی لزگین هەمزانی، کە پێشتر سەرۆک جاش[٢١] بوو، بەڵام پشتیوانی سەرهەڵدانی کردبوو.

ئەوانەی لەوێ هاتنە لامان: سامی عبدالرحمان، چەند ساڵ بوو ئەمە یەکەمین جاری بوو دەهاتەوە دهۆکێ؛ یعقوب یوسف، سەرکردەیێکی ئاشووری بوو؛ ئەحمەد بارمانی Barmani[٢٢]، سەرکردەیێکی سیاسی کوردە،

لە بنەڕەتا خەڵکی شاری بارمانە کە لەو نزیکانەیە؛ هێرۆ تاڵەبانی، خێزانی جەلالییە و تاکە ژنێک بوو کە لەوێ بوو. هێرۆ کورە گەنجەکانی لە لەندەن لە کن خزمان بەجێ هێشتبوو و چەند ساڵ بوو لەو دۆڵە دوورەدەستانەی کوردستان ژیانی سەختی پێشمەرگایەتی بەسەر دەبرد و بە نووسین و بە وێنە فۆتۆگرافییەکانی تاوانەکانی ئێراقییە لە دژی کوردان تۆمار دەکرد. کە بە درێژی باسی تاوانە گەورەکانی ڕژێمی دەگێڕاوە، لەلایێک سەری سوڕ دێنام و لەلایێکی تریشەوە زەندەقی دەبردم. چونکە لە سوپای ئێراقیێ نزیک بوو، بۆیێ ڕاپۆرتەکانی زانیاری زۆرو تازەی وایان تێدا بوو کە هی دوای ڕاپەڕین بوون.

کە کەوتینە سەر بەرخێکی تەواو و مریشک و ماسییەکی گەورە، تۆپبارانەکە توندتری کرد. هەرچەندە لە ڕاستیدا کوردەکان تۆپیان نەبوو، بەڵام ئەحمەد بارمانی هەر بۆ ئەوەی دڵم بداتەوە، پێی گوتم ئەوە کوردن وەڵامیان دەدەنەوە. لەگەڵ هێرۆ باسی ئەو گرفتانەمان کرد کە دێتە ڕێی ئەو وێنەگرانەی دەیانەوێ وێنەی تۆپباران بگرن. یەعقوب یوسف ویستی بمبا بۆ ئەوەی ئامادەی کۆبوونەوەیەکی ئێستەر ببم

---

(٢١) جاش، وەک ئەوەی لە پێشتر باسیم کرد، هێزێکی ناوخۆی کوردی بوو کە ڕژێم مووچەی مانگانەی بۆ بڕیبوونەوە. زۆر لە کوردەکان پەیوەندییان بەو هێزانەوە کردبوو چونکە تاکە پیشە بوو کە وەریان بگرێ، بە تایبەتیش لەو شارانەی کە پێیان دەگوترا شارەکانی سەرکەوتن.

(٢٢) گومانم هەیە بامەڕنی بێ نەک بارمانی، چونکە بە پێی زانیاری من بامەڕنێ شارۆچکەیێکی نزیک لە دهۆکە (وەرگێڕ).

کە لە دێرێکی کۆنی ئاشوورییەکاندا بەڕێوە دەچوو کە ڕژێم چەند ساڵ بوو دایخستبوو و لە دوای ڕاپەڕین دووبارە کرابووەوە. کە بۆردومانەکە پتر بوو، کۆبوونەوەکە دواخراو پاشان هەرگیز بەڕێوە نەچوو.

جەلال تاڵەبانی منی بردە سەرەوە بۆ ژووری منداڵان و لەوێ لێی پرسیم چۆن دەکرێ وەڵامی بانگێشتەیێکی سەددامی بدەمەوە کە داوای دانوستانی کردووە. "ئەگەر ئومێدی یارمەتی دەرەکیمان هەبێ، من هەرگیز دانوستانی دەگەڵدا ناکەم، بەڵام ئەگەر ئومێدیشمان نەبێ، ناتوانین نکوڵی لە خواستەکەی بکەین." زانیم ئەگەر کوردەکان دایەلۆگ لەگەڵ سەددامیدا بکەن ڕەنگە زیان بە ناو و دەنگیان لە واشنتن بگەیەنێ، بە ئاسانی بۆم نەکرا لاملی لێ بکەم. ئاخر هیچ ڕووناکییەکم لێ دیار نەبوو.

داوی نیوەشەو لەماڵی هەمزانی ڕۆیشتین و چووین بۆ گەڕەکێکی دیکەی دهۆک و لەوێ نووستین. لە ٦:١٥ ئەحمەد بارمانی بە نەرمی بانگی کردم تا خۆم بۆ ڕۆیشتن ئامادە بکەم. دوای یەک دەقیقە لە دەرەوە بووم بەو بەیانییە دەنمی. سەرهەڵدان هەرەسی هێنابوو، لەشکرەکانی ئێراقی بۆ ناو شاری دەهاتن. ئێمە بە لاندکروزەکانمان بەپەلە بەرەو باکوور بووینەوە، دوکانەکان هەموو داخراو و خیابانەکان چۆل کرابوون. هەرکە گەیشتینە سەر ئەو ڕێیەی بۆ ناو شاخەکان دەچوو، سەرەتای کارەساتی کۆڕەوی کوردان بەدیار کەوت.

پەناهەندەکان یان بەتەنیا یانیش بە گرووپی بچووکی خێزانی قەرە بەقەرەی ڕێگا، دەڕۆیشتن. پیادەکان بایی یەک یان دوو ڕۆژ زادیان بەکۆڵێوە بوو. ئەوانەی بەختەوەرتر بوون و ئۆتۆمۆبیل و بەنزینیشیان هەبوو، ئەوانە تا ترومبێلەکانیان دەگری نەفەریان تێئاخنی بوون. هەبوو سندووقەکانیان واڵا کردبوومەوەو چەند کەسێکیان سوار کردبوو. چەند لە ناو شاخەکان هەورازتر دەچووین، هێندە بۆ منداڵان مەترسییەکەی پتر دەبوو؛ چونکە لەناو مێرگی تازە بەهاری کورد چەند منداڵێکم بینی یارییان دەکرد. حەفتەی پاشتر هەندێ لەو منداڵانە بە هۆی زکچوون و سەرمای ڕەوەزە شاخەکانی سەر سنووری تورکیا ژیانیان لە دەست دا.

زگم بە تاڵەبانی و هەڤاڵەکانی سووتا لەو کاتەی کە ڕاپەڕین لەخۆوەڕا دەستی پێ

کرد، پارتە سیاسییەکانی کوردستان خێرا کۆنترۆڵیان کرد. لەو دەمەی کە بەڕێوەبەرایەتی بوش هەر خەریک بوو چاوی لە سەرکردە کوردەکان سوور دەکردەوەو پێی دەگوتن واشنتن چۆن سەیریان دەکا، ئەوان بە هیچ شێوەیێک گوێیان بە نیازپاکی وڵاتە یەککرتووەکان و سەرکردەکانی نەدا. وا تێگەیشتبوون کە سەرۆک بوش بەڕاستی بوو کاتێک کە داوای لە گەلی ئێراقیّ کرد سەددام حوسێن لە سەر حوکم لادەن. تەموموژ لە ئارادا نەما. سەرکردە کوردەکان ڕووبەڕووی دوا قۆناغی لەناوبردنی شۆڕشی کوردستان و ئەگەری لەناوچوونی گەلی کورد لە ئێراقیّ هاتن. لەو یەکشەممەی ئیستەر بوو بە خەیاڵی هیچ کەسدا نەدەهات کە ئەو هەموو پەنابەرەی ڕوویان لەو شاخانە کردبوو، ڕۆژێک دێ دەگەڕێنەوە.

لە شاری ئامێدی، کە شارێکی دیانەکانەو کەوتۆتە سەر تۆپکی شاخێکەوە لەگەڵ تاڵەبانی خاترمان خاست. ئەو بەرەو سنووری ئێران ڕۆیشت و منیش هیچ ڕێگەیێکم نەبوو ناچار بووم بەرەو سوریا ببمەوە. مۆەید ئەو پێشمەرگەیە بوو کە ئینگلیسی دەزانی و ئەرکی ئەوەی پێ درا من بۆ قامشلی بباتەوە. لە ڕۆژهەڵاتی زاخۆ بە یەکێک لە شارەکانی سەرکەوتنی سەددامدا ڕەت بووین، کە وەک سەربازگەکانی گرتووخانە بوو و گوندەکانی کوردان لێرە بە زۆری زۆردار جێگیرکرابوونەوە. داوام کرد بوەستیّ. ئێرە هێندەی ئەو شوێنانە دڵتەنگکەر بوو کە من و هێوود ڕانکن، چوار ساڵ پێشتر، لە کوردستانی ڕۆژهەڵاتدا چاومان پێیان کەوتبوو ئاوەدان کرابوونەوە. دانیشتوانەکەی ئازاد بوون، بەڵام هیچیان نەبوو. کە بەناو ئەو ڕێگاوبانە قوڕاوییەی گوندەکەدا ڕەت بووم، گەیشتمە چەند پیاوێک گوشێکی پەنجا کیلۆ گەنمیان بارکردبوو. ئەو گەنمە بوو کە ژاری پێوەکرابوو بۆ ئەوەی مشک بکوژێ. پیاوەکان بە نیازەوە بوون بیشۆرنەوە بۆ ئەوەی بە کەلکی خواردنیان بێ.

پلانە سەرەکییەکەی ئێمە وابوو کە تا شەو لە زاخۆ بمێنینەوە، ئینجا بە شەو لە دەجلە بپەڕینەوە. بەڵام ئەو بەیانییە سوپای ئێراقیّ لە باشووری ئێرە، دەۆکی دووبارە داگیر کردبووەوە، پشێوی لە زاخۆ بەرپا ببوو. نەدەزاندرا چەندی دیکە سوپای ئێراقیّ دەگەیشتە ئەویّ، مۆەید بڕیاری دا ڕانەوەستین. لەم جۆرە بارودۆخە، تەنانەت میوانداری کوردایەتیش وەک خۆی نەمابوو. بەر لەوەی بۆ سەر ڕووباریّ بڕۆین، مۆەید خوانێکی فرە خواردنی بۆ ڕێکخستین و لە ماڵی کابرایێکی زاخۆیی،

له سـەر نایلۆنێک چوارچمکە لە سـەر زەوی دانیـشـتین و خـواردمـان. (خانەخوێیەکەمان زۆر بە پەلە بوو، ڕەنگە کەمێک پاش ڕۆیشتنی خۆی ئەویش بۆی دەرچووبێ. ناندانی پێشمەرگەیێک و ئەمێریکییەک، سزایەکەی بێگومان زۆر قورس دەبوو.)

کە بەرەو دەجلە دەگەڕاینەوە، بۆردومانەکە زۆر لە هی دوێنێ خراپتر بوو. بە ناو قەمیشەڵانێدا بازمان هەڵداو خۆمان گەیاندە سەنگەرێک کە لە لێواری ڕووبارەکە دروست کرابوو. پاسەوانە پێشمەرگەکانم بە پێوە وەستابوون؛ کەچی من لە سەر زگ درێژ ببووم. کە گوێیان لە تەقینەوەی گوللە تۆپێک بوو، خۆیان بەسەر من دادا. پاشان هەموومان هەستاینەوەو وێنەی دووکەڵەکەم بە کامێرا ڤیدیۆی سۆنییەکەم گرت. پێشمەرگەکەش بەردەوام بانگی بەلەمەوانەکەی دەکرد بۆ ئەوەی لەوبەری لای سورییەوەڕا بێتەوە ئەم بەرەو من ببا، بەڵام دیار بوو کە نەدەوێراو دوودڵ بوو، هەقی خۆشی بوو بترسێ. تۆپخانەی ئێراقیێ سێرەی بەلەمەکەی گرتبوو، چەند گوللە تۆپێک لە نزیکی لە ناو ئاوەکە کەوتەوە. من ئاخر کەس بووم کە پەڕیمەوە. پاشتر کە بەلەمەوانەکە گەڕاوە نەفەری دیکە بێنێ، سێرەگرsniper ێک گوللەیێکی لە سەری دا.

لە ١ی نیسـانێ لە دیمەشق، هەڵوەسـتەیەکم کـرد تا تۆنی تۆمـا ببـینم. تۆنی کابرایێکی دیانی سوری بوو لە بیورۆی ئێی بی سی ABC لە دیمەشق کاری دەکرد، دۆست و برادەر و پەیوەندییەکی زۆری هەبوو. کە پێم گوتن ڤیدیۆیێکی تایبەتی خۆمم هەیە نیشان دەدا چۆن سەرهەڵدان ڕووخا، ئەندازیارێکی ABC ویستی چاوی پێی بکەوێ. گوتم بەو ڕەخنانە نەدا کە ئەندازیارەکە ئاراستەی کامێرایەکەی کردم کـاتێک کـە لە سـەر فیـلـمەکـەی دەگـرتمەوە، (ئەوە تەنیـا جـاری دووەم بوو کـە کامێرایەکەم بەکار بێنم) بەڵام پاشان داوایان لێ کردم ڕێگەیان پێ بدەم تا ڕەوانی نیویۆرکی بکەم. هەر ئەو ئێوارەیە وێنەکانی من گرتبووم لە نووچەی ABC Evening News دەرچوو. پیتەر جێنینگ لە نیویۆرکەوەڕا دیمانەیێکی کامێرای لەگەڵ کردم و منیش ئەو کارەساتە مرۆییەم خستە ڕوو کە تووشی کوردان هاتبوو. ٤ی بەیانی بە کاتی دیمەشق بوو کە ئێی بی سی لە نیویۆرکەوەڕا لە شێراتۆن بە ئاگای هێنام و لێی پرسیم ئەگەر بکرێ فیلمەکەم بۆ نایتلاین Nightline بگێڕمەوە. ئەو شەوە تێد کۆپێڵ پێنج دەقیقەی کۆتایی بەرنامەکەی فیلمەکەی منی بە بینەران نیشان دا.

ڕێسایێکی سەرەکی کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی سێنەتم بەزاند کە دەیگوت: دەستەی کۆمیتەکە بە هیچ شێوەیێک نابێ قسە بۆ ڕۆژنامەگەری بکا. بەڵام لە ڕاستیدا من لە ١ی نیسان تاکە ڕۆژئاوایی بووم کە لە کوردستان وەدەرکەوتبووم. سەدان هەزار مرۆڤ ڕووبەڕووی مردن دەبوونەوە. هەروا کەوتمە بن قەرزی ئەوانەی کە ژیانی خۆیانیان خستە مەترسییەوەو بە زیندوویتی لە ئێراقییان دەرباز کردم. وا ڕێکەوت کە سەرۆکی کۆمیتەکە سێنەتۆر کلێیبۆرن پێڵ لە ئەلبانیا بوو، ئەلبانیش هێشتا لە کوردستانی بەردەستی یاخییەکان پتر لە دونیا دابڕابوو. دەمزانی کەمێکی پێدەچێ تا لە سەر ئەمە تووشی بینەو بەردەیێک دەبم[٢٣].

وەڵامی هەموو هۆیەکانی ڕاگەیاندنم داوە. چەند ڕۆژێک پاشتر لە ئۆرۆشەلیمەوەڕا بۆ جاری دووەمم نایتلاین میوانداری کردمەوە، ئەمجارەیان توانجدەری پارێزگار جۆرج ویلو سێنەتۆری کۆماری ئەلفۆنسۆ داماتۆم لەگەڵدا بوون. پێم نەکرا چیتر دان بەخۆمدا بگرم. پرسیم، لە کاتێکدا کە جۆرج بوش، سەددام حوسێنی بە ئەدۆڵف هیتلەر پێناسە کرد، چۆن ئێستا لەو کاتەی کە سوپای ئەمێریکی لە ناو خاکی ئێراقیدا هەیە ڕێ دەدا هۆلۆکۆستێکی تر بکرێ. جۆرج ویل لە هەڵویستی بەرگری کردنی لە بەڕێوەبەرایەتی، سەر سوڕمانی خۆی لە شێوە زاری من نیشان دا، بەڵام داماتۆ دەمخۆشی لێ کردم. پاشان بەرهەمهێنەرێک گومانی لەوەکرد من هێشتا بۆ حکومەتی وڵاتە یەکگرتووەکان کاربکەم. پاشان لە سەرتاسەری وڵاتە یەکگرتووەکان نامەی ئەو بینەرانەم بۆ هات کە بەرنامەکەیان لە تەلیڤزیۆن بینیبوو، هەر هەموویان هەمان تووڕەیی منیان نیشان دەدا[٢٤]. حەفتەی پاشتر پتر لە ٥٠٠,٠٠٠ کورد بە پێیان،

لەو سنووره شاخاوییەی کە تورکیا لە ئێراق لێک دەکاتەوە دەرباز بوون و لە بناری

(٢٣) لە ڕاستیدا پێڵ و هەموو سێنەتۆرەکانی تر بە تەواوەتی پشتیوانییان لێ کردم. سێنەتۆر مۆینهان لە سێنەت، ئەو پەڕ ستایشی سەفەرەکەی کردم و سەروتارێکی منی خستبووە ناو تۆمارەکەی کە بۆ New Republicم نووسیبوو (گوتارەکەش لە ڕێسا لادانێکی ترم بوو).

(٢٤) لە ساڵانی پاشتر چەند هەزار دیمانەیێکی تێلیڤزیۆنیم کردووەو ژمارەیێکیان لەگەڵ نایتلاین دووبارە بوومەتەوە. زۆر بە دەگمەن وا دەبێ کە تاقە یەک نامەم بۆ بێ. ئاشکرایە کە کارەساتی کوردەکان و ڕۆڵی ئەمێریکا لەو کارەساتە ویژدانی کەسانێکی زۆری هەژاند.

شاخەکانی لای تورکیا کامپیان بۆ هەڵدرا. نە حەشارگەیێک و نە خواردنیان هەبوو، بۆیێ سەدانیان لە بەر بارانێ لێ مردن. سەرۆک ئوزال رێگەی نەدانێ پتر بۆ ناو خاکی تورکیا بێن، بەلام بریاری دا کە شێوەی رۆژهەلاتی ناڤین دووبارە دادەرێژێتەوە. رێگەی بە کامێرای تێلیڤزیۆنەکان دا، وێنەی ئازاری ئەو خەڵکە بگرن. سی ئێن ئێن CNN کاریگەرییەکی لە رادەبەدەری هەبوو.

وێنەی ئەو پەناهەندە کوردانەی تەرمی مەلۆتکەکانیان دەشاردەوە، بەپێچەوانەی یەکتری لەگەڵ وێنەکانی سەرۆک بوش کە لە کەنارەکانی فلۆریدا، لە کاتی پشوودانەکەی ماسی دەگرت، نیشانی بینەران دران. لە سەرەتادا زۆر سوپاسگوزاری سەرۆک ئوزال بووم و پاشان هی جۆن مێیجەری سەرۆک وەزیرانی بریتانیا (گرینگترین هاوپەیمانی ئەمێریکا) بووم و لە دواجاریش هی سەرۆک بوشی بووم. پاش ئەوەی هیچی بەدەستەوە نەما، بوش ئینجا فەرمانی بۆ سوپای ولاتە یەکگرتووەکان دەرکرد تا بچنە ناو خاکی باکووری ئێراقێ و ناوچەیێکی ئارام بۆ کوردەکان مسۆگەر بکەن. سوپایە ترسنۆکەکەی ئێراقێ ملی بۆ فەرمانی ولاتە یەکگرتووەکان کەچ کردو لە سێگۆشەی زاخۆ، دهۆک، ئامێدی پاشەکشەی کرد. پاشان زۆری نەبرد ولاتە یەکگرتووەکان ناوچە دژەفڕین ی لە هێڵی پانی ٣٦بەرەو باکوورەوە راگەیاندو هیچ فڕۆکەیێکی ئێراقی بۆی نەبوو بە ئاسمانی ئەو ناوچەیەدا بفڕێ(٢٥).

بۆ درێژی دوازدە ساڵ فڕۆکەکانی ئەمێریکی و بریتانی بە ئاسمانی ئەو ناوچەیەدا دەفڕین و پرۆسەکە تا داگیرکردنی ئێراقێی لە ٢٠٠٣ دا خایاند.

بە ماوەی چەند رۆژێک پەنابەران رێچکۆڵەیان بەست و گەرانەوەو زۆربەیان بەو سەنتەرەی پێشوازی و خۆراکی ولاتە یەکگرتووەکاندا دەگەڕانەوە کە لە ناو مێرگێک لە رۆژهەلاتی زاخۆ دایمەزراندبوو. ولاتە یەکگرتووەکان و هاوپەیمانانی ئەو شوێنەیان دەپاراست کە لە دوا شالاوی ١٩٨٨ دا سەددام گازبارانی کردبوو.

---

(٢٥) ناوچەی دژەفڕین هەموو کوردستانی نەگرتەوە. تەنیا هەولێرو دهۆکی پاراست و سلێمانی پشتگوێ خست. هەرچەندە میسل بە باکووری پانی ٣٦وە بوو، بەلام هەر هێزەکانی سەددامی کۆنترۆڵیان دەکرد.

لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، سوپای ئێراقی کەرکووکی لە ٢٨ی ئادارو هەولێری لە ٣٠ ئادارو سلێمانی لە ٣ی نیسانێ گرتنەوە. بەڵام لەو کاتەی کە تانکەکانی ئێراقێ ڕێچکەیان بەست بەرەو باکوور هەڵدەکشان، پێشمەرگە لە دەربەندی کۆرێ، ڕێیان پێگرتن. پێشمەرگە سێ تانکەکەی پێشەوەیان تێکشکاندو ئەوانی پاشەوەش گەڕانەوە. لە ڕۆژهەڵاتی سلێمانیش، پێشمەرگە سوپای ئێراقییان لە چیای ئەزناڕێ[٢٦] ڕاگرت.

ئەو شاخە بە سەر سلێمانیدا دەڕوانێ. ئەمەش پانتاییەکی زۆری زەوی لە ژێر دەستی کوردان هێشتەوە. چەند ڕێگایێکی شاخاوی ئەم ناوچانەی لەگەڵ ئەو ناوچانەی کە ئەمریکا دەیپاراست بەیەکتری دەگەیاندو دۆڵەکانی ڕۆژهەڵات و پارێزگای دهۆک بوونە بناغەی کوردستانێک کە بەخۆی فەرمانداری خۆی کرد. لە سێپتێمبەری ١٩٩١ بە شێوەیێکی لە ناکاو سەددام حوسێن سەرجەم سوپای ئێراقی و ئیدارەی مەدەنی لە هەردوو شارە گەورەکەی هەولێر و سلێمانی کشاندەوەو گەمارۆیێکی ناوخۆیی بەسەردا سەپاندن. سەددام پێشبینی ئەوەی کرد کە بەبێ یارمەتی دارایی بەغدا بەڕێوەبەرایەتی کوردستان لە شیرازەوە دەردەچێ و بەمەش ڕێگە بۆ دەسەڵاتی ناوەندی خۆش دەبێ دا جارێکی تر بێتەوە. بەڵام کورد مردنیان لە گەڕانەوەی حکومەتی بەغدا لە کن پەسندتر بوو.

کە ڕاپەڕین سەری هەڵدا، لایەنگری ئەمێریکا لە ئێراقێ لە ئەوپەڕی دابوو. لە چەند حەفتەیێکدا، چەکە سەرسوڕهێنەرە پێشتر نەبیندراوە تەکنۆلۆژیا باڵاکانی وڵاتە یەککگرتووەکان، گەورەترین سوپای ڕۆژهەڵاتی ناڤینیان تەفروتونا کرد. زۆر لە ئێراقییەکان دەیانویست وڵاتە یەککگرتووەکان چییان پێ دەڵێ ئەوان وا بکەن. سەرۆکی ئەمێریکی پێی گوتن کە میەوێ ئێراقییەکان سەددام حوسێن لە سەر حوکم لادەن و زۆر لە ئێراقییەکان وا تێدەگەیشتن سەرۆک بوش بەڕاستی بوو. کە سەرهەڵدان دەستی پێ کرد، چاوەڕێی هێمایێکی پشتگیری وڵاتە یەککگرتووەکانیان دەکرد.

---

(٢٦) ڕەنگە ئەمەش (ئەزمڕ) بێ لەبەک ئەزنار Aznar وەک ئەوەی دانەر لە دێڕی ١٣ی ل ٥٦ دا، نووسیویەتی. (وەرگێڕ).

پشتیوانی نەهات. بەڵکو بە پێچەوانەوە، وا پێدەچوو کە واشنتن بیەوێ ڕاپەڕینەکە هەرەس بێنێ. لە کاتێکدا کە هێزەکانی ئەمێریکا لە دۆڵی فرات، بێ ئەوەی جوولەی لێ بکا، تەماشای دەکرد، لەو کاتدا گاردی کۆماری یاخیبووە شیعەکانی سەربڕی. سەرکردەکانی ئەمێریکا لە باشووری ئێراقێ هەموو بانگەوازی سەرکردەو هاولاتییە شێعەکانیان پشتگوێ خست و یارمەتی نەدان. لە واشنتن و ئەورووپاو دیمەشق، بەرپرسانی وەلاتە یەکگرتووەکان نکووڵییان لە پێشوازی لێکردنی سەرکردەکانی ئۆپۆزیسیۆن کرد. موەفەق ڕوبەیعیو علی عەللاوی لە لەندەنەوەڕا فڕین و هاتنە فرانکفۆرت بۆ ئەوەی لە کاتی هێڵ گۆڕینی فڕۆکەکەم بۆ ڕۆژهەلاتی ناڤین، لەوێ چاویان پێم بکەوێ، چونکە سەرکردەی شیعە بوون، نەیانتوانی ڤیزای ولاتە یەکگرتووەکان وەدەست بێنن[٢٧].

ڕێگەدان بە فڕینی هێلیکۆپتەرەکان ئاماژەیێک بوو بۆ ئەو عیراقییانەی هێشتا دوودڵ بوون، تا نەکەن پەیوەندی بە سەرهەڵدانەکەوە بکەن. یەکێک لە مەرجەکانی ئاگربەست لە ٢٧ی شوبات، ئەوەبوو کە ولاتە یەکگرتووەکان فڕینی فڕۆکە باڵ چەسپاو و هێلیکۆپتەرەکانیان لە ئێراقییەکان قەدەغە کرد. ژەنراڵ شوارزکۆپف، بە فیزی سەرکەوتووانەوە، لەسەر CNN بە ئێراقییەکانی گوت، "بفڕن، دەمرن." بەلام پاشان کە ئێراق هێلیکۆپتەرەکانی بە شێوەیێکی کوشندە لە دژی کوردو شیعەکان بەکار هێنا، شوارزکۆپف جوولەی نەکرد.

دواتر شوارزکۆپف ڕاڤەی کرد کە ئێراقییەکان فریویان دا بۆ ئەوەی ڕێیان بدەن بفڕن. لە میانی دانوستانە فەرمییەکانی ئاگربەست کە لە ٣ی ئادار لە سەفوانی باشووری بندەستی ولاتە یەکگرتووەکانەوە بەڕێوەچوو، ژەنراڵی ئێراقی سوڵتان هاشم ئەحمەد داوای کرد فڕۆکە هێلیکۆپتەرەکانی لە یاسای دژەفڕین بخرێنە دەرێ و ڕێگەیان پێ بدرێ تا فڕۆکە هێلیکۆپتەرەکان بفڕێنن. بە پێی ئەوەی کە شوارزکۆپف دەگێڕێتەوە؛ ئەحمەد گوتی: "ئێمە بۆ ئەوە هێلیکۆپتەرەکانمان دەوێ تا کاربەدەستان

(٢٧) لەو هەڵبژاردنەی ٢٠٠٥، ڕوبەیعی بووە ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی و عەلی عەللاویش بووە وەزیری دارایی. هەردووکیان لە چاو حکومەتێکی ئایینی، پیاوی نەرمن و ئەمێریکا خودی ڕوبەیعی پەسند دەکات و سەرۆک جۆرج و. بوش پێشوازی لێی کرد.

بگەیێنینە ئەو شوێنانەی کە پردەکانیان ڕووخاوەو هیچ ڕێگەیێکیشیان ناگاتێ."
شوارزکۆیف لە یادداشتەکانی خۆیدا دەڵێ لەبەر ئەوە قایل بووم چونکە ئێراقییەکان هەر هەموو مەرجەکانی منیان پەسند کردو منیش پێم باش بوو ئەو تاکە خوازیارییەی ئێراقییەکان پەسند بکەم. (ئەوەی پشتگوێ خستووە کە دوژمنی بەزیو توانای بینەوبەردەی نەمابوو.) شوارکۆیف نەک هەر تەنیا خواستەکەی ئەحمەدی پەسند کرد، بەڵکو ڕێگەی دا کە هێلیکۆپتەرەکان چەکداریش بن.

کە ئێراقییەکان دەستیان پێ کرد هێلیکۆپتەرەکان بە مەبەستێکی جیاواز لە گواستنەوەی کاربەدەستان بەکار بێنن، وڵاتە یەکگرتووەکان دەیتوانی دووبارە ڕێککەوتنەکەی دژەفڕین بسەپێنێتەوە، بەڵام نەیکرد. شوارزکۆیف دەڵێ ئەمە بڕیاری کۆشکی سپی بوو. گەورە کاربەدەستانیش لە واشنتن مکوڕن لە سەر ئەوەی کە ئەوان نەیانویستووە کاری سەرکردەی مەیدانی بشێوێنن. بەڵام لە ڕاستیدا بەڕێوەبەرایەتی دڵی بەو ڕاپەڕینە خۆش نەبوو کە سەرۆک بانگەوازی بۆی کرد. لە یادداشتە هاوبەشەکەیاندا، شوارزکۆیف بە ڕاشکاوی بۆچوونی خۆی بەرانبەر شێوەی بیرکردنەوەی سەرۆک بوش ڕوون دەکاتەوەو دەنووسێ:

ناوە ناوە، [بوش] بەدیاری دەخست کە لادانی سەددامی پێ خۆش بوو، بەڵام لەبەر چەند هۆیێکی پراکتیکی هەرگیز هیچ پەیمانێک بۆ یارمەتیدانی سەرهەڵدان نەدرا. لە کاتێکدا ئومێدمان دەخواست یان سەرهەڵدانێکی گشتی یان بە کودەتایێک سەددام بڕووخێنێ، نە وڵاتە یەکگرتووەکان و نە وڵاتانی هەرێمەکە نەیاندەویست دەوڵەتی ئێراقێ لەباریەکتری بچێ. پارسەنگی هێز لە ناوچەی کەنداو بۆ ماوەیێکی درێژ بۆ ئێمە بابەتێکی پڕ بایەخ بوو. لەو دەمەش کە ئوزال سەددامی کردە بابەتی هەرە گرینگی خۆی، لە هەمان کاتیشدا، لەوەتی تورکیاو ئێران قایل نەبوون کوردستان ببێتە دەوڵەتێکی سەربەخۆ تا ئێستا، ئوزال یەکەم سەرکردەی تورک بوو کە هەڵویستێکی نەرمی بەرانبەر بە کوردەکان هەبێ. هەرچەندە لە نیازدابوو کە چارەی خۆنووسین بۆ کوردو شیعەکان دیاری بکرێ، بەڵام بنەما تایبەتمەندەکانی ئەم بارە تازەیە، سیاسەتی داڕشتەوە. تەنیا لەبەر ئەم هۆیانەوە بوو کە ڕاپەڕین ئێمەی نیگەران کرد...

به کورتی، جیۆپۆلیتیک واتا جیۆگرافیای سیاسی له دەرئەنجامی کارەساتی مرۆیی ڕووخانی سەرهەڵدانێک گرینگتر بوو. سەرکەوتنی سەرهەڵدانی کوردو شیعەکانی ئێراقیّ کە ۸۰ لە سەتی دانیشتوانەکەنە، دەبوو هۆی تێکچوونی "پارسەنگی دوورخایەنی دەسەڵات لە سەرووی کەنداوەوە." لە بری ئەمە، بوش بڕیاری مانەوەی سەددامی دا.

لە دوای هەرەسهێنانی ڕاپەڕینەکە، تیمی بوش کەوتە بەر شەپۆلی ڕەخنەی توندەوە چونکە هەلێکی چاکی بۆ لادانی سەددامی لەدەست داو بەتوندیش هانی شۆڕشی داو سەرکوتنەکەشی سەدان هەزار هاوڵاتی تێدا کوژرا گەورەکان، لە یادداشت و گەڤاهیدانەکانی تریاندا، باس دەکەن لەبەرچی کردارەکانیان هیچ سوودێکی نەبوو. بوش و سکۆکرۆفت و پاوڵ و چێنی جەخت دەکەنەوە کە سەرهەڵدان هەرگیز سەرنەدەکەوت. لەگەڵ ئەمەشدا، ڕاپەڕینەکە هێندەی نەمابوو سەددام بڕووخێنیّ و ئەگەر بەشێکی سوپا پەیوەندی پێوە بکردایە، یان ئەگەر شیعەکانی بەغدا ڕاپەڕیبان، گومان لەوە نەبوو کە سەردەکەوت.

زۆر لە ئەندامانی سوپای ئێراقیّ ویستیان لای یاخیبوونەکە نەگرن. هەندێکیان پەیوەندی ڕاستەوخۆیان بە کوردو بە هەندیّ هێزەکانی بەرگرییەوە هەبوو. بەڵام هەموو ئەفسەرەکانی سوپای ئێراقیّ دەیانزانی ئەگەر بڕیار بدەن بەشداری لە هەر شۆڕشێکی لە دژی سەددام حوسێنی بکەن، ئەوە بڕیاری مان و نەمانی نەک هەر هی خۆیانیان دەدا، بەڵکو ئەو بڕیارە خاوو خێزانەکانیشیانی دەگرتەوە. بۆیێ چاوەڕیّ بوون هێمایێکی سەرکەوتنیان بۆ دەرکەویّ تا پەیوەندی پێوە بکەن. هەڵوێستی وڵاتە یەکگرتووەکان یەکلا بوو. ئایا یارمەتی بدا؟ تا ناوەڕاستی ئاداریّ هەموو هێمایەکان هەر نا بوون. ئەگەر هەلێکی باشتری سەرکەوتن لە ئاسۆدا دیار با، ڕەنگ بوو شیعەکانی گەڕەکی شاری سەددام (کە ئێستا زۆرینەی شیعەکان ناویان گۆڕی و کردیانە شاری سەدر) ئەوانیش شۆڕشیان بکردبا.

شوارزکۆپف بە شێوەیێکی ئاسایی، ویستی بەهای بڕیارەکەی خۆی سەبارەت بە ڕێگەدانی فڕینی هێلیکۆپتەرەکان کەم بکاتەوە. پاشان گوناحی بڕیارەکەی دەخاتە ئەستۆی کۆشکی سپییەوە، ئینجا لە یادداشتەکانیدا دەڵیّ کە هێلیکۆپتەرەکان

ئەنجامەكانی ڕاپەڕینیان بە شێوەیێكی سەرەكی نەگۆڕی. كەچی لە ڕاستیدا، هێلیكۆپتەرەكان بوون كە تەواوی دەرئەنجامەكانی ڕاپەڕینیان لە كوردستاندا گۆڕی. هێلیكۆپتەرەكان بوون بواریان بۆ هێزەكانی ئێراقیێ سازاند تا لە ئاسمان و لە زەوییەوەڕا پەلاماری هێزەكانی پێشمەرگە بدەن. بەڵام كاریگەرە هەرە گەورەكەی دەروونی بوو. لە میانی شاڵاوەكانی ئەنفالی ١٩٨٧-١٩٨٨، هێلیكۆپتەرە ئێراقییەكان بە چەكی كیمیایی بۆردومانیان كرد. كە كوردەكان لە ئاداری ١٩٩١، هێلیكۆپتەرەكانیان بینی یان باسی بۆردومانكردنی هێلیكۆپتەرەكانیان بیست، شێوان. پێشمەرگە توانی لە چیایەكان خۆ ڕابگرێ (لە ڕاستیدا لە ڕۆژهەڵاتی هەولێرو سلێمانی باش خۆیان ڕاگرت) بەڵام نەیانتوانی بارودۆخی ئەو سەدان هەزار سیڤیلە كۆنترۆڵ بكەن كە لە شارەكان ڕایان دەكرد. بەشێوەییەكە بوو لەنەكاوێك هەرەسی بە ڕاپەڕینەكەی كورد هێناو هێلیكۆپتەرەكانیش بوون كە خەڵكیان ئاوا شڵەژاند.

لە دوا توێژینەوەیان، گەورە كەسایەتییەكانی بەڕێوەبەرایەتی بوش هەوڵ دەدەن بابەتەكە بگۆڕن؛ لە بری ئەوەی باسی فەیلەر(سەرنەكەوتن)ی خۆیان بكەن كە نەیانتوانی پشتیوانی سەرهەڵدان بكەن، شیتەڵكارییەكەیان بۆ سەر بابەتێكی جیاواز دەبەنەوەو دەڵێن ئایا دەبوو وڵاتە یەككگرتووەكان شەڕی بخستبایە ناو بەغدا یان نا. دەڵێن ئەگەر شەڕیان بگەیاندبایە بەغدا، ئەوە دەرچوون بوو لەو دەسەڵاتەی كە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەككگرتووەكان بۆ ئازادكردنی كوێت دابووی و ڕەنگبوو كارێكی ژیرانەش نەبا. پاش ئەوەی لە ١٩٩٣، چێنی ئۆفیسی جێهێشت، لە دیمانەیێكیدا وێنەكەی لە ناو ئەم چوارچێوەیە دانا: "ئێستا تۆ دەتوانی بڵێی، باشە، پێویست بوو بۆ ناو بەغدا بچن و سەددام بگرن. من لەم باوەڕەدا نیم. من وا تێدەگەم ئەگەر ئێمە ئەوەمان بكردایە، ڕەنگ بوو بكەوتباینا ناو زۆنگاوێك و بۆ ماوەیێكی زۆر نەمانتوانیبا لێی دەرچین و ئەگەری ڕزیش هەبوو هەر لێی سەرنەكەوین.

شەڕی كەنداو لە ٢٧ی شوباتی ١٩٩١دا كۆتایی هات، كێشەی چوونی هێزەكانی وڵاتە یەككگرتووەكانی بۆ ناو بەغدای یەكلا كردەوە. سەرهەڵدانەكان تا ٢ی ئادار دەستیان پێ نەكردو تا ناوەڕاستی ئادارێ ئینجا یاخییەكان باشوورو باكووریان

کۆنترۆڵ کرد. پێویستی نەدەکرد ولاتە یەکگرتووەکان لەشکر بۆ یارمەتیدانی یاخیبووەکان بنێرێ. تەنیا پێویست بوو نەهێڵێ فرۆکەکان بفڕن و یەکە زرێپۆشە ئێراقییەکانیش لە سەنگەرەکانیان دەرچن. ئەوەیش، پێویستی بە بەکارهێنانی هێزی ئاسمانی ولاتە یەکگرتووەکانی دەکرد، ئەگەر نا تەنیا چاو لێ سوورکردنەوەمیەکیان بەس بوو. بێگومان ئەگەر سەددام نەیتوانیبا ڕاپەڕینەکە دامرکێنێتەوە، دەرووخاو بە لاچوونی ئەویش ئەگەری شەڕی دووەمی ئێراقێ نەدەما.

جێی سەرسوڕمانە کە فەیلەری بوش، پارچەبوونی ئێراقیی لێ کەوتەوە. چونکە سەرۆک بوش ناچار بوو ناوچەی دژەفڕین بۆ کوردەکان دابمەزرێنێ، ئەوان دەوڵەتی دیفاکتۆی سەربەخۆی خۆیان دروست کرد. گوێنەدانی ئەمێریکاش بەو کوشتارەی لە دژی شیعە ئێراقییەکان کرا، ناچاری کردن بۆ ناو ئامێزی ئێرانێ بچن. سەیروسەمەرەکەی تر ئەوەیە کە ماوەی سەرۆکایەتی ئەو کوڕەی جۆرج هـ.و. بوشە بۆی ناسازێ، ئەو ناسازانەش لەبەر ئەوەیە شەڕێکی ناوخۆ بەرپا بووەو یەک لە ڕێچکۆڵەکانی ئەو شەڕەش دەچێتەوە بۆ ئەو هەرەسەی کە تووشی سەرهەڵدانەکە هاتو بووە هۆی ئەوەی، بەو شێوەیەی کە چێنی پێشبینی کرد؛ لەشکرەکانی ئەمێریکا لە ناو زۆنگاوی ئێراقیدا بچەقن.

دوای ئەوەی ئەو ناوچە ئارامەی ولاتە یەکگرتووەکان دەیپاراست دروست بوو، تۆزێک ئاسانتر بوو بۆم وەک کارمەندێکی ڕێکخەری دەستەی سێنەت (ئەنجومەنی پیران) سەردانی کوردستان بکەم. سوپای ئەمێریکی بە ڕێکوپێکی هێلیکۆپتەری بلاک هۆک(هەڵۆی ڕەش)ی لە دیاربەکری باشووری ڕۆژهەلاتی تورکیاوەڕا دەفڕاندە ناو باکووری ئێراقێ. کە کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوە داوای کرد، لە ٤ی سێپتێمبەری ١٩٩١، سوپا هێلیکۆپتەرێکی بۆ تەرخان کردم. لە سەرسەنگ چاوم بە جەلال تاڵەبانی کەوت. سەرسەنگ گوندێکی نزیکی تورکیایەو سەددام لەوێ کۆشکێکی لە ناو باخێکی چەند سەد دۆنمی بۆ خۆی دروست و شووره کردبوو. دوای چێشت خواردن لەگەل ئەندامانی سوپای ولاتە یەکگرتووەکان ئەوانەی ئەرکەکەیان ڕادەپەڕاند، من و تاڵەبانی بە بلاک هۆکەکە بە ئاسمانی ناوچەیێکی دەشتایی و دۆڵی قووڵەوەدا فڕین، پێنج مانگ پێشتر هاولاتی کوردی ئاسایی ئیعدام دەکرا ئەگەر بچووبایە ئەم ناوچانەی کە ئەندازیاری ئەنفال عەلی حەسەن مەجید، بە

ئاشكرا بە بەشێك لە ناوچە قەدەغە كراوەكانی دانابوون. كوردەكان پەیتا پەیتا بۆ سەر خاكەكانیان دەهاتنەوە. شوانەوێڵەكان بەر لە هەموو كەسێك گەڕانەوەو كە هێلیكۆپتەرەكانمان لە ئەوییەوەڕا بەسەر سەریاندا دەفڕی، دەستیان بۆ بەرز دەكردینەوەو سڵاویان لێ دەكردین. هێلیكۆپتەرەكەمان لە بەرزاییێك لە ڕۆژهەڵاتی كوردستان نیشتەوەو لەوێ ژمارەیێك لاندكروزەری یەكێتی نیشتمانی كوردستان چاوەڕێی دەكردین تا بۆ بارەگای كاتی تاڵەبانیمان ببا كە لە هاوینەواری شەقڵاوە بوو.

لەو ئێوارەیە بوو تاڵەبانی باسی ئەو دۆكیومێنتانەی بۆ كردم كە كورد بە بەردەستیان كەوتبوو. كە لە دەهۆك لە ماڵی لزگین هەمزانی بووین، هێرۆ تاڵەبانی گوتبووی كە كورد زۆر زانیاری تازەیان لە دەربارەی ئەنفال و هەترەسەكانی ترەوە لەلا بوو. چونكە ئەو ئێوارەیە پشێوییەك لە ئارادا هەبوو، بەچاكی نەمزانی مەرامی چ بوو، پاشانیش وا بۆی چووم كە ڕەنگ بوو هەموو بەڵگەنامەكان لەو هەڵات هەڵاتنەی ناو ئەو شاخانەدا لەدەست درابن.

جەلال تاڵەبانی هەموو باسەكەی بۆ كردم. لە كاتی ڕاپەڕین پارتە سیاسییە كوردییەكان دەستیان بەسەر هەموو دامودەزگاكانی ئەمنی عامەو دەزگای ئیستیخباراتی عەسكەری و بارەگاكانی حیزبی بەعسی داگرت. لە ناو ئەوان دەزگایاندا چەندەها تەن فایلیان دەرهێنا. هەندێكیان لەدەست دران كاتێ كە جەماوەری تووڕە ئاگری لە بارەگاكان بەردا. بەڵام هێشتا زۆربەی دۆكیومێنتەكان هەر دەرچوون. پێشمەرگەكانی یەكێتی نیشتمانی كوردستان بە پڕی چەندین ژوور ئەو بەڵگەنامانەیان گەیاندە شاخەكانی سەر سنووری ئێران و لەوێ هەڵگیران.

ئەگەر دۆكیومێنتەكان لە ئێراقێ بمابان، مەترسی ئەوە لەئارادا بوو دیسان حكومەت بیانگرتەوە. بە تاڵەبانیم گوت كە دەبێ ئەم بەڵگەنامە بەهادارانەی جینۆسایدی كوردان لە شوێنێكی ئارامدا هەڵبگیرێن. پێشنیاری ئەوەم كرد كە ئەو بەڵگەنامانە بداتە حكومەتی وڵاتە یەكگرتووەكان تا لە شوێنێكی سەلامەت هەڵیانبگرێ. گوتی: "هەرگیز نابێ، من متمانە بە سەرۆك بوش ناكەم. پیتەر گیان، من ئەو دۆكیومێنتانە ئەمانەتی دەستی تۆ دەدەم."

هەرچەندە نەمدەزانی دەبێ چییان لێ بکەم، بەڵام هێشتا هەر قەبووڵم کرد. بە تاڵەبانیم گوت کە پێویستە ئەو بەڵگەنامانە هەر پروپاتاری کورد بمێننەوە، پێشنیازیشم کرد وا بکرێ کە بەڵگەنامەکان لە لایێکەوە لەبەردەستی مێژوونووسان بێت و لەلایێکی تریشەوە بە مەبەستی تۆکمەکردنی کێشەی جینۆسایدی لە دژی ئێراقێ بەکار بێ. تاڵەبانی نەیویست دەزگاکانی ئێراقێ بەڵگەنامەکان ببینن و نەشی ویست بکەونە بەردەستی ئەو شارەزاو پسپۆرە ڕۆژهەڵاتی ناڤین ناسە ئەمێریکییانەی کە لایەنگری عارەب و دژی کوردن. گوتم هەندێ توێژەوانی هاوسۆز دەدۆزمەوە. گوتی ئەوا دەیانخەمە بەردەستی تۆوە، بەڵام مکوڕیش بوو لە سەر ئەوەی کە دەبێ هەمیشە کۆنترۆڵێکی تەواوی بەسەریانەوە هەبێ، بۆ ئەوەی هەردەمێکی بیەوێ دەستی پێیان بگات. زانیم کە دەگەڕێمەوە واشنتن، توانایێکی لۆجستی گەورەم دەبێ کە دەتوانێ بواری گواستنەوەی دۆکیومێنتەکان ساز بداو لە شوێنێکیش دایان بکا. بەڵام لەو دەم دەمویست بە ئازادی بەناو هەموو کوردستاندا بگەڕێم.

ڕۆژێک چوومە باکوور بۆ ڕەواندز کە شارە لە نزیکی سنووری ئێران و تورکیا بە سەر شاخێکەوە گیرساوە. لەوێ لە هۆتێلێک کە کردبوویە بارەگای خۆی، بۆ یەکەمین جار چاوم بە مەسعود بارزانی، سەرۆکی پارتی دیمۆکراتی کوردستان، کەوت. بە بەراورد لەگەڵ تاڵەبانی ئەمەیان وەک ئەو زۆر کابرایێکی کۆمەڵایەتی نەبوو؛ لەو دەم زانیم ئەم پیاوە گرانە بەو هیممەتە ڕاستەوە زۆر بە چاکی خزمەتی کێشەی کورد دەکا. کە سەرهەڵدان هەرەسی هێنا، ژمارەی پێشمەرگەکانی بارزانی تەنیا چەند کەرتێک مابوونەوە، بەڵام ڕەفزی کردو بۆ سنووری ئێرانێ نەچوو، لە بری ئەوەوە چووە ناو مەیدانی ئەو شەڕەی کە لە شاخەکانی باکووری هەولێرێ دەکرا. پێی گوتم ئامادەمە بمرم نەک جارێکی تر بەرەو ئێرانێ بیمەوەو لەوێ دیسانە پەناهەندە بم. بەدرێژی و بێ کۆتایی باسی بۆ کردم ئایا دەبێ کورد ڕێککەوتنێک لەگەڵ سەددامی بکا یان پشت بە پشتیوانییەکی نا مسۆگەری وڵاتە یەکگرتووەکانەوە ببەستێ. لە ڕێی گەڕانەوەم بۆ شەقڵاوە بە ئاهەنگی زەماوەندێکدا ڕەت بووین، بانگیان کردم و شاییم لەگەڵ کردن.

سوپای ئێراقیٚ هێشتا هەردوو شاری کوردستانی هەولێرو سلێمانی گەمارۆ دابوون و کردبوونی بە نیشان. لە ناو شارەکانیش، کاربەدەستە ئێراقییەکانی سەر بە سەددامی لەگەڵ پارتە کوردییەکان و هێزی پێشمەرگە وێکرا، بە نیگەرانی، مابوونەوە. کۆسرەت ڕەسوڵ، کە سەرکردەیێکی پێشمەرگەکانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوو، ناوبانگی بە ئازایەتی دەرکردبوو، کورتەک و شەڵوارو پشتێنێکی بەرینی کوردەواری پیٚ دام تا لەبەری بکەم. بەم شێوە خۆمان گۆڕیو بەناو بازگەی سوپای ئێراقیدا ڕەت بووین و سەردانی هەولێرمان کرد. پێشمەرگەی کورد لەم بەرەی شەقام و سەربازانی ئێراقیش لەوبەرەوە بوون، بەڕاستی هەولێر سێریاڵی بوو. لە کۆسرەتم پرسی ئایا دەتوانم لەگەڵ سەربازانی ئێراقی بدوێم. ئەویش شانی دا بەریٚ و پێشمەرگە چەند سەربازێکیان دەستگیر کرد و توانیم قسەیان لەگەڵ بکەم. ئەو سەربازانەی قسەم لەگەڵدا کردن لە کوێت بوون و گوتیان بەر لەوەی ئەمێریکا پەلاماریان بدا، ئەوان سەنگەرەکانیان چۆڵ کردبوو. وا پێدەچوو گەلێک سەربازی دیکە وایان کردبیٚ. هەر لە نموونەی ئەم ژمارە کەمەوە بۆم دەرکەوت ئەو شەڕە زەمینییەی کوێت کە سەد کاتی خایاند بۆیٚ ئاوا بە خێرایی و بیٚ تەگەرە بە سەر چوو، چونکە ژمارەی سەربازانی ئێراقی لە کوێت هێندە زۆر نەدەبوو کە هاوپەیمانان پێشتر مەزەندەیان لیٚ دەکرد. بەم ئەزموونەشم دڵنیا بووم کە برادەرە کوردو شێعەکانم چییان دەگوت: ڕژێمی سەددام لە سەر بناغەیەکی ئەوپەڕ چرووک دروست بووە،

لە هەموو شوێنێکی کوردستان چاوم بەو میراتانە دەکەوت کە لە سەددامی بەجیٚ مابوون. من و تاڵەبانی بە دۆڵی پڕ بێری بالیساندا ڕەت بووین. لێرە لە ١٩٨٧، ئێراق بۆ یەکەمجار چەکی کیمیایی لە دژی کوردان بەکار هێنا. پێنج ساڵ بەر لە ئێستا گوندەکانی ئاوەدان و پڕ لە کێڵگە بوو. لە ١٩٩١، ئەستەم بوو بڵێی لێرە ئاوەدانی هەبووە. لە ڕۆژهەڵاتی کوردستانیش سەرم لە کاولگەی قەڵادزیٚ دا، ئەو شارە ١٠٠ کەسی تێدا دەژی، بەر لەوەی سەددام حوسێن لە ١٩٨٩ بڕیاری دا خاپوور بکریٚ و کرا. هەموو خانووەکانی یان تەقێندرابوونەوە یانیش تانک ڕووخاندبوویانن. هەندیٚ لە دانیشتوانەکەی گەڕابوونەوەو لە حەشارگەی کاتیدا

دەژین. سەردانی خانەوەدەیێکم کرد بە لای کەم بیست نەفەر دەبوون، لە ناو پاشماوەی نهۆمی دووەمی قوتابخانەیێک دەژین. قوتابخانەکە هەمووی خاپوور نەببوو. دینگەیێکی کۆنکریتی لە گۆشەیێکی قوتابخانەکەدا بەپێوە مابوو و بانی قوتابخانەکەی لە بەرزایی پێنج پێ ڕاگرتبوو، ماڵەکە پتر لە ئەشکەوتی دەکرد. وا هاتە خەیاڵم وەک ئەوانە بن کە لە ١٩٤٥، لە ناوەڕاستی بەرلین ژیان. لە هەڵەبجەش دیمانەم لەگەڵ ئەوانەدا کرد کە لە کیمیا بارانەکەی ١٩٨٨، ڕزگار ببوون و سەردانی گۆڕخانەکەشم کرد. زۆربەی هەڵەبجەش هەر کاول کرابوو، سەری خانووەکان تەخت بوو، شیشەی کۆنکریتی لە هەموو لایێکەوە هاتبووە دەرەوە. پاش گازبارانکردنی لە ئاداری ١٩٨٨، سوپای ئێراقیّ شارەکەی وێرانیش کرد.

بۆ چوونە ناو سلێمانی، دووبارە بە بازگەی سوپای ئێراقیدا ڕەت بووم، بەڵام ئەمجارە خۆم نەگۆڕی. یەکەم هەڵوەستە کردنمان لە مودیرییەتی ئەمنی عاممە بوو. لە ژوورێکی دووکەڵاوی تاریکدا، پێشمەرگەیێک پێی نیشان دام چۆن، لەو ژوورە، زیندانی ڕووت دەکرانەوەو بەو قەنارەدا هەڵدەواسران کە لە بانی ژوورەکە شۆڕ ببوونەوەو لەوێ ئەشکەنجە دەدران. لە پشت تەلارەکەش، منیان بردە لای ترێلەیێک کە پڕی جلوبەرگی کچان بوو. ئەوێش ژووری ئابڕوو بردن بوو.

جگە لەو بەڵگەنامانە، کوردەکان ژمارەیێکی زۆر کاسێتی ڤیدیۆیان لەو تەلارەدا دۆزیبووەوەو هەندێکیان پێ نیشان دام. یەک لە کاسێتەکان هی ئیعدام کردن بوو؛ چەند کوردێکی نیشان دا بە چاوبەستراوەیی لە چەند کۆڵەکە دارێک شەتەک درابوون، لەو کاتدا کاربەدەستێکی حیزبی بەعسی بە دەنگێکی بڵند بڕیاری گوللەباران کردنیانی خوێندەوەو کۆمەڵە لایەنگرێکی حیزبەکەش چەپڵەڕێزانیان بوو. جا دەستڕێژی گوللە کران. پاشان هەر یەک لە ئەندامەکانی حیزبی بەعس کە لەوێ ئامادە بوو هات و دەمانچەکەی خۆی لە تەرمی ئیعدامکراوەکان بەتاڵ کرد. هەندێ لە تەرمەکان هێندە گوللەیان بەرکەوتبوو، کە ئامبیولانس هات بیانبا، دەرکەوت کە پارچە ببوون. لە ئێراقی سەددامی، ئەگەر خانەوادەی ئیعدامکراوان بیانویستبا تەرمی منداڵە ئیعدامکراوەکانیان بشارنەوە، دەبوو پارەی ئەو گوللانە بدەنەوە حکومەت کە کوڕەکانیانی پێ کوژرابوون.

هەروەها کاسێتێکی ڤیدیۆی ئەشکەنجانیان پێ نیشان دام، کە دەزگا ئەمنییەکان دەرمانی ڕاستی درکاندنیان لە سەر جوامێرێکی کورد تاقی کردەوە. واپێدەچوو کاری تێ نەکردبێ و کابرای ئەمن دەستی بە لێدانی کرد، بەڵام کوردەی بەستەزمان وەئاگا نەهاتەوە. وا دیار بوو دانی بە هیچ تاوانێک دانەنابوو، چونکە دوای سعاتێک لە یەکێک لە شەقامەکانی سلێمانی چاوم پێی کەوت، (بێناچوو چاوپێکەوتنەکەش بە ڕێکەوت بووبێ.) کوردەکان پێیان گوتم ڤیدیۆ تێیبی ئابروو بردنیشیان دۆزیوەتەوە، بەڵام بۆ ئەوەی شەرمەزاری نێتە سەر خزم و کەسیان، کاسێتەکانیان تێکشکاندووە.

چەندین سەربردەی تایبەتیشم بۆ گەڕاوە: ئەشکەنجەدراوەکان باسی خۆیانیان بۆ کردم، ئەوانەی لە پەلامارەکانی گازی ژاراوی دەرچووبوون دەردی دڵی خۆیانیان بۆ بەیان کردم، ماڵوێرانەکان گریێ کوێرەی ژیانی خۆیانیان بۆ کردمەوە، خانەوادەی ئیعدامکراوەکانیش فرمێسکی حەسرەتی خۆیانیان بۆ ڕشتم. لە ماڵی تاڵەبانی لە شەقڵاوە، چاوم بە تەیمور عەبدول کەوت کە کوڕێکی پازدە ساڵانی خەڵکی گوندی قولۆژیۆی[٢٨] نزیکی کفری بوو کە کەوتۆتە ناوچەیێکی هەرە باشوور کە کورد کۆنترۆڵی دەکەن.

کە تەمەنی دوازدە ساڵان بوو، تانک بەناو گوندەکەیان کەوتن. بۆی گێڕامەوە پاشان چ ڕووی دا:

ترومبێلە سەربازییەکان ئێمەیان بردە گزاوەی[٢٩] نزیکی بەنداوی دۆکان. پیاوەکانیان لە ژن و منداڵان جودا کردەوە. من لەگەڵ ژنەکان مامەوە.

خواردنیان نەدەدا پیاوەکان، جا ناچار ئافرەتەکان لە سەر درکە سیمەوەڕا برێک نانی خۆمانیان بۆ هەڵدەدان. دەمانبینی لە پیاوەکانیان دەدا، تا ڕۆژێک هەموویان ڕووت کردنەوەو تەنیا ژێرپۆشاکیان لەبەردا هێشتنەوەو پاشان لۆری زیلیان هێناو سواریان کردن. ئیتر هەرگیز چاومان پێیان نەکەوتەوە. دوای مانگێکیش ژن و منداڵەکانیان سواری پاسان کردن و هەموویان بۆ سەر سنووری عارەبستانی سعودی بردن. من لەگەڵ دایکم و سێ خوشکم و سێ پوورم لەناو پاسێکدا بووین.

---

(٢٨) گوندی قولۆژیۆ ؟؟؟؟؟!!!! ڕاستی ناوەکە.

(٢٩) گزاوە (ڕاستی ناوەکە) ؟؟؟؟؟

ئەو ڕۆژی هەموو بێ نان و ئاو مـاینەوە. ژنێک و منداڵێک لەناو پاسەکەی ئێمەدا مردن.

گەیشتینە شوێنێک لەوێ ئاویان داینێ و پاشان چاومانیان بەستاوە. پاسەکە هەندێکی تریش ڕۆیشت ئینجا ئێمەیان دابەزاند. من چاوپۆشەکەی خۆمم هەڵداوەو کەندەکانم بینی. منیان بۆ ناو یەک لە کەندەکان پاڵ داو سەربازەکان دەستیان بە گوللە هاوێشتن کرد. گوللەیێک بە بن هەنگڵم کەوت. تاوی سەربازێکم دا، ئەفسەرەکە لە سەربازەکە تووڕە بوو و لێی قیژاندو گوتی. "فڕێی دەوە ناو قۆرتەکە. گوللەبارانەکە دەستی پێ کردەوە و گوللەیێک لە پشتی دام. کچێک لە ناو قۆرتەکە بوو، نێوی سەرگوڵ و دانیشتووی گوندی هەوارە بەرزە بوو، هێشتا زیندوو بوو. گوتم دەبێ ڕاکەین، گوتی دەترسێم. کە تەققە وەستاو سەربازەکان دەستیان بە قسە کرد، ئێمە لە کەندەکە ڕامان کرد. بەڵام ئەو نەیویست بێ، ئیتر دوور خراوە. بوورامەوەو کە بەهۆش خۆم هاتمەوە، سەربازەکان قۆرتەکەیان پڕ کردبووەوە. بە پێیان چوومە گوندێک و لەوێ خێزانێکی عارەب ئاگایان لێ بووم. خزمێکی سستەریان لە سەماوەی هەبوو. دەرمان و برینپێچەی بۆ هێنام. کوڕێکی ماڵەکەی لە سلێمانی سەربازبوو، چیرۆکی منی بۆ برادەرێکی خۆی گێڕابووەوەو ئەویش مامی دۆزیبووەوە. بەم جۆرە هاتمەوە باکوور.

دوای ئەوەی ئەو هەمووەم بیست و بینیم، هاتمە سەر ئەو باوەڕەی کە بەکارهێنانی هێز بۆ لادانی سەددام لە لایەنی ئەخلاقییەوە ڕەوابوو. گەیشتمە ئەو قەناعەتەش کە کورد هەرگیز بە دەستپێشخەری خۆیان بە دووبارە بوونەومیان بە بەشێک لە ئێراق، قایل نابن.

لە واشنتن لە سێپتێمبەر، سەبارەت بە چۆنیەتی دەرکردنی دۆکیومێنتەکان لە ئێراقێ، هەڵگرتنیان لە شوێنێک، دووچاری گرفتێک هاتم. هەردوو سێنەتۆر پێڵو گۆر، نامەیێکیان بۆ ڕیچەرد چێنی وەزیری بەرگری نووسیو لێیان خواست کە لەشکر دۆکیومێنتەکان بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان بگوازێتەوە. چێنی بەمە قایل بوو، بەڵام تا کارە لۆجستییەکانی تەواو بوو چەند مانگی پێچوو و چەند سەفەری بۆ پێنتاگۆن ویست بیکەم. گۆر لە هارفارد چاودێری کۆلێژەکەی خۆی بوو، وایزانی

ڕەزامەندی زانکۆیەکەی وەرگرت بوو، بۆ ئەوەی بەڵگەنامەکانی لێ تەقەت بکرێ. بەڵام پاشتر ڕاوێژکاری گشتی زانکۆیەکە بەشەرمەوە تێلیفۆنێکی بۆ کردم و لێی خواستم کە ئەوان لە ڕێککەوتنەکە دوور بخرێنەوە نەکا داکردنی ئەو دۆکیومێنتانە ببنە هۆی ئەوەی کە تیرۆریستان پەلاماری کتێبخانەی وایدنەر بدەن.

ئارکایڤە نەتەوەییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان بە درێژایی ساڵانی شەڕی ساردو بە نهێنییەوە، هەموو ئارکایڤەکانی کۆماری پۆڵاندی پێش ۱۹۳۹ی هەڵگرت و بۆ ماوەی حەفتا ساڵیش تۆمارەکانی ئۆفیس و ماڵی نمایندەی قەیسەرەکانی ڕوسیایان لە واشنتن پاراست. ئەمانە پێشەنگییەکی باشی بەرچاو بوون. دەستەی ئارکایڤەکان بۆیان ڕوون کردمەوە کە ئەوان بە پێی یاسا لەسەریانە هەموو فایلە یاسا سازییەکانی کۆمیتەکانی کۆنگرێس بپارێزن. لێرە بووە ئەرکی من ئەوە ڕابگەیێنم کە دۆکیومێنتە کوردییەکان فایلی یاسایی کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەن.

لە نیسانی ۱۹۹۲، دوو حەفتەم لە کوردستان بەسەربرد تا توانیم بەڵگەنامەکان بگەیەنمە زاخۆ، تا سوپای وڵاتە یەکگرتووەکان لەوێوە هەڵیان بگرێ. ئێی بی سی نایتلاین ABC Nightline تیمێکی چوار کەسی بە سەرۆکایەتی پەیامنێر مارک لیتکە نارد بۆ ئەوەی پرۆسەکە تۆمار بکەن و چیرۆکی هەترەسەکانی سەددام حوسێنیش بگێڕنەوە.

لە بارەگایەکانی دائیرەی ئەمنی شەقڵاوە فایلەکان چۆن کوردەکان دۆزیبوویانەوە، هێشتا هەر وەک خۆیان لە شوێنەکانی جارانیان بوون و دەستیان لێ نەدرابوو. دەفتەرێکی تێبینییەکانیان پێ نیشان دام کە بەرگەکەی گوڵگوڵی بوو. وەک ئەو دەفتەرانە بوو کە بەزۆری کچانی هەرزەکار بۆ قوتابخانە دەیبەن، بەڵام لە ناوی بە دەستخەتێکی ڕێک ناوو ڕۆژی لەدایکبوون و ناوی گوندی ئەو لادێییانەی نزیکی شەقڵاوەیان لێ نووسرابوو کە، لە میانی شاڵاوەکانی ئەنفالدا، ئیعدام کرابوون. زۆربەی کوژراوەکان منداڵ بوون. دەستەی نایتلاین وێنەی کوردەکانیان گرت کە فایلەکانیان لە ناو سندووقان دەکرد. لە کێوە بەرزەکانی ماوەت، لە سەر مەرزی ئێرانێ، دۆکیومێنتەکان لە ناو گوشی دانەوێڵەو کۆنە بۆکسی تەقەمەنی کرابوون و لە

ناو قوتابخانەیێکدا هەڵگیرابوون کە هەمووی دڵۆپەی دەکرد. زۆر شادمان بووم کە ئەو بەڵگەنامانەمان لەوێ دەرخست، چونکە فاکتەرە سرووشتییەکان لەو شوێنە دوورەدەستە لە ئێراق پتر مەترسییان بۆیان هەبوو. لە دوادواکانی نیسان، بەخۆم یەکەم ژمارە بۆکسی بەڵگەنامەکانم گەیاندە سوپای وڵاتە یەکگرتووەکان لە زاخۆ. دوای دوو حەفتە دیسان بە خۆم لەوێ بووم کە فڕۆکەیێکی بارهەڵگری هێزی ئاسمانی لە جۆری سی-٥ C-5 لە بنکەی هێزی ئاسمانی ئەندراوس نیشتەوەو ٨٤٧ سندووقی لەو دۆکیومێنتانەی بار کردبوو کە کێشییان چواردە تەن بوو. منیش ڕامگەیاند کە ئەوانە فایلی یاسایی کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوە بوون و ئارکایڤی نەتەوەییش National Archives لە ژوورێک کە لە ناو دروستکراوی سویتلاند، مێریلاند، کە بە تایبەتی بۆ ئەو دۆکیومێنتانە دروست کرابوو، شاردیانیەوە.

سەربردەی ئەو دۆکیومێنتانە سەرنجی ڕاندی فیشبێینی بۆ خۆی ڕاکێشا. فیشبێین بۆ سێنەتۆری دیمۆکراتی هاوایی، دانیاڵ ک. ئیناویی سەرۆکی کۆمیتەی لاوەکی subcommittee دەستکەوتەکانی وەزارەتی بەرگری، کاری دەکرد. فێشبێین هێندە فشاری کرد تا وای لە ئینایی کرد کە ١ ملیۆن دۆلار بۆ لێکدانەوەو ڕیزبەندکردنی ئەو دۆکیومێنتانە تەرخان بکا. تیمێکی بیست و پێنج کەسی لە سەربازانی یەدەکی سوپاو کۆنتراکتەری سیڤیل لە ساڵێک پتر خەریک بوون دۆکیومێنتەکانیان کورت دەکردەوەو پلەی گرینگایەتییان بۆیان دیار دەخست و ئینجا سکانیان دەکردن. لە کۆتاییدا، یەکێتی نیشتمانی کوردستان چەند سەت سیدییەکی وەرگرت کە هەموو دۆکیومێنتەکانیان تێدا سکان کرابوون و هەڵگیرابوون.

میدڵ ئیست وۆچ Middle East Watch یەکێک بوو لەو ڕێکخراوانەی بایەخیان بە چارەنووسی کورد دەداو پێشتریش ڕاپۆرتی نایابی دەربارەی پێشێلکردنەکانی مافەکانی مرۆڤی ئێراقێ کردبوو. بەدڵی تاڵەبانی بوون توێژەرێکی هاوسۆزیان هەبوو، نمایندەی ڕێکخراوە سەرەکییەکەی میدڵ ئیست وۆچ بوو لە واشنتن و ناوی هۆڵی بێرکالتەر بوو و منیش متمانەی تەواوم پێی هەبوو. لە ئایاری ١٩٩٢، نامەیێکم

بۆ میدڵ ئیست وۆچ نووسی و دەسەڵاتم پێ دا بۆ ئەوەی توێژینەوەی خۆی لە سەر ئەو دۆکیومێنتانە بکا. میدڵ ئیست وۆچ، بە دوو ساڵ، راپۆرتێکی فەرمی دەربارەی ئەنفال دەرکرد. بەڵگەنامەکانی لەگەڵ دیمانەو راپۆرتەکانی پزیشکی یاسایی دەربارەی هەڵدانەوەی گۆڕە بەکۆمەڵەکان، بەیەکەوە بەستانەوە. میدڵ ئیست وۆچ گەیشتە ئەوەی کە ئێراق جینۆسایدی لە دژی کورد کردووە. جێی داخە کە هیچ حکومەتێک نەیدەویست کێس (قضیە)ی جینۆساید لە دژی ئێراق بۆ دادگەی دادی نێودەوڵەتی بەرز بکاتەوە.

***

لە ناوەڕاستی ١٩٩١، جیهان چیتر بایەخی بە ئێراق نەدا. لە کۆتایی حوزەیران، سلۆڤێنیاو کرواتیا لە یۆگۆزلاڤیا جودا بوونەوەو سەربەخۆیی خۆیانیان ڕاگەیاند. شەڕێکی لاوەکی لە سلۆڤێنیاو شەڕی گەورەش لە کرواتیا بەرپا بوو. سێنەتۆر پێڵ، لە دیسێمبەر بوو داوای لێ کردم ڕاپۆرتێک دەربارەی شەڕ لە یۆگۆزلاڤیای جاران ئامادە بکەم. لە بەلگراد بووم، کە سی ئێن ئێن ڕاپۆرتێکی لە مینسک بڵاو کردەوە؛ لەوێ سەرانی ڕوسیاو بێلەڕوسو یوکرانیا ڕێککەوتن کە یەکێتی سۆڤیەت هەڵوەشێننەوە. لە ماوەی دوا ساڵی لە حوکم. سەرۆک جۆرج هـ.و. بوش هەموو کاتی خۆی بە ڕووداوەکانی ڕوسیاو یۆگۆزلاڤیای پێشووەوە خەریک بوو. سەرۆک کلنتنیش ئەو بابەتەی بە پێشەنگی گرینگییەکانی خۆی داناو سەرباری ئەوەش ڕووداوە تازەکانی بەڵکان بوونە هۆی ئەوەی کە هێزەکانی ناتۆ بە سەرکردایەتی ئەمێریکا لە ١٩٩٥ لە بۆزنیاو لە ١٩٩٩ لە کۆزۆڤۆ، بڵاوەیان پێ بکرێ.

شەڕی یۆگۆزلاڤیای پێشوو لە ١٩٩٣، بووە پێشەنگی گرینگییەکانی منیش. سەرۆک کلنتن منی بە یەکەم باڵیۆزی وڵاتە یەکگرتووەکان لە کرواتیا، دامەزراند. پێنج ساڵ لە کاتی شەڕو پاشتریش لە ڕۆژانی ئاشتییە ناسکەکەشی لەوێ مامەوە. پاش مانەوەیێکی کورتم لە واشنتن لە ٢٠٠٠، ئەرکی بەڕێوەبەرایەتی کاتی نەتەوە یەکگرتووەکانم لە تەیمور پێ سپێردرا. لە نزیکەوە لەگەڵ بەڕێوەبەری نەتەوە یەکگرتووەکان سێرڤیۆ دی میلۆ کارم کردو پێکهاتەی سیاسی و دەستوری سەربەخۆبوونی ئەو وڵاتەم ڕێکخست.

بەرلەوەی لە کرواتیا دەست بەکار بم، بە مەبەستی خانرخاستن لە دۆستە کوردەکانم و پێناساندنی جۆرج پیکارت، کە لە جێی من پۆرتفۆلیۆی ڕۆژهەڵاتی ناڤینی لە کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی وەرگرت، دوا جار لە نیسانی ۱۹۹۳ سەردانی کوردستانم کرد. چاومان بە سەرۆکی پارتی دیمۆکراتی کوردستان، مەسعود بارزانی، کەوت و ئەویش قایل بوو ئەو دۆکیومێنتانەی لە کن پارتی دیمۆکراتی کوردستان بوو، بۆ کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوە، بگوازرێنەوە. جۆرج بە خۆی سەرپەرشتییەکی چاکی پرۆسەکەی کردو پاش چەند مانگێک ئەوانیشی گواستەوە. منیش خۆم تا دوای ۱۱ی سێپتێمبەری ۲۰۰۱، کێشەی ئێراقیم وەرنەگرتەوە.

ئێراق لە ۱۹۹۰ دووەم کێشەی سەرنج ڕاکێش بوو. بەڕێوەبەرایەتی کلنتن سیاسەتی دەقاوغگرتی Containmentی لە دژی ئێراقێ پەیڕەو کرد بۆ ئەوەی چیتر نەتوانێ هەڕەشە لە دراوسێیەکانی خۆی بکا و نەشتوانێ پرۆگرامی چەکە کۆمەڵکوژەکانی خۆی پەرە پێبدا. بەردەوامبوونی سزا توندەکانی نەتەوە یەککگرتووەکان کە لە ۱۹۹۰ سەپا، ئامێری سەرەکی بوو بۆ ئەوەی "سەددام هەر لە ناو قومقوم بهێڵێتەوە. ناوە ناوەش وەڵاتە یەککگرتووەکان چەند نیشانێکی لە ئێراقێ بووردومان دەکرد. لە هەموو ئەو بۆردومانانە سەختتر لە دوای ئەوەوە بوو کە سەددام چەند بەکرێ گیراوێکی نارد تا سەرۆکی پێشوو بوش لە کوێت لە ۱۹۹۳ بکوژن و ئەوەی دیکەیان لە ۱۹۹٦ بوو پاش ئەوەی هێزەکانی سەددامی بۆ ناو هەولێر چوون و جارەکەی تریشیان لە ۱۹۹۸ بوو کە سەددام پشکنەرانی چەکەکانی سەر بە نەتەوە یەککگرتووەکانی لە ئێراقێ وەدەر نان. سەرۆک کلنتن ناوچەی دژەفڕینی بۆ پاراستنی کوردەکان هێشتەوەو لە باشووریش تا هێڵپانی ۳۲ی خوار بەغدای هەوراز هێنا. ناوچەی دژەفڕی باشوور کە سەرۆک بوش لە ۱۹۹۲ سەپاندی، کارێکی سیمبۆلی بوو؛ چونکە سوپای ئێراق و گاردی کۆماری لەو ناوچانە هەر مابوونەوە کۆنترۆڵی باشووریان دەکردو پێویستییان بەوە نەبوو کە فڕۆکەی شەڕ بنێرن تا شیعەکان سەرکوت بکەن.

سەرۆک جۆرج هـ.و. بوش لە ۱۹۹۱ پرۆگرامێکی بۆ سی ئای ئێی داناو دەسەڵاتی

پێدا تا "پارەتی نهێنی پێشکەشی ئۆپۆزیسیۆنی ئێراقی بکا. پرۆگرامەکە زۆر بە نهێنی نەبوو. بەشێکی بۆ پێکهێنانی ئۆپۆزیسیۆنێکی یەکگرتووی ئێراقی تەرخان بوو. منیش لە ١٩٩٢ لە ڤیێنا ئامادەی کۆبوونەوەیێکی ئۆپۆزیسیۆنی ئێراقی بووم کە سی ئای ئێی پارەی بۆ دابوو. بەڕێوەبەرایەتی کلنتن ئەو پرۆگرامەشی نەپچڕاندو هەندێ ڤیدیۆی زۆر گرانبەهای لە لەندەن دەرکردو پارەتی زۆریشی پێشکەشی کۆنگرەی نیشتمانی ئێراقی کرد، کە بنکەکەی لە لەندەن بوو و ئەو چەترە بوو کە هەموو گرووپەکانی ئۆپۆزیسیۆنی لە سێبەری خۆیدا کۆ دەکردەوەو ئەحمەد چەلەبی سەرۆکایەتی دەکرد. سی ئای ئێی ئۆپەراسیۆنێکیشی لە باکووری ئێراقێ بەڕێوە دەبردو وای لە ئۆپۆزیسیۆنی ئێراقێ کرد، بە هەڵە، بێنە سەر ئەو باوەڕەی کە بەڕێوەبەرایەتی کلنتن پشتیوانی هەر هێرشێکی چەکداری دەکا ئەگەر لە ناوچە کوردییەکانەوە بۆ سەر شارەکانی کەرکووک و میسل، لەبەر دەستی میری ئێراقێ دان، بکرێ. لە ١٩٩٨، کۆنگرێس یاسای ئازادی ئێراقیی دەرباز کردو ئەو قانوونەش گۆڕینی ڕژێمی ئێراقیی کردە سیاسەتێکی فەرمی وڵاتە یەکگرتووەکان و بە ئاشکرا پارەی بۆ ئۆپۆزیسۆنی ئێراقی مسۆگەر کرد. کۆنگرەی نیشتمانی ئێراقیش لەوانە بوو کە پارەکەیان وەرگرت.

ئەوانەی هەستیان دەکرد کە بەردەوامبوونی سزاکان زیانی زۆر بە منداڵانی ئێراقێ دەگەیەنێ ڕەخنەی زۆریان لە سیاسەتی سەرۆک بوش دەگرت. کەچی هەندێکی تر هەبوون دەیانویست سزاکان توندتر بکرێن بۆ ئەوەی ڕژێمەکە لەناو ببا. بە چاو پێداخشاندنەوەیێکی پاشتر دەردەکەوێ سیاسەتی لەقاوغ گرتن کە سەرۆک کلنتن پەیڕەوی کرد، سوودی زۆری بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان هەبوو. سەددام حوسێن چیتر هەڕەشەی لە بەرژەوەندییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان نەکردو پرۆگرامی چەکە کۆکوژەکانیشی پەرە پێ نەدا وڵاتە یەکگرتووەکان بەردەوام بوو، کوردەکانی پاراست و زۆر بایەخدانی بە مافەکانی مرۆڤ لە ئێراقێ نەیهێشت وەک ساڵانی ١٩٨٠کان و ١٩٩٠ـەکان دەست بە کۆمەڵکوژی بکاتەوە.

لەگەڵ هەندێش ژیان بۆ زۆربەی ئێراقییەکان تاڵ بوو. سزاکان چینی ناوەندی کۆمەڵیان نەهێشت. ئێراقییەکان لە هەموو دونیا هاوێر ببوون. نەیاندەتوانی سەفەر

بکەن. تێکنۆلۆژیای سەردەمیشیان پێ نەدەگەیشت. نەیاندەزانی مۆبایل فۆن و ئینتەرنێت چییە[٣٠]. بەرهەڵستی کردن بە زۆری دەبووە هۆی مردن.

لە باشوور، سەددام زۆنگاوەکانی چک کردو زیانێکی بێ ئەندازەی لە ژینگە دا و ژیانێکی هەزار ساڵەی عارەبەکانی ئەو ناوچانەی لە ناو برد. چل هەزار عارەبی زۆنگاو بێ سەروشوێن بوون و لەناو بردنی ئەو کەلتوورە کۆنەیان بە دووەم جینۆسایدی سەددام دەژمێردرێ.

سیاسەتی لەقاوغگرتن چەند نیشانێکی وڵاتە یەکگرتووەکانی، بە نرخێکی کەم، لە هەردوو بواری دارایی و سەرچاوە سەربازییەکانەوە، پێکا.

(٣٠) کوردستان لەمە دوور بوو. کوردەکان سێرڤسی ئینتەرنێتیان بە قاچاغ گەیاندە کوردستان. بگۆڕی بریتانی و بەلژیکییان بەکار دێناو تۆڕێکی مۆبایلفۆنیشیان ڕێک خست و تا ئێستاش هەر لەگەڵ تۆڕی ئێراقیّ یەکیان نەگرتۆتەوە.

# بەشی ٥

## خۆبەزلزانین و نەزانی

لە ٢٩ی یەنایری ٢٠٠٢، سەرۆک جۆرج و. بوش گوتارێکی ئاراستەی دانیشتنێکی هاوبەشی کۆنگرێس کرد. لە ڕۆژانی پاش کارەساتەکەی ١١ی سێپتێمبەر، سەرۆک بوش ڕێژەیێکی ئەوپەڕ زۆری دەنگی هاوڵاتیانی لەگەڵدا هەبوو و ڕێزێکی تایبەتیشیان لێی دەناو ئەمەش لە هەردوو ئەنجومەنی هاوس و سێنەت ڕەنگی داوە. سەرۆک ستراتیژی نەتەوەیی بۆ جیهانی دوای ١١ی سێپتێمبەر، بۆ کۆنگرێس و گەلی ئەمێریکا دەستنیشان کردو گوتی:

ئامانجی دووەممان ئەوەیە نەهێلین ئەو ڕژیمانەی دالدەی تیرۆر دەدەن بە چەکی کۆمەلکوژ هەڕەشە لە ئەمێریکا یان لە دۆست و هاوپەیمانەکانمان بکەن. هەندێ لەو ڕژیمانە لە دوای ١١ی سێپتێمبەر، باش بێدەنگ بووینە. بەڵام ئێمە ڕاستی خوو و ڕەوشتیان دەزانین چۆنە. کۆریای باکوور مووشەک و چەکە کۆمەلکوژەکان بەدەست دێنێ، کەچی هاوڵاتییەکانی وا لە برسان دەمرن.

ئێران زۆر بە پەرۆشەوە خەریکی پەیداکردنی ئەم چەکانەیەو تیرۆریش بۆ دەرەوە دەنێرێ؛ کەچی چەند کەسانێکی هەڵنەبژاردراو گەلی ئێران سەرکوت دەکەن و ناهێڵن خەونی ئازادی وەدی بێنێ.

ئێراقیش بێ ڕاوەستان لەدژی ئەمێریکا کاردەکا و پشتیوانی تیرۆر دەکا. ڕژیمی ئێراقی پتر لە دە ساڵە خەریکی پیلانگێڕانە تا پەرە بە چەکەکانی ئانتراکس و گازی دەمارو ناووکی بدا. ئەمە ئەو ڕژیمەیە کە گازی ژاری بۆ کوشتنی هەزاران هاوڵاتییانی خۆی بەکار هێناوەو گەلێک تەرمی دایکانی بە کۆرپەی مردووەوەی لێ بەجێماوە. ئەمە ئەو ڕژیمەیە کە بە پشکنەرانی نێو نەتەوەیی قایل بوو؛ بەڵام پاشان

له وڵاتی دەرکردن. ئەمە ئەو ڕژێمەیە کە شتێکی هەیەو لە کۆمەڵگەی جیهانی شارستانیی شاردۆتەوە. وڵاتی وەک ئەمانەو هاوپەیمانە تێرۆریستەکانیان تەوەرێکی شەیتانی پێک دێنن و خۆیشیان پڕ چەک دەکەن بۆ ئەوەی هەڕەشە لە ئاشتی جیهانی بکەن.

دوای ئەم ناو هێنانە، نۆرەی هەڕەشە لێکردن هات:

دەبێ هەموو وڵاتێک بزانێ: ئەمێریکا هەموو هەنگاوێکی پێویست بەمەبەستی مسۆگەرکردنی ئاسایشی خۆی دەهاوێ...بەوردی بیری لێ دەکەینەوە چونکە کات لە بەرژەوەندی ئێمەدا نییە. لەو کاتەی مەترسی پەرە دەستێنێ، من چاوەڕێ ناکەم تا بەسەرمان دادەدرێ. وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمێریکا ڕێگا بە ترسناکترین ڕژێمەکانی گێتی نادا بە ترسناکترین چەکە کاولکەرەکانیان هەڕەشەی لێ بکەن.

دەستەواژەی "تەوەری شەیتان Axis of Evil سەرنجی ڕای گشتی بۆ خۆی ڕاکێشا(٣١).

---

(٣١) دەستەواژەکە بە دیاری خست کە دانەرەکەی زانیارییەکی کەمی دەربارەی ئەندازەو مێژوو، هەیە؛ چونکە تەوەر هێڵێکی ڕاستە لە نێوان دوو خاڵدا دەبێ، بەڵام کۆریای باکوورو ئێراق و ئێران ئەو تەوەرە پێکناهێنن. پێناسە مێژوویییەکەشی هەر هەڵە بوو؛ چونکە تەوەری شەڕی دووەمی جیهان (بە شێوەیێکی تەکنیکی باسی بکەین؛ ئەڵمانیاو ئیتاڵیا بوون؛ واتا تەوەری بەرلین ڕۆما بوو) ئەم دوو وڵاتەش هاوپەیمان بوون. کەچی لە ٢٠٠٢ ئێران و ئێراق دوو دوژمنی گەورەی یەکتری بوون و تەنیا بەرانبەر جۆرج و. بوش تەوەری بەغدا - تارانیان پێک دێناو هەر کردەوەکەی ئەویش بوو کە لە هەڵبژاردنە دیموکراتییەکەی یەنایری ٢٠٠٥، هاوپەیمانانی ئێرانیی لە بەغدا بۆ سەر کورسی حوکم هێنا. هەرچەندە ڕەنگە کۆریای باکوور تێکنۆلۆژیای مووشەک و ناوکی فرۆشتبێتە ئێرانێ، بەڵام خۆ هاوپەیمانی هیچ کام لەم دوو وڵاتانە نییە. جێین کێرکپاتریک، لە ١٩٧٩دا هزرڤانێکی پارێزگارە تازەکان و پاشان بووە باڵیۆزی بەڕێوەبەرایەتی ڕێیگن لە نەتەوە ئەکگرتووەکان، گوتارێکی بە تایتڵی "دکتاتۆرییەکان و بنەما دووانەکان Dictatorships and Double Standards"ی لە نۆڤێمبەری ١٩٧٩و لە کۆمێنتەری Commentaryدا بڵاو کردەوەو تێیدا ئەو کردارانەی سیاسەتی دەرەوەی ماندەل کرد کە بەڕێوەبەرایەتی وڵاتە یەکگرتووەکان وا هەست دەکا کە باشن، بەڵام هیچ باشییەکیان لێ پەیدا نابێ. دەستەواژەی "تەوەری شەیتان"یش قسەیێکی کلاسیکی بوو وا هەست کرا کە باش بوو، بەڵام هیچ سوودێکی بە ئاسایشی نەتەوەیی نەگەیاند.

وا زاندراوه کابرایێکی کەنەدی بە ناوی دێیڤد فرەم، لە ئۆفیسی نووسینەوەی گوتارەکان، لە کۆشکی سپی کار دەکا، ئەم دەستەواژەیەی داهێناوە. وا پێدەچێ ئەو ئەم دەستەواژەیەی خستبێتە ناو گوتارەکە بێی ئەوەی کە کۆلن پاوڵی وەزیری دەرەوە، یان هەر کەسێکی تری بەرپرسی سیاسەتی دەرەوەی وڵاتە یەکگرتووەکان، چاوی پێی کەوتبێ. بۆچوونی کۆشکی سپی تایبەت بە بابەتی ئاسایشی نەتەوەیی هەمیشە بەم شێوەیە بووەو کەچی بە شێوەیێکی نامۆ ناوبانگی بەوە دەرکردووە کە دسپلینی هەیە.

کاتێک کە ئامانجی ڕوون و ئاشکرا بۆ ستراتیژی ئاسایشی نەتەوەیی دادەڕێژرێ و کاتێک کە ستراتیژەکە دەکرێتە پێشەنگی ئەرکەکانی ترو مەترسی و سەرچاوە پێویستەکان بۆ ئەنجامدانی کارێکی تایبەتی ڕەچاو دەکا و ئەو کاتەش کە پلانێکی بە وریاییشی بۆ ڕێک دەخرێ، ئەو کات ستراتیژی ئاسایشی نەتەوەیی زۆر لەگینە کە سەرکەوێ. گوتارەکەی بوش و ئەو پرۆسەیەی کە پێیدا چوو تا ئەنجام دراو ئەو کردەوانەی کە بەدوایدا هات، بە ڕاشکاوی دەری دەخات کە ستراتیژێکی بتەوی وای نەبووە کە تایبەت بۆ دەستتێوەردانی وڵاتە یەکگرتووەکان لە ئێراقێ داڕێژرابێ.

ڕاستە سەرۆک بوش ئامانجێکی لە گوتارەکەی تەوەری شەیتاندا هەبوو؛ ئەویش ئەوەبوو کە وڵاتە یەکگرتووەکان ناهێڵێ ئەو وڵاتانەی مەترسییان لێ دەکرێ چەکی کۆمەڵکوژ بەدەست بێنن. بەڵام تەنانەت لێرەش ئامانجەکە بە وردی دیار نەبوو. چونکە هەموو چەکە کۆمەڵکوژەکان وەک یەکتری زیانبەخش نینە. هەرچەندە چەکە کیمیایی و بایۆلۆژییەکان ئەوپەڕ مەترسییان لێ دەکرێ، بەڵام خۆ هێشتا هێندەی چەکی ئەتۆمی بکوژ و وێرانکەر نینە. لووتکەی ئامانجەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان دەبێ کورت و ئاشکرا بێ کە نەهێڵێ چەکە ئەتۆمییەکان بکەونە بەردەستی ئەو وڵاتانەی کە ڕەنگە بەکاریان بێنن یان بە تیرۆریستانیان بدەن.

هەرچەندە کە ئێراق لە هەردوو وڵاتەکەی تری "تەوەری شەیتان" ترسی کەمتری لێ دەکرا، بەڵام چونکە بوش لە کارەکەیدا وردبین نەبوو، هەستا بڕیارێکی دەرکردو بە پێی ئەو بڕیارە هەموو سەرچاوە سەربازی و دیپلۆماسییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ڕوو لە ئێراقێ کرد. لەودەمەی بوش گوتارەکەی دا، ئێراق، یازدە ساڵ بوو، لە بن

سزایێکی توندی نەتەوە یەکگرتووەکانی دەناڵاند. لەو دەمی کە سەددام پشکنەرە نێو نەتەوەییەکانی لە ١٩٩٨، لە ئێراقێ دەرکرد، وڵاتە یەکگرتووەکان بە متمانەیێکی تەواوەوە دەیزانی کە ئێراق پرۆگرامێکی دیاری ناووکی لە ٢٠٠٢دا، لەبەردەستدا نەبوو. چونکە ئێراق لە ١٩٨٠کاندا، هەندێکی زۆری چەکە کۆمەڵکوژەکانی دروست کردبوو و هاریکاری پشکنەرانیشی نەکردبوو، بۆیێ وەڵاتە یەکگرتووەکان ناهەق نەبوو واتێبگا کە ئێراق چەکی کیمیایی پێشتری هێشتا هەر مابوو. بەڵام هیچ ڕاپۆرتێکی هەواڵگری نەبوو بڵێ ئێراق بە شێوەیێکی بەرفرە چەکی کیمیایی نوێ دروست دەکا. بەڵگەکانی تایبەت بە چەکە بایۆلۆژییەکان هێشتا لاوازتر بوون، بەڵام بەکارهێنانی ئەو کەرستانە بە شێوەیێکی کاریگەر لە کاتی شەڕدا، ئەوپەڕ ئەستەمە. بەم جۆرە بە پێی ئەو زانیارییانەی وڵاتە یەکگرتووەکان هەیبوو یان توانی لە ٢٠٠٢دا بەدەستی بێنێ، ئێراق تەنیا ئەو چەکە بایۆلۆژییانەی هەبوو کە پێشتر دروستی کردبوون و هەر ئەوەندەش بوون کە بایی ئەزموونەکانی بوون.

بە پێچەوانەی ئێراقیشەوە کۆریای باشوور و ئێران پرۆگرامە ناووکییەکانیان چالاک ڕادەپەڕێنن. فۆکەس کردنی وڵاتە یەکگرتووەکان لەسەر ئێراقێ تەنیا ئاکاێکی ستراتیژی دروست کرد کە ڕەنگە کاریگەرییەکی ئەوپەڕی لەسەر ئەو هەردوو وڵاتە هەبێ کە چەکی ناووکی بڵاودەکەنەوە. لە ڕاستیدا سەرقاڵی وڵاتە یەکگرتووەکان لەگەڵ ئێراقێ، بە ئاشکرا کۆریای باکوورو ئێرانی لە سەر پرۆگرامەکانیان ڕشتتر کردو هیچ ڕێگەیێکی لێ نەگرتن.

لە ٢٠٠٢، کۆریای باکوور بەشێک بوو لە پەیمانی بڵاونەبوونەوەی چەکی ناووکی Nuclear Non proliferation Treaty جۆخینی پلۆتۆنیەمیشی هەڵدابووەوە، بەڵام لە ژێر چاودێری ئاژانسی وزەی ئەتۆمی Atomic Energy Agency دابوو کە دەزگایێکی چاودێری نەتەوە یەکگرتووەکانە. لە ١٩٩٤، کۆریای باکوور ڕێککەوتنێکی لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکان و کۆریای باشوور و ڕووسیاو چین و ژاپۆن مۆر کرد؛ بەو پێیە کۆریای باکوور هەموو چالاکیە ئەتۆمییەکانی خۆی ڕاگرت. لەبەرانبەردا نەوتی بۆ دەچوو و بواریشی پێ درا کە دوو کارگەی وزەی ئاوی سووکی ناووکی دروست بکا. ئەم کارگانە مەترسی زۆریان لێ نییە کە بگۆڕێن و پرۆگرامی چەکیان لێ پەیدا بکرێ. لە

٢٠٠٢، سەرۆک بوش کۆریای باکووری گومانبار کرد کە بە نهێنی پرۆگرامێکی پیتاندنی یورانیەم دادەمەزرێنێ. ئەگەر کۆریای باکوور دەزگای پیتاندنی یورانیەمیشی دامەزراندبێ، خۆ هێشتا بەگەڕ نەکەوتبوو و چەند ساڵی تریشی دەویست تا بتوانێ کەرستەی وا دروست بکا کە لە ڕێگەی پیتاندنەوە کەل fissile بێ. بە کورتی، ئەگەر کۆریای باکوور فێڵی لە ڕێکەوتنەکەی لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکانیشدا دەکرد، بەڵام خۆ فریودانەکەی لەسەرە خۆ بوو. بەڕێوەبەرایەتی بوش بێی هیچ پلانێکی بتەو، قەیرانێکی لەگەڵ کۆریای باکووردا قیت کردەوەو هەموو ئەو نەوتەی لێ بڕی کە بەپێی ڕێکەوتنەکەی ١٩٩٤ بۆی دەنارد. کۆریای باکووریش تۆڵەی خۆی کردەوەو لە ٣١ی دیسێمبەری ٢٠٠٢، لە پەیمانی بڵاونەکردنەوەی چەکی ناووکی کشاوەو بەم کارەشی بووە یەکەمین وڵات کە لەم پەیمانە پەشیمان بێتەوە. وا پێدەچێ کە لەو پلاتینیەمەی کە پێشتر دایکردبوو لەبەر چاودێری ئاژانسی وزەی ئەتۆمی نێودەوڵەتی IAEA بوو.

کۆریای باشوور وڵاتێکی دکتاتۆری دڵڕەقەو سەرکردەیێکی بێ لغاوی هەیەو پێشتریش گەلێ تێکنۆلۆژیای ترسناکی فرۆشتووەتە ئەو لایەنانەی کە پتریان پێی داوە. چونکە بوش خەریکی ئێراقێ بوو، بۆیێ لە قسە بترازێ هیچی تری بە کۆریای باکوور پێ نەگوترا. ئەمەش بە ڕاشکاوی هیچ کاریگەرییەکی نەبووەو زۆریش لەگینە کە کاریگەرییەکەی بە پێچەوانە دووبێ. ئەو پەرەسەندنە زۆرەی کۆریای باکوور لەبواری ئەتۆمیدا، دەرئەنجامێکی ڕاستەوخۆی ئەو ستراتیژییە بوو کە وڵاتە یەکگرتووەکان فۆکەسی لەسەر ئێراقێ کرد.

ئێران هێشتا نموونەیێکی باشترە بۆ ئەوەی بەدیار بخا بوش توانای نەبووە کە بە شێوەیێکی ستراتیژی بیر بکاتەوە. ئەو ستراتیژکارەی بڕیاری دا ئێراقی داگیر بکا، دەبوو پێشان بیری لە باری ئێرانێ بکردابایەوە. ئەگەر ڕەچاوی بابەتی ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی لە ئێراقیی بکردبایە کە ئێران دروستی کردووەو پارەی داوەتێ و ڕەچاوی ئەوەشی بکردایە کە نیوەی لای باشووری ئێراقێ هەموو شیعەنە، دەبوو بیر لەوەش بکاتەوە کە ئێران کاریگەرییەکی تەواوی لە ئێراقی پاش سەددام دا دەبێت. تەنانەت ئەگەر ئێران مەبەستی ئایندەش بایە، دەبوو ئەو ستراتیژکارە وای لە

ئێران کردبا کە کەمترین بەرهەڵستی کارەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی لە ئێراقیدا بکردایەو خۆشی ئامادە بکردایە تا پەلاماری ئێرانیش بدا

ئێران لە جۆرج و. بوش هۆکاری زۆرتری هەبوو بۆ ئەوەی سەددام لە سەر حوکم لادا. سەددام پەلاماری ئێرانی داو پتر لە ٥٠٠ کەس، لە هەردوولای ئێراق و ئێران، لەو شەڕە گیانیان لە دەست دا. سەددام بە شێوەیێکی کاریگەر چەکی کیمیایی لە دژی ئێران بەکار هێناو ئەگەر دەستی بە بەرنامەی چەکە کۆمەڵکوژەکانیشی بکردایەوە، ڕەنگبوو دووبارە پەلاماری ئێران بداتەوە نەک ڕوو لە وڵاتە یەکگرتووەکان بکا. هاومەزهەبە شیعەکانی ئێرانی سوود لە دیمۆکراسی وەردەگرن و هەر بۆ ئەم مەبەستەش خۆ ڕەنگبوو ئێران هاوکارییەکی باشی وڵاتە یەکگرتووەکانی بکردایە تا سەرکەوتنێکی سەربازی بە پەلە مسۆگەر بکا ئەگەر وڵاتە یەکگرتووەکان پاشتر خێرا هێزەکانی خۆی بکشاندبایەوە. لە ڕاستیدا، بەر لە وتارەکەی کە سەرۆک بوش تێیدا باسی تەوەری شەیتانی کرد، ئێران هاریکارییەکی باشی لە ئەفغانستان لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکاندا دەکرد. زانیاری دەربارەی قاعیدەی لەگەڵ ئاڵوگۆڕ دەکردو نەیدەهێشت چەکدارانی قاعیدە بەناو ئێرانیدا دزە بکەن، ڕێگەی بە ئەمێریکییەکانیش دابوو بێن بە دوای هەر فڕۆکەوانێکیاندا بگەڕێن کە فڕۆکەکەی لە شەڕی ئەفغانستانیدا دەپێکراو دەهات لە ناو خاکی ئێرانێ دەکەوتە خوارەوە. وڵاتە یەکگرتووەکان و ئێران دوژمنێکی هاوبەشیان هەبوو، کە قاعیدەو تالیبان بوون. تالیبان و قاعیدە شەڕیان لە دژی شیعە ڕێبازگەرەکان ڕاگەیاندبوو، چونکە بە لە دین هەڵگەڕاوە apostate یان دەناسن[٣٢].

دوای گوتارەکەی تەوەری شەیتان، ئێرانییەکان هاریکاری خۆیان دەربارەی ئەفغانستانێ، لە گەڵ وڵاتە یەکگرتووەکان ڕاگرت. هەواڵی جاسووسسییان چیتر بە وڵاتە یەکگرتووەکان نەداو هەموو ئەو یارمەتییانەشیان وەستاند کە ڕەنگبوو بە هۆیانەوە شەڕی دژە تێرۆر باشتر بەڕێوە بچووبا.

---

(٣٢) لە ٨ی ئابی ١٩٩٨، میلیشیایەکانی تالیبان کۆنسوڵگەری ئێرانییان لە مەزاری شەریف، لە باکووری ئەفغانستانێ داگیر کردو هەشت لە دیپلۆماتەکانی ئێرانی و ڕۆژنامەنووسێکیان کوشت. هەروەها تالیبانەکان زۆر بە توندی شیعەکانی هەراتێ نزیک مەرزەکانی ئێرانییان سەرکوت کرد.

له گوتارەکەی تەوەری شەیتان، بوش تەنیا ئێرانییەکانی تووڕە نەکرد، بەڵکو ئاماژەی بەوەشدا کە ڕەنگە دوای سەرکەوتنی هەڵمەتەکەی لە ئێراقێ، ئەمجارە ڕووی سێرەی ئەمێریکا لە ئێرانێ بنا. ئەمە وای لە ئێرانییەکان کرد کە ڕشت بن و نەهێڵن ولاتە یەککگرتووەکان لە ئێراقێ زاڵ بێ. سەرۆک هەرگیز تێنەگەیشت کە ئێران چ کاریگەرییەکی گەورەی لە ئێراقیدا هەیە. یان ڕەنگە هەر بیری لەوە نەکردبێتەوە کە ئێران گرینگە. ئیمڕۆش هاوپەیمانانی ئێران زۆرینەی ئەو هێزانەی ئاسایش کۆنترۆڵ دەکەن کە بە پارەی ولاتە یەککگرتووەکان مەشقەکانیان دەکەن و گەورەترین لایەنی شەڕی ناوخۆی ئێراقیشن.

چواردە ساڵ بوو ئێران پرۆگرامێکی نهێنی بۆ دروستکردنی چەکی ناووکی بەڕێوە دەبردو لەم بوارەشدا پاکستان یارمەتی دا، خۆ بەناو پاکستان هاوپەیمانی ئەمێریکاشە. لە ژێر فشاری نێو نەتەوەییەوە، ئێران ناچار بوو ڕێگە بە پشکنەرانی ئاژانسی وزەی ئەتۆمی نێودەوڵەتی بداو چالاکییەکانی پیتاندنی یورانیەمیش ڕابگرێ هەرچەندە کەرستەی کەلبوونی بۆمبێکیشی بۆ مسۆگەر دەکرد. لە سەرەتای ٢٠٠٦، سەرۆکی تازەو ڕادیکاڵی ئێرانی، مەحمود ئەحمەدی نەژاد، چیتر ڕێگەی نەدا ئاژانسی وزەی ئەتۆمی نێودەوڵەتی دەزگا نەتۆمییەکانی ولاتەکەی بپشکنێ و جاڕیشی دا کە ئێران دەست بە پیتاندنی یورانیەم دەکاتەوە. سەرانی ئێرانی دڵنیا بوون کە ولاتە یەککگرتووەکان پەلاماری ولاتەکەیان ناداو هۆی سەرەکیشی ئەوەیە کە ئەمێریکا لە ئێراقییە. ئەکبەر عەللامی ئەندامی پارلەمانی ئێرانی، لە یەنایری ٢٠٠٦، بە نیویۆرک تایمزی گوت: "ئەمێریکا ئێستا لە ئەوپەڕی بێ پاسەوانی دایە. جا ئەگەر ولاتە یەککگرتووەکان هەر هەنگاوێکی ناژیرانە بهاوێ [بۆ ئەوەی ئێران لە سەر پرۆگرامە ئەتۆمییەکەی سزا بدا] ئەوە بێگومان ولاتە یەککگرتووەکان و ولاتانی تریش هەمان زیانی وەک ئێرانێیان لێ دەکەوێ.

توانجەکەی عەللامی ئاماژەی بەوە دا کە ئێران دەتوانێ سەرهەڵدانێکی شیعە لە دژی ولاتە یەککگرتووەکان لە باشووری ئێراقێ و لە بەغداش بەرپا بکا. ئێران پشتیوانی ئەو پارتە سیاسییانەی شیعانیان کرد کە ئێستا لە ئێراقێ بالادەستن و ئێستاش چەک و پارەی باڵە سەربازییەکانیان بۆیان دابین دەکا. ئەو یارمەتییانە

۱۲,۰۰۰ میلیشیایەکانی ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی کە بە سوپای بەدر ناسراون و سوپای مەهدی موقتەدا سەدریش وەردەگرن[٣٣].

لە کاتێکی کە قەیرانی ناووکی لە نێوانی وڵاتە یەککگرتووەکان و ئێران پەرەی سەند، سەدر چوو سەردانی تارانێی کرد و لەوێ جەختی لە پشتیوانی کردنی ئێران کردەوەو گوتی: "ئەگەر وڵاتە ئیسلامییە دراوسێکان پەلامار بدرێن، جا ئەگەر ئێرانیش بێ، ئەوا ئێمە پشتیوانی لێ دەکەین. سوپای مەهدی تەنیا سوپای ئێراقێ نییە. بەڵکو بۆ ئەوە دامەزراوە تا بەرگری لە ئیسلام بکا

کە سەرۆک بوش سوپای وڵاتە یەککگرتووەکانی ڕەوانی ئێراقێ کرد، بە کردەوە ئەوانی کردە بارمتەی بەردەستی ئێران و شیعە ئێراقییە هاوپەیمانەکانیەوە. لە ئەنجامدا، بەڕێوەبەرایەتی هێندەی بەدەستەوە نییە کە بتوانێ ڕێگە بە ئێرانێ بگرێ و نەهێڵێ چەکە ناووکییەکان دروست بکا.

ئەگەر بەراوردێک لەگەڵ ڕابردوودا بکەین، دەبینین ئێستا وڵاتە یەککگرتووەکان لە پێشان پتر هەڕەشەی چەکی ناووکی هەردوو وڵاتی کۆریای باکوورو ئێرانی لە سەردا هەیە. بوش گوتی: "درەنگ بەئاگاهاتن ستراتیژی نییە" گرفتەکەی ۲۰۰۲ بە هۆی نەزانییەوە نەبوو، بەڵکو بە هۆی نەبوونی ستراتیژییەکی تایبەت بوو کە ڕێگە لەو هەردوو وڵاتە بگرێ تا چەکی ناووکییان بەردەست نەکەوێ. هەرمسهێنانی ئەو ستراتیژییە دەرئەنجامی پرۆسەیێکی نارێکی سیاسەتسازی بوو، سیاسەتسازان بایەخیان بە ئایدیۆلۆژیا دا پتر لەوەی بیر لە توێژینەوە بکەن و گوتار نووسێکیش پتر لە وەزیری دەرەوە کاریگەری هەبوو.

ڕاست بوو کە ئەو مەترسییەی لە ئێراقێ دەکرا، لەو ترسە کەمتر بوو کە لە هەردووک ئەندامەکەی تری تەوەری شەیتان دەکرا، بەڵام هێشتا چەند هۆیێکیش هەبوو وایان دەکرد کە مەترسی لە چەکە کۆمەڵکوژەکانی ئێراقیش بکرێ، بە تایبەتیش ئەو ئامانجە دوورانەی کە ڕژیم هەیبوو. بە پێی مەرجەکانی ئەو

(٣٣) لە بنەڕەتدا سوپای بەدری ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی لە ئێراقێ، بە ناوی فەیلەقی بەدر ناسرابوو. لە دوای داگیرکرنی ئێراق لەلایەنی هاوپەیمانانەوە لە ۲۰۰۳، فەیلەقی بەدر ناوی خۆی گۆڕی، بەڵام ئەرکەکانی خۆی نەگۆڕی.

ئاگربەستەی کە شەڕی کەنداوی کۆتاهێنا، ئێراق قایل بوو کە هەموو چەکە کۆمەڵکوژەکان و مووشەکە بالاستییەکانی خۆی لەناو بباو ڕێگا بە پشکنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان بدا هەموو دەزگایەکانی وەبەرهەمهێنانی چەکەکانی بپشکنن و هەموو وردو درشتی پرۆگرامەکانی چەکەکانیشی بۆیان ئاشکرا بکا. لە سەرەتادا ئێراق ویستی خۆی لە پەیمانەکانی بدزێتەوە. ڕێگەی بە پشکنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان نەدا بچنە ئەو شوێنانەی کە گومانیان لێیان هەبوو چەکیان تێدا شاردرابێتەوەو بە ڕاڕاییەوەش بەشێکی کەمی دۆکیومێنتی پرۆگرامەکانی نیشان دا. بەڵام کە حوسێن کاملی زاوای سەددام و بەرپرسی پرۆگرامەکانی چەکە کۆمەڵکوژەکانی ئێراق، لە ١٩٩٥، لە ڕژێم هەڵگەڕاوەو بۆ ئوردن ڕای کرد، ئینجا ئێراق ملی داو پتر چالاکییەکانی خۆی ئاشکرا کرد. پاشان لە ١٩٩٨، سەددام پشکنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکانی لە ئێراقێ دەرکردن.

ئەگەر پشکنینیش لە گۆڕێ نەبایە، هێشتا بارگرانی سزاکان و چاودێری نێو نەتەوەیی هاوردەکانی ئێراقێ، ڕێگەی وا لێ گرتبوو نە دەیتوانی پرۆگرامێکی نوێی ئەتۆمی دەست پێ بکاتەوە، نە دەیتوانیش بە شێوەیێکی بەربڵاو چەکە کۆمەڵکوژەکانی دروست بکا بەڵام هەر دەبوو بزانین کە ئەمانە دوا ئامانجی سەددام حوسێنی بوون کە دەیویست بەجێیان بێنێ. لە هەندێک لەو کاسێتانەی کە لەدوای شەڕدا گیراون، سەددام دەڵێ هەر دەبێ دەست بەو پرۆگرامانەی بکاتەوەو جەختیش دەکاتەوە کە ئێراق هێشتا زانیارییەکانی پێشتری هەر ماوە.

لە ٢٠٠٢، بەڕێوەبەرایەتی بوش ئێراقی ناچار کرد پشکنینەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان نوێ بکاتەوەو ئەمجارەشیان مەرجی پتری خرا سەرێو ناچار بێ لە ١٩٩٠ پتر ڕێگا بە پشکنەرەکان بدا تا هەر شوێنێک بیانەوێ بیپشکنن. لە ١٢ی سێپتێمبەری ٢٠٠٢، سەرۆک بوش باشترین گوتاری خۆی پێشکەشی نەتەوە یەکگرتووەکان کرد. گوتارەکە باش ڕێکخرابوو، بۆیێش چاک پەسند کراو ڕوونی کردەوە کە ئێراق پێشێلی بڕیارەکانی پێشتری ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکانی کردووە. بڵاوە پێکردنی سوپای وڵاتە یەکگرتووەکان لە ناوچەی کەنداو و دزەپێکردنی هەواڵەکانی میدیای سەبارەت بە پلانەکانی شەڕ، پەیامێکیان بۆ سەددام و بۆ ئەندامانی تری ئەنجومەنی ئاسایش ناردو دەقەکەی ئەوەبوو کە

ولاّته یەکگرتووەکـان مکوڕە لەسـەر ئەوەی کـە ڕێبـازی لەشکری بگرێتـە بەر، تا چەکەکانی ئێراقی داماڵێنێ. کە کۆنگرێسیش دەنگی بۆ شەڕ دا، ئیترمکوڕبوونی ولاّته یەکگرتووەکانی ئاشکرا کرد(٣٤).

ئەنجـومـەنی ئاسـایشی نەتەوە یەکگرتووەکـان بە تێکڕای دەنگ بڕیارێکی دەربازکردو ئێراقی ئاگادار کردەوە تا پابەندی پەیمانەکانی بێت یان ڕووبەڕووی دەرئەنجامەکانی ببێتەوەو ئەمەش بۆ ئەوەی بوو ولاّته یەکگرتووەکان نەکا کارێکی یێکلایەنە بکا. سەددام دڵنیا بوو کە ولاّته یەکگرتووەکان ئەوجاری مکوڕ بوو لە سەر کارەکە، بۆیێ قایل بوو پشکنەرەکان بگەڕێنەوەو هیچ ڕێگەیێکیان لێ نەگیرێ و تەنانەت بتوانن بچن کۆشکەکانیشی بپشکنن(٣٥).

لەو ماوەیەدا، ئێراق هیچ بوارێکی نەبوو کە چەکە ناووکی و کیمیاییەکانی دروست بکاو بواری ئەوەشی نەبوو بڕێکی زۆری چەکی بایۆلۆژی بێنێتە بەرهەم. بۆ ئەوەی چەکی ئەتۆمی دروست بکا، ئێراق پێویستی بە کارخانەی گەورە و دەزگای تایبەتیەوە هەبوو کە نەدەشیا لە چاوی پشکنەران بشاردرێتەوە. هەروەها ئێراق نەیدەتوانیش کارخانەی چەکی کیمیایی حەشار بدا، یان ئەو تاقیگەیانە بپارێزێ کە

---

(٣٤) بڕیارەکەی کۆنگرێس دەسەلاّتی بەکارهێنانی چەکی دا تا ئێراق ناچار بکا ملکەچی پەیمانی چەکداماڵینەکەی بێ. بێگومان دەنگدانی ئەندامانی کۆنگرێس بۆ بڕیاری دانی دەسەلاّت بە سەرۆک تا چەک بەکاربێنێ پشتیوانییەکی باش بوو بۆی و ڕاستییەکیشی، لەمەڕ بەکارهێنانی چەک لە دژی ئێراقێ، بە هەڕەشەکانی سەرۆکی دا. ئاشکرایە کە ئەرکی هەر کۆنگرێسمانێک یان هەر نماینده‌یێک بوو کە دەنگی بۆ بڕیارەکە دا، بەرپرسێتی شەڕی ئێراقێ بخاتە ئەستۆی خۆیەوە، بە مەرجێک ئەگەر ئێراق پابەند نەبوو، بەلاّم خۆ دەنگدانەکە ڕێگەدان نەبوو بۆ شەڕ، ئەگەر ئێراق ملکەچ با.

(٣٥) سـەددام لە سـەرتاسـەری ئێـراقێ کـۆشکی هـەبوون. هـەرچەندە بەدەگمـەن سـەردانی هەندێکیانی دەکرد، بەلاّم هەمیشەو هەر ڕۆژ ستافی هەموو کۆشکەکان خواردنیان سازدەدا نەکا سەددام لەنەکاو سەردانییان بکا. ڕووبەری هەندێ لە کۆشکەکان، لەگەڵ سەرجەمی ئەو تەلارانەی کە پێیانەوە بەسترابوونەوەو ئەو زەوییانەی کە بۆیان تەرخان کرابوو، لە سەدان دۆنم گەورەتر بوو. هەر ئەمەش هۆیەکە بوو کە پشکنەرەکان مکوڕ بوون بیانپشکنن. ئێراق ناقایلی خۆی لە پشکنینی کۆشکەکانی سەرۆکایەتی ڕادەگەیاند، چونکە دەیگوت ئەوانە هێمای سەروەری بوون.

دەتوانن بڕێکی زۆری چەکی بایۆلۆژی بە بێ ترس، وەبەرهەم بێنن. ڕەنگە ئێراق توانیبێتی بە هۆی تاقیگە بگۆزانەکانیەوە بڕێکی کەمی کەرستەی بایۆلۆژی وەبەرهەم بێنێ. ئەمەش مەترسی ئاشکرابوون و پەلاماردانی لێ دەکرا. ئێراق دەیتوانی بە مەترسییەکی کەمتر، ئەو چەکە کیمیاییانەی بشارێتەوە کە پێشتر دروستی کردبوون.

تا پشکنینی نەتەوە یەکگرتووەکان بەردەوام بوو، ئەوپەڕی ئەگەری ئەو مەترسییەی کە لە ئێراقێ دەکرا، هی هەندێک لە چەکە کیمیاییە کۆنەکانی و بڕێک لە کەرستە بایۆلۆژییەکەی بوو. خۆ ڕاستە بەکارهێنانی چەکە کیمیاییەکان لە دژی گوندنشینە بێ بەرگرییەکان کارێکی ترسناکە، بەڵام تەنیا کاریگەرییەکی لاوەکی لەو هێزە ئەمێریکیانە دەکا کە تازەترین کەرستەی خۆپاراستنیان هەیە. کەرستە بایۆلۆژییەکانیش بە گرانی دەکرێنە چەک و بەکارهێنانیشیان پڕی مەترسییەو قیمەتیشیان کەمە، بەتایبەتی ئەگەر کەمیان لێ دروست بکرێ. بەکورتی، تا ئێراق لە بن باری پشکنین دابوو، هیچ هەڕەشەیکی ڕاستەقینەی چەکی کۆمەڵکوژی نەبوو.

لە یەنایری ٢٠٠٢، بەڕێوەبەرایەتی بوش هەڕەشەی ڕاستەقینەی چەکە کۆمەڵکوژەکانی ئێراقی نەهێشتبوو. نەتەوە یەکگرتووەکان و کۆمەڵگەی نێو نەتەوەیش بەتوندی پشتیوانی سیاسەتەکەیان دەکرد چونکە تایبەت بوو بە نەهێشتنی بڵاوبوونەوەی چەکی کۆمەڵکوژو سەرکەوتنێکی گەورەشی لە سیاسەتی ناچارکردنی ئێراقێ وەدەست هێنابوو. بۆیێ ڕەنگبوو ستراتیژسازێک لەو دەمی بیتوانیبا سوود لەو پشتیوانییە نێو دەوڵەتییەو ئەو متمانەیە وەربگرێ کە لە ڕشتبوونی بەڕێوەبەرایەتی لە سەر بەکارهێنانی هێز لە دژی کۆریای باکوور، وەدەستی هێنابوو؛ کۆریای باکووریش تازە لە پەیمانی نەهێشتنی بڵاوبوونەوەی چەکی ناووکی کشابووەوە. بەڵام بوش بە شێوەیێکی ستراتیژی بیری لە چەکە کۆمەڵکوژەکان نەکردەوە. پێشتریش بڕیاری دابوو کە شەڕ لەگەڵ ئێراقیدا بکا، هەر بۆیێش بوو لێگەڕا کۆریای باکوور چەکی ناووکی خۆی دروست بکا.

تەنانەت پاش ئەوەش کە زاندرا ئێراق چەکی کۆمەڵکوژی هەبوو، هیچ ستراتیژییەکی لۆژیک پەیڕەو نەکرا بۆ ئەوەی هەڵمەتێکی سەربازی گەورەو سەرچاوەیێکی دارایی زۆر بۆ لەناوبردنی پرۆگرامەکە ئامادە بکرێ. بریکاری

وەزارەتی بەرگری، پۆڵ وۆلفوویتز، لە دیمانەیێکی لەگەڵ ڤانیتی فێر، لە ئایاری ۲۰۰۳، بەڕاستی گوتی کە شەڕەکە چەند هۆیێکی تری هەبوو.

ڕاستییەکە ئەوەبوو کە پێویست بوو کارێکی زۆر بکەین، جا لەگەڵ بیورۆکراسی حکومەتی وڵاتە یەکگرتووەکاندا کارێکی زۆرمان بۆی کردو نیشتینە سەر کێشەی چەکە کۆمەڵکوژەکان و کردمانە کرۆکی کێشەکە، بەڵام... سێ لایەنی تر هەبوون هەمیشە جێی بایەخ پێدان بوون. یەکێکیان چەکی کۆمەڵکوژ بوو، دووەمیان پشتیوانی کردنی تیرۆریزم و سێیەمیشیان هەڵسوکەوتی تاوانکارانەی ڕژیم بوو کە لە دژی گەلی ئێراقیێ پەیرەوی دەکرد[٣٦].

سەرۆک بوش هێرشی سەر تیرۆریستانی دەست پێ کردبوو و بەرپاکردنی ئازادی لە ئێراقیێ کردبووە ئامانجێک. بەڵام ئەوەی دواییان لە دوای دۆزینەوەی چەکی کومەڵکوژ جەختی لەسەر کرا. ئەگەر ئەو ئێوارەیەی ئاداری ۲۰۰۳ بێنینەوە بەر چاوی خۆمان کە شەڕ دەستی پێ کرد، ئایا هیچ کام لەو ئامانجانە ڕەواییان بە شەڕەکە بەخشی؟

لە ۱۱ی سێپتیمبەری ۲۰۰۱و لە میانی یاریکردنێکی تۆپێندا، ئێرانییەکان دەقیقەیێک بۆ گیانی قوربانییانی پەلامارەکانی نیویۆرک و واشنتن وەستان، کە هەر هەمان ڕۆژو پێش کاتی یارییەکەیان قەومابوون. لە بەغداش، تەلیڤزیۆنی ئێراقی بە ئاسوودەییەوە گوتی: "ئەمە ڕۆژێکی ڕەشە لە مێژووی ئەمێریکاو ئەمەشی گەورەترین دۆڕاندنە کە دووچاری هاتووە."

هەرچەندە بەغدا شادمانی خۆی لە پەلامارەکان نیشان دا، بەڵام سەددام حوسێن هیچ پەیوەندییەکی بە تاوانکارەکانەوە نەبوو. سەددام حوسێن و قاعیدە، لە بواری ئایدیۆلۆژییەوە گەلێک لە یەکترییەوە دوواتر بوون. حیزبی بەعسەکەی سەددامی، گرووپێکی ناسیۆنالیستی سێکۆلار بوو، ئاواتیشی یەککردنی نەتەوەی عارەب بوو، لەم لایەنەشەوە، هیچ بایەخێکی بە ئایین نەدەدا (دامەزرێنەرەکەی ناوی میشێل

---

(٣٦) وۆلفویتز گوتی کە ڤانیتی فێر لە میانی چیرۆکەکەیدا تێبینییەکانی ئەوی بەرەواژی کردۆتەوە. دەقەکە لە دەستنووسکردنی دیمانەکەی وۆلفویتزی دەگەڵ ڤانیتی فێردا هاتووەو دەقەکەش لە وێبسایتی وەزارەتی بەرگریدا بڵاوکراوە.

عەفلەق بوو، کە سورياييیەکی ديان بوو.) ئوسامە بن لادنيش لەلای خۆیەوە هەوڵی دامەزراندنی خەلافەتێکی ئیسلامی جیهانی دەدا کە بە سەر هەموو جیاوازییە نەتەوەیی و ڕەگەزییەکان دا بازدەدا. توندڕۆیە سوننەکانی وەک قاعیدە، هەمیشە ڕژێمی سەددام حوسێنیان بە گەندەڵ ناوزەد کردووەو سەددامیش لەکنە خۆیەوەڕا توندڕۆیەکانی بە هەڕەشە ناساندووە و زۆر بە توندی کاری لەگەڵدا کردوون.

هەرچەندە قاعیدەو سەددام وەک یەکتری ڕقیان لە وڵاتە یەکگرتووەکان دەبووەوە، بەڵام هەرگیز ئەگەری هاوپەیمانێتی لە نێوان قاعیدەو سەددامدا نەبووە. ئەگەر سەددام یارمەتی قاعیدەی بدابا، ئەوا چارەنووسی خۆی دەخستە بەردەستی ئوسامە بن لادنەوە. هەرکاتێکیش قاعیدە ویستبای سەددام لەناو ببا، یەکسەر پەیوەندییەکەی نیوانیانی بۆ ئەمێریکییەکان دەچۆڕاندو ئەوانیش بێ سێو دوو لێکردن بەدوای ئێراقێ دەکەوتن. لە میانی سی و پێنج ساڵی حوکمڕانییەکەی سەددام گەلێک هەڵەی کرد، بەڵام هەرگیز بواری ئەوەی نەدا پیاوێک کە هەموو بیرو بۆچوونەکانی ئەوی لە لا پووچەڵ بوو و دەیویست لەناویان نهێلێ، کە دەستی بەسەریدا بشکێ. تەنانەت هەواڵگری بە سیاسەت کراوی وڵاتە یەکگرتووەکانیش نەیتوانی هیچ بەڵگەیێک بەدەستەوە بێنێ کە بۆنی پەیوەندی نێوان ئێراق و قاعیدەی لێ بێ.

لۆژیک و ڕاستییەکان ڕێیان لە بەڕێوەبەرایەتی بوش نەگرت تا چیدی بەدوای ئەو پەیوەندییانە نەگەڕێ. ئەوەبوو چێنیی جێگری سەرۆک پاڵپشتی بیرۆکەیێکی کرد؛ گوایا ئەو ڕەمزی یوسفەی کە لە ١٩٩٣ پەلاماری ناوەندی بازرگانی نێونەتەوەیی دا، لە ڕاستیدا هەر خۆی ئەو ئێراقییە بووە کە ناسنامەی یوسفی هەڵگرتووە. بۆ پشتڕاست کردنەوەشی، بەڕێوەبەرایەتی ڕاپۆرتێکی جاسوسی بڵاو کردەوە کە نمایندەیێکی باوەڕپێنەکراوی هەمیشە مەست بەرزی کردبووەوەو تێیدا نووسیبووی کە گەورە تێرۆریستی پەلامارەکانی ١١ی سێپتێمبەر، محمد عەتا، لە ٢٠٠٠، لە پراگ، لەگەڵ یەکێک لە کارمەندانی باڵیۆزخانەی ئێراقی کۆبووەتەوە. (هیچ بەڵگەیێک نییە بسەلمێنێ کە عەتا سەردانی پراگی کردووە.) چونکە وەزیر ڕەمسفیڵد قەناعەتی بە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکانی سی ئای ئێی و ئاژانسی هەواڵگری بەرگری Defense Intelligence Agency تایبەتی خۆی نەبوو، بۆیێ ئوفیسی پلانە تایبەتەکان office of

Specialی دامەزراندو ستافێکی تایبەتی لە سیاسییە ڕووناکبیرەکانی بۆ دامەزراندو ئەرکیان ئەوەبوو کە ڕاپۆرت بۆ دۆگلەس فەیسی بریکاری وەزیری بۆ کاروباری سیاسی، بەرز بکەنەوەو هەوڵ بدەن پەیوەندییەک لە نێوان سەددام و قاعیدە بدۆزنەوە، چونکە گومان دەکرا کە شارەزایانی هەواڵگری پێیان نەکرابوو ئەو بەڵگەیە بەدەست بێنن.

سەرۆک بوش بە سادەییەوە جەختی کردەوە کە ئێراق تەواوکەری شەڕی دژەتیرۆر بوو. بەر لە شەڕەکە سەرۆک هیچ بنەمایێکی بۆ ئەو قسانەی نەبوو کە دەیکرد، بەڵام وا دەرکەوت کە ڕاست بوو. چونکە هەر لەدوای داگیرکردنی ئێراقێ، سوننەکان توندڕۆیە تێرۆریستەکان مێگەل بەدوای مێگەل بۆ ناو ئێراقێ دێن. ناوەندە سوننەکەی ئێراقیش وەک ئەفغانستانی سەردەمی تالیبانی لێ هاتووە - کەس ناتوانێ بچێتە ناو ئەو ناوچانەی کە کەسانێکی نەناسراو تێرۆریستەکانی سەر بە قاعیدە لەناو خۆیاندا دەشارنەوە. ئەو پەلامارانەی کە ئەو تێرۆریستانە دەیانکەن، تەوژمێکی نوێ و یارمەتییەکی وا بە قاعیدە دەدا کە بتوانێ هەزاران تێرۆریستی نوێ تەجنید بکا تێرۆریستە بیانییەکان زیانێکی زۆریان لە دەرئەنجامی ئەگەری سەرکەوتنی ئێراقێ داوە. لە ٢٠٠٣، بارەگای نەتەوە یەکگرتووەکانیان لە بەغدا، تەقاندەوەو سێرجیۆ ڤێیرا دیمیلیۆی نوێنەرەی نەتەوە یەکگرتووەکانی لە ئێراقێی کوشت. دیمیلیۆ دیپلۆماتێکی هێندە کاراو شارەزا بوو؛ هەموو لایەنەکان ناویان لە سەرەوەی لیستی کاندیدەکانی پۆستی سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان دانابوو[٣٧].

---

(٣٧) لە کرواتیا، لە نزیکەوە لەگەڵ سێرجیۆ ڤێیرا دیمیلیۆ کارم کرد. ئەو سەرۆکی کاروباری سیڤیلی هێزی UNPROFOR و منیش باڵیۆزی وڵاتە یەکگرتووەکان بووم. لە ١٩٩٩ داوای لێ کردم لە تەیموری ڕۆژهەڵات کاری لەگەڵ بکەم. لەوێ سەرۆکی بەڕێوەبەرایەتی کاتی نەتەوە یەکگرتووەکان بوو. دەڵێن لە پاش داگیرکردنی ئەڵمانیاو ژاپۆن، ئەمەیان سەرکەوتووترین هەوڵی "دروستکردنی دەوڵەت" بووە. گەلێک فاکتەر تەیموری ڕۆژهەڵاتیان سەرخست، قەوارەی بچووک و یەکبوونی سەرکردە خۆماڵییەکان و هەبوونی سەرچاوەی داهاتێکی زۆر کە بەرانبەر بە قەوارەی وڵاتەکە گەلێک زۆر بوو. هەرچەندە دیمیلیۆ دەسەڵاتی تەواوی نەتەوە یەکگرتووەکانی هەبوو، بەڵام هیچ کارێکی بێی ڕاوێژکردن لەگەڵ تەیمورییەکان نەکردو هیچ =

بەم کـارەشـیـان نـەتەوە یەکگرتووەکـانیـان ناچار کـرد لە ئێـراقێ دەرچـی. ئەم کردەوەیە سـامـانێک لە شـارەزاییـیـەکی بێ ئەندازەی ئـەو پیـاوەی لە دەسـتـی ئەو ئەمێریکییە نەشارەزایانە دا

هەر لە کوشتنی باقر حەکیمەوە لە ٢٠٠٣، تا تەقاندنەوەی گۆڕخانەی عەسکری لە ٢٠٠٦، تێرۆریستە بیانییەکان هەمیشە ئاگری شەڕی ناوخۆیان خۆش کردووە. بەو کەشە پڕ ترسەی دروستیان کردووە، وڵاتە یەکگرتووەکانیان ناچار کردووە چەندەها بلیۆن دۆلاری سەرباری ئەوەی پێشتر بۆ دووبارە دروستکردنەوە تەرخانیان کردبوو، بۆ ئاسایشیش تەرخان بکەن و واشیان کردووە هەموو هەوڵەکانی ئاوەدانکردنەوە بە فیـڕۆ بچێ. ئەگەر وڵاتە یەکگرتووەکان لە ئێراقێ بکشـێـتەوە، بەر لەوەی ئـاسایش سەقامگیر بکا، قاعیدە نەک هەر تەنیا سەرکەوتن ڕادەگەیێنێ، بەڵکو ئەوەی کە لە ٢٠٠١ لە ئەفغانسـتـانێ لەدەستی دا، لە ناوچە سوونەنشینەکانی ئێراقێ دروسـتـی دەکاتەوە.

با تۆزێکیش لەگـەڵ بەڕێوەبـەرایەتی بوش بـە ویژدان بین، خـۆ ئەو هەمـووە بەر لە شەڕ پێشبینی نەدەکرا. ئەوەی ئاشکرا بوو ئەوەبوو کە ئێراق بەشێک لە شەڕی دژە تێرۆر نەبوو. پێشبینی دەکراو پێشبینیش کرا کە شەڕ ڕەنگە دەزگاکانی ئێراقی بڕووخێنێ، جا ئەگەر وڵاتە یەکگرتووەکان ئاسایشی نەپاراستبا، ڕەنگبوو پشێوی و ئاژاوە بەرپا ببا. بەڕێوەبەرایەتیش باش دەزانێ کە بەرپابوونی ئاژاوە، تێرۆریزم ئاو دەدا. بەڵام بەڕێوەبەرایەتی هیچ پلانێکی بۆ دوای ڕووخانی سەددامی سازنەدا.

دیمۆکراسی دەرگەیێکی دیکەی شەڕی خستە سەرپشتێ. دامەزراندنی ئێراقێکی دیمۆکراتی خۆی لە خـۆیدا ئامـانجێک بوو، بەڵام ئەسـتـەمـە بۆ گـەیشـتن بەو ئاواتە شـەڕێکی ئاوا گـەورە بـە شـەڕێکی ڕەوا بناسین. ئەندازیارانی شـەڕەکە وای بۆچوون کە پەیدابوونـی دیمـۆکراسی لە ئێراقـێ ئەنجـامی وەک دۆمـینۆی لێ دەکـەوێتـەوەو لە

---

= بڕیارێکی بێی وان نەداو هـەمیشـە قایلی دەکردن و هیـچی بەسەردا نەدەسەپاندن. سـەرۆک بوش بەتایبـەتـی داوای کرد دیمیلیـۆ بۆ ئێـراقێ بچـێت. بەڵام ئـەمێـریکییـەکـان سـوودیان لە شارەزاییەکەی وەرنەگرت. چەند حـەفتەیێکی مابوو بچێتەوەو پۆستـی دەسەڵاتی کۆمسیۆنی باڵای نەتەوە یەکگرتووەکانی مافەکانی مرۆڤ بگرێتە دەست کە کوژرا.

دوای ئەویّ ڕژیمە دکتاتۆرییەکانی سوریاو ئێران و عارەبستانی سعودیو میسریش یەک یەک دەڕووخێن. ئەگەر دیمۆکراسی لە ئێراقیّ چەخماخەی شۆڕشێکی دیمۆکراسی سەرتاسەری لە ڕۆژهەڵاتی ناڤین بەرپا بکردایە، ئەو کاتە قەرەبووی ئەو هەموو زیانەی دەکردەوە کە لە شەڕی ئێراقیدا دەکریّ. جیهانێکی عارەبی دیمۆکراسی ڕەنگە ببێتە هاوپەیمان لە شەڕی دژەتیرۆر، نەک ببێتە کانیێک و تیرۆریستی تێدا بزێتەوە. ڕەنگە بکریّ ئێرانێکی دیمۆکراسی قایل بکریّ واز لە بەرنامەی ئەتۆمی خۆی بێنیّ. بەڵام ئەگەر وازیش نەهێنیّ، خۆ ئێرانێکی لایەنگری ڕۆژئاوا ڕەنگە لەو چەند مەلایە دژە ئەمێریکییانە باشتر بیّ. لە کۆتاییشدا، وەک ئەوەی کە گەلێک لە ئەندازیارانی شەڕەکە بیریان لیّ کردەوە، ڕەنگبوو مرۆڤ لە ڕۆژهەڵاتێکی ناوەڕاستی لای ڕۆژئاوادا، بیری لە ئاشتییەکی سەرتاسەری لە نێوان ئیسرائیلو وڵاتە عارەبییەکان بکردایەوە.

بۆ ئەوەش شەڕی ئێراقی لەگەڵ دیمۆکراسییەکی فرەوانتر بگونجابا، دەبوو سیّ مەرجی یەک لەدوای یەکی لیّ بەدی بهاتبا: یەکەم؛ دەبوو ئێراق لە دیمۆکراسییەتەکەی سەربکەوتبا. دووەم؛ پێویست بوو دیمۆکراسی لە ئێراقیّ پرۆسەی بەدیمۆکراسی کردنی وڵاتانی دیکەی ڕۆژهەڵاتی ناڤینی هان بدا. سێیەمیش؛ حکومەتە دیمۆکراسییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، دەبوو بەو شێوەیە هەڵسوکەوت بکەن کە بە زۆری لە بەرژەوەندی وڵاتە یەکگرتووەکان با، نەک بەو شێوەیەی کە ئۆتۆکراتەکانی پێشان بەڕێوەیان دەبرد. بەڕێوەبەرایەتی بوش، ساکارانە، وای بۆ دەچوو کە ئەو پرۆسەیە هەنگاو بەهەنگاو بەڕێوە بچیّ و نە هیچ پلانێکی دانا بۆ ئەوەی بواری سەرکەوتنی گواستنەوەو دامەزراندنی دیمۆکراسی لە ئێراقیّ پتر بکا. نە توێژینەوەی تەواوی دەربارەی بارودۆخی ئێراقیّ کرد تا بزانیّ ئایا دەشیّ دەوڵەتێکی دیمۆکراسی یەکگرتوو لە ئێراقیدا دروست بکا کە وڵاتانی دیکەی ڕۆژهەڵاتی ناڤین خۆزگە بخوازن کە وەک ئەویان لیّ بیّ. چونکە ئەو سیناریۆیانەی بۆ ئێراقی پاش سەددام ڕێک خرابوون، هەموو ئەوپەڕ گەشبین بوون، بۆیّ بەڕێوەبەرایەتی هەرگیز بیری لە سیناریۆی ئەگەری سەرنەکەوتن نەکردەوە. وڵاتە عارەبییەکانی دی چۆن پرۆسەی دروستکردنی ئەو دیمۆکراسییە دەبینن کە

ئەمێریکا لە ئێراقێ سەرکردایەتی دەکا و بووەتە هۆی بەرپابوونی شەڕێکی ناوخۆی مەزهەبی و جیابوونەوەی بەشێکی وڵاتەکەو ئێرانیش دەستی بە سەرتا سەری بەشەکەی تری داگرتووە؟

تەنانەت ئەگەر ئێراق ببایە ئەو دیمۆکراسییە لایەنگرەی ڕۆژئاواش وەک ئەوەی بەڕێوەبەرایەتی دەیەوێ، خۆ جادوو نەبوو تا کاریگەرییەکی ئەرێنی پەیدا بکردایە. بێگومان ناشێ ئەم هەڵوێستە تاقی بکرێتەوە. بەڵام تەنیا دەکرێ ئەوە بڵێین کە ئەو هەڵبژاردنانەی لەوەتی شەڕی ئێراقێ لە ڕۆژهەڵاتی ناڤیندا ئەنجام دراوە، هێشتا ئەو ئەنجامانەی لێ پەیدا نەبووە کە بەڕێوەبەرایەتی بوش چاوەڕێی دەکرد. لە ٢٠٠٥، دەنگدەران لە ئێران، محمد خاتەمی نەرمڕۆیان لاداو دەنگیان بەو محمود ئەحمەدی نەژادی گەورە پارێزگار دا، کە بە ئاشکرا گومانی لە ڕاستی ڕوودانی هۆلۆکۆست دەربڕی و داوای لەناوبردنی ئیسرائیلی کردو بە خێراییش پرۆگرامی ئەتۆمی ئێرانی بۆ پێشەوە برد. لە فەلەستینیش، بزووتنەوەی ڕادیکاڵی ئیسلامی حەماس سەرکەوتنێکی وای بەدەست هێنا کە جێی نیگەرانییە. ئەو بزووتنەوەیە دان بە مافی بوونی ئیسرائیل دانانێ و لەو خۆتەقاندنەوەو کوشتارانەش بەرپرسیارە کە لە ئیسرائیل دەکرێ.

ساڵێک لە دوای گوتارەکەی "تەوەری شەیتان"، سەرۆک بوش لەگەڵ سێ ئێراقی ئەمێریکی کۆبووەوە؛ عدنان مەکیەی نووسەرو حاتم مخلصی دکتۆرو ڕەند ڕەحیم، کە لەپاش ڕووخانی ڕژێم یەکەم ئافرەت بوو کە پۆستی نمایندەی ئێراقێی لە وڵاتە یەکگرتووەکان، وەرگرت. هەر یەکێکیان بیروبۆچوونی خۆی سەبارەت بە ئێراقی دوای سەددامی، بۆ سەرۆک باس کردو هەرسێک باسی سوننەو شیعەیان بۆی کرد. بۆیان دەرکەوت کە سەرۆک لە دەربارەی ئەو زاراوانە هیچی لەکن نەبوو. بۆیێ زۆربەی کۆبوونەوەکەیان بەوە بەسەر برد لەسەرۆک بگەیەنن کە ئیسلام دوو مەزهەبی سەرەکی هەیە[٣٨].

وا دەردەکەوێ کە سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکان، تا دوو مانگ بەر لەوەی فەرمان بە لەشکرەکانی ئەمێریکا بدا تا بچن ئێراقێ بگرن، هیچی دەربارەی ئەو پارچانەی ناو

---

(٣٨) دوو لەوانەی لەکۆبوونەوەکە بەشدار ببوون، ڕاستەوخۆ ئەمەیان بۆ گێڕامەوە.

ئێـراقێ نەدەزانـی کـە مـێـژووو سـیـاسـەتی ئەو وەڵاتەیان دروست کـردووە. ڕەنگە نەیزانیـبێ زۆر لە گێن بوو ئێران لەدوای سەددامی شـوێن پێی لە ئێراقێ توند بێ، ڕەنگە پێشبینی ئەوەشی نەکردبێ کە زۆر لە گێن بوو سوپای ئەمێریکا لە ناو گێژەنی شەڕی ناوخۆی ئەو دوو مەزهەبە بچەقێ کە نەیدەزانی هەر هەبوون.

من ئەو چیرۆکە سـەیرە بۆ ئەوە ناگێڕمـەوە تا باسی سـاوولکەیی سـەرۆکـتـان بۆ بکەم، بەڵکو بۆ ئەوەیە ئاشکرای بکا کـە سـەرکـردایەتی ئـەمـێـریکا لە پێشی شـەڕ، چەند کەمی دەربـارەی سروشـتی کۆمـەڵی ئێـراقێی دەزانێو چەند گرفـتی گـەورە لە دوای ڕووخـانی سـەددام حـوسـێنیش تـووشـی وڵاتە یەککگرتووەکـان دێ. تەنانەت لە ٢٠٠٦و لەو دەمــەی کــە شــەڕی ناوخــۆ لە ئێـراقێ بـەردەوامـە، سـەرۆک و گـەورە ڕاوێژکـارانی باسی گـەلی ئێراقی دەکەن وەک ئەوەی کـە یەک نەتەوەی هاوڕەگـەزی وەک فرەنسییەکان یان تەنانەت وەک ئەمێریکییەکان بێ.

لەم بارەیەوە من عـەیب لەو لووت بەرزییە دەگـرم کە هـەمـوو بەڕێوەبـەرایەتی بوشی گرتۆتەوە. هەر لە سـەرۆک و جێگری سـەرۆکەوەڕا تا دەگـاتە ئەو پارێزگـارە تازانەی ناو پێنتـاگـۆن کـە ئەندازیـاری شـەڕەکـەن، هەمـوویان باوەڕیـان وابوو کـە ئێـراق لاپەڕەیێکی سپی بوو و وڵاتە یەککگرتووەکان بە کەیفی خۆی دەیتوانی کۆمـەڵگەیێکی دیمـۆکراتی فـرەلایەنەی لێ بسـەپێنـێ. ئەم لەخـۆبایـیـبـوونە بوو هێنایانیـە سـەر ئەو باوەڕە کـە بە مـانـدووبوونێکی کـەم و پلاندانانی وڵاتە یـەککگرتووەکـان ئەمـە هەمـووی جێبەجێ دەکراو بۆیێ پێویستی نەدەکرد هیـچ دەربارەی ئێراقێ بزانن. لە ڕاستیدا، لە کـاتی سـتـاف دانانی حـوکمـڕانی دوای شـەڕ لە ئێراقێ، بەڕێوەبەرایەتی گرانایی خـۆی خسـتـە سـەر ئەوانەی کە ئایدیۆلۆژیای دیـمـۆکراسـی ئەمێریکیـان هەبوو بۆ ئەوەی لە ئێـراقـێی بسـەپێنن و هـەمـوو کـارمـەندە شـارەزایەکـانی کـاروباری دەرەوە لەوانەی کـە ئاشنای ئێـراق بوون و شـارەزاییـیـان لە کـاروباری جـیـهـانی عـارەبیدا هەبوو، هەموویان لە ئیشەکە دوورخستنەوە.

ئۆباڵی فریودانی بەڕێوەبەرایەتی بەوەی کە وەرگـرتنی دەسـەڵات لە ئێراقێ کارێکی ئاسـان بوو، دەکەوێتە ئەستـۆی ئەحـمـەد چەلەبییـەوە. گوایا ئەحـمـەد چەلەبی بووە کە چینی پارێزگـارە تـازەکـانی پێنتـاگـۆنی قـەنـاعـەت پێـهـێناوە کـە سـوپـای وڵاتە

یەکگرتووەکان لە ئێراقێ بە گوڵ و گوڵزارەوە پێشوازی لێ دەکرێ. ئەو یاخیبووانەی کە لە ڕێگەی کۆنگرەی نیشتمانی ئێراقییەوە کە وڵاتە یەکگرتووەکان دارایییەکەی بۆی مسۆگەر دەکردو بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان هێندران، زانیارییان دەربارەی چەکە کۆمەڵکوژەکانی ڕژیم پێشکەش کردو پاشان دەرکەوت هیچی ڕاست نەبوو. چەلەبی بە نیازەوە هیچی دەربارەی پەرشو بڵاوی ئیتنی و ئایینی ئێراقێ بۆ ئەو کارمەندە ئەمێریکییانە نەگێڕاوە کە بە توندی پشتیوانییان دەکرد. هەروەها هیچ شتێکی دەربارەی ئەگەری بەرپابوونی گیروگرفتی دوای داگیرکردنەکە نەکرد. چەلەبی بوو وای لە پارێزگارە تازەکان گەیاند کە داهاتی نەفتی ئێراقێ تێرای ئاوەدانکردنەوەی وڵات دەکا. دواجاریش کە ئێراق ببێتە وڵاتێکی دیمۆکراسی، ئەوە بێ یەکەو دووە لێکردن پەیوەندی دیپلۆماسی لەگەڵ ئیسرائیل، دەکات.

ئەحمەد چەلەبی لە بنەماڵەیێکی دەوڵەمەندی شیعەی شاری بەغدا لە ١٩٤٥، بووە. لە ماڵێکی بان جزیری کۆلۆنیاڵی گەورە بووە کە مەلەوانگەیێکی تایبەتی لە قەوارەی مەلەوانگەیێکی ئۆلۆمپی، لەناو زەوی خۆیان، لەناو باخێکی دارخورمای، لەبەر دەری ماڵێدا، هەبووە. لە ١٩٥٨، کە چەند ئەفسەرێکی ئێراقی ڕژیمی پاشایەتییان لە ئێراقێ ڕووخاند، ئەحمەد چەلەبی لە بەغدا دەرچوو، ئیتر بۆ ماوەی چل و پێنج ساڵ نەهاتەوە ئێراقێ. پاش ئەوەی لە پەیمانگەی تەکنۆلۆژی ماساچوستس، پلەیێکی لە میکانیک وەرگرت و (پی ئێچ دی .Ph.D) واتا پلەی دکتۆراشی لە زانکۆی شیکاگۆ وەرگرت، لە زانکۆی ئەمێریکی لە بەیروت وانەی بە قوتابیان گوت. ئینجا دەستی بە بزنسی تایبەتی خۆی کاری بانکسازی کرد. پارەیێکی زۆری پەیداکرد. لە ١٩٨٠کان، لە ئوردن بانکی پێترای بەڕێوە بردو کاتێکیش کە بانکەکە تووشی زیانێکی زۆر هات، دەسەڵاتدارانی ئوردنی تاوانی فێڵبازییان خستە ئەستۆیەوە، بە غیابی بۆ ماوەیێکی درێژ حوکمی زیندانکردنیان دا.

لە ١٩٨٦، لە ڕێگەی جودیت کیپەرەوە چەلەبیم بینی. کیپەر زانایێکی پەیمانگەی بروکنگزەو وەکو پسپۆڕیش لە ڕۆژهەڵاتی ناڤیندا زۆر ناسراوە. زیرەکی ئەو کابرایەو بیرتیژی و پابەند بوونی بە لادانی سەددام حوسێنی کە لەوکاتدا خەڵک زۆر بۆی عەوداڵ نەبوو، سەرنجی منیان بۆی ڕاکێشا. هەرگیز هێندەم دەربارەی بانکی پێترا

نەزانیبوو بۆ ئەوەی هەڵوێستی تایبەتی خۆی لێ وەرگرم؛ بەڵام ڕاڤەکردنەکەی چەلەبیم لەلا پەسند بوو کە گوتی سەددام حوسێن وای کرد ئوردن ئەم حوکمەی بدا، چونکە ئەوکات ئوردن هاوپەیمانێکی نزیکی سەددامی بوو.

له ۱۹۸۰کاندا چەلەبی تێگەیشت کە ڕێی چوونە بەغدا بە واشنتندا تێدەپەڕێ. بۆیێ بڕیاری دا دۆستایەتی لەگەڵ کۆمەڵەی سیاسەتی دەرەوەی ئەمێریکی سازبکا، منیش خۆم بە یەکێک لەو برادەرانەی دەزانم. هەندێ لەو کەسانەش کە برادەرایەتی لەگەڵیاندا کرد: پۆول وولفووەز؛ کارمەندی پێشووی بەڕێوەبەرایەتی ڕێیگن، ڕێچەرد پێرڵ؛ کارمەندی کۆنگرێس، لویس لیبی (سکووتەر)و دک چێنی بوون. چێنی ڕۆڵێکی بەرز لە دووەمین بەڕێوەبەرایەتی بوش دەگێڕێ. چەلەبی وەک زۆران ئەو هەڵەیەی نەکرد کە تەنیا دڵی گەورە کاربەدەستە ناودارەکان ڕابگرێ. زانی کە هەندێ لە گرینگترین گەمەزانەکان، بە تایبەتیش ئەگەر بتەوێ ڕەچاوی دوور بکەی، دەستەی کارمەندانی کۆنگرێس و پسپۆرانی کاروباری دەرەوە، ئەوانەی لە کار نامێنن و ڕۆژنامەنووسە ناودارەکان بوون.

چەلەبی کاری بۆ یەکخستنی ئۆپۆزیسیۆنی ئێراقی کرد، کە ئەو پارتە شیعە مەزهەبانەی بنکە لە ئێرانێ و پارتە کوردییە نەتەوەییە نەیارەکان و بەعسییە یاخییەکانی بنکە لە سووریاو سوننە توندڕۆیەکان و چەند کەسێکی هەواداری پاشایەتی و حزبی شیوعی ئێراقی لەخۆ دەگرت. هەرچەندە ئۆپۆزیسیۆن چەندین گرووپی جیاواز بوون، بەڵام چەلەبی توانی هەموویان لەسەر بنەمای پرۆگرامێکی دژی سەددامی لەناو یەک ژووردا کۆبکاتەوە. چەلەبی وەک زۆربەی عارەبەکانی دیکە نەبوو و زانی کورد گرینگایەتییەکی تایبەتییان بۆ ئۆپۆزیسیۆنی دەبێ. چونکە خاک و هێزی چەکداریان هەبوو. لە میانی کۆنگرەی سەلاحەدینی ۱۹۹۲، چەلەبی توانی سەرکردە عارەبەکانی ئۆپۆزیسیۆنی ئێراقێ قایل بکا دان بە فیدراڵیزم بۆ کوردستان بێنن. لە ۱۹۹۰کانیشدا چەند ساڵێکی لە کوردستانی ئێراقێ بەسەر بردو هەوڵی دا سەرهەڵدانێک لەدژی سەددامی دروست بکا. تەنانەت ئەو ئێراقییانەی هەمیشە ڕەخنەی لێ دەگرن، ئەوانیش باسی ئازایەتی ئەو پیاوە دەگێڕنەوە.

چەلەبی ڕووی پیسی سەددام حوسێنی بە هەموو دونیا نیشان دا (ئیشەکە

زەحمـەتیش نەبوو)و گـۆڕینی ڕژێمیـشی کـردە کـارێکی سـانا. زانی کـە زۆر لە ڕۆژنامـەنووسـان کـەمـتـر گـوێ بـە وردەکـارە ڕاسـتـەقـینـەکـان دەدەن کـاتێک کـە زانیارییەکی بچووکیان بەبەردەست دەکەوێ. زانی کێنە ئەوانەی لەکورتی دەیبڕنەوەو لەتلەت زانیـاری بۆ دەدرکـاندن، تا بەنەرمی بەدوایدا بچن و لێی لەهەڵڵا نەدەن. بیـرۆکەی ڕووخـانی ڕژێمـی بتـەوترکـردو، جـەختـی دەکـردەوە ئەگـەر نـاوچـەی ئارامی دژەفڕین لە باکـووردا فرەوانتر بکرێو نـاوچـەیێکی هاوشێـوەش لە باشووردا بکرێ، ئەوە کاریگەری دۆمینۆی لەسەر سـەددامی دەبێ و دەیڕووخێنێ. لە ٢٠٠٢ش کاتێک کـە شـەڕ نزیک دەبـووەوە، هەمـیـشـە بۆ ئەمـێـریکییـەکـانی دووپاتی دەکـردەوە کـە لەشکرەکەیان وەک ڕزگارکاران پێشوازییان لێ دەکرێ.

چەلەبی بە تەواوەتـی سەرچیغ نەچووبوو. هەندێ ئێراقی بەڕاسـتـی هەلهەلەیان بۆ ئەمێـریکییـەکـان لێدا کـاتێک کە لە پایتـەخت نزیک دەکەوتنەوە (دوای پێنج ڕۆژ لە ڕووخـانی سەددامی، لە بەغدا گوڵیان پێشکەش کردم). چەلەبی هەرگیز پشـتیـوانی لەداگیرکـردنی ئێراقێی لەلایەنی ئەمێریکاوە نەکردووە. پێشتر گوتبووی بەرگرییەکی زۆری داگیـرکردنەکە دەکرێ. لەو باوەڕەدابوو کە دەبێ زوو دەسەلآت بۆ حکومـەتێکی کـاتی ئێراقـی بگەڕێتـەوە. زۆر کـۆشـشـی کـرد کـە پێنتـاگـۆن سوپایێکی ئێـراقی لە بانشگەو (کورد) مـەشق بدا بۆ ئەوەی شـانبـەشـانی هێزەکـانی ئەمێـریکا شـەڕ بکا، بەلآم ئەم هـەوڵەی سـەری نەگـرت. ویسـتی ڕۆڵێکی سـەرەکی لە حکومـەتێکی کـاتی ئێراقی پێ بسپێرن، خۆ ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە بیرو بۆچوونەکانی هەڵە بوون.

بە بـۆچوونـی خــۆم، نابـێ ڕۆڵی ئەحــمــەد چەلەبی لەو کــردەوانەی بـوونە هـۆی داگـیـرکـردنی ئێـراقێ لـەبیـر بکرێ. ئەگـەر ئەو نەبوایە، ڕەنگبـوو سـوپای ئەمـێـریکی ئێـستـا لە ئێراقێ نەبا. ئەمـە مـانای ئەوە نییە کە چەلەبی کـابرایێکی فێڵبـازە، وەک ئەوەی هـەندێک لـە ڕەخنەگرانی ناوزەدی دەکـەن. چەلەبی بیست سـاڵ کـاری کرد تا توانی قـەنـاعـەت بە نوخبـەی سیـاسـەتی دەرەوەی ئەمـێریکی بێنێ کە بۆ ئێـراقێکی دێمۆکراتی و دێمۆکراسی عارەبی کار بکەن. هەموو زانیارییەکانی خۆی بەشێوەیێک ڕێکخست کـە پشـتیـوانی کـردنی شـەڕ ڕشـتـتـر بکا. ڕەنگە لـە هەندێ لایەنەوە درۆی کردبێ.

ئەحمەد چەلەبی هیچ چاکەیێکی ئەمێریکای لەچاو نەبوو. تەنیا ئەوەبوو کە کابرایێکی ئێراقی بوو و دەیویست وڵاتەکەی خۆی ڕزگار بکا. سوپایێکی تایبەتی نەبوو، بۆیێ ناچار بوو وڵاتە یەکگرتووەکان قایل بکا تا لەشکری پێ بدا. دوای ساڵێک لە شەڕ، چەلەبی بە سەندیێ تێلگرافی گوت: "ئێمە پاڵەوانی بەهەڵەداچووین. ئەوەی بەلای ئێمەوە گرینگە ئەوەیە کە ئێمە بە تەواوەتی سەرکەوتووین. سەددامی دکتاتۆر نەماو ئەمێریکییەکانیش وا لە بەغدان. ئەوەی پێشان [بەر لە شەڕی] دەگوترا ئێستا گرینگ نییە."

هەزاران بانشگەکراو هاتنە واشنتن و داوای پارمەتییان لە وڵاتە یەکگرتووەکان دەکرد تا بتوانن بۆ وڵاتی خۆیان بچنەوە. کە وا دەبوو چاپەیێک یان قاوەیێکیان پێ دەدرا. چەلەبی لەشکری وەرگرت و سەدان ملیۆن دۆلاری خەرجی وڵاتە یەکگرتووەکانی پێ درا بۆ ئەوەی ئێراقێکی نوێ دروست بکا. عەیب لە چەلەبی ناگیرێ بە هۆی ئەو درۆیانەی کە کردبووی، بەڵکو عەیب لەو کارمەندە ئەمێریکییانە دەگیرێ کە بێ لێپێچینەوە لەگەڵدا کردن پێیان باوڕ کردبوو.

جێگری سەرۆکی، چێنی، یەکێک بوو لەوانەی باوەڕیان پێی کرد. چێنی لە ئێوارەی پێش هەڵگیرسانی شەڕەکە، بە تم ڕوسێرتی تێلیڤزیۆنی ئێن بی سی گوت: "من خۆم لەگەڵ گەلێک لە ئێراقییان قسەم کردووە، لە کۆشکی سپی پێشوازیم لێ کردن...ئەوەی لەوان تێگەیشتم ئەوەیە کە گەلی ئێراقێ بێ سێ و دوو لێکردن دەیەوێ کۆڵی لە کۆڵی سەددام حوسێنی ببێتەوەو وەک ڕزگارکەر پێشوازیمان لێ دەکەن." بەقسەی چێنی دەبێ چەلەبی تەنیا ئێراقییەک نەبووبێ کە ئەمێریکییەکانی بۆ ئەو کارە هاندابێ. لەو دەمەی کە کاتی شەڕەکە نزیک بووەوە سەرکردەکانی کوردو سەرکردەکانی شیعە هێڵێکی سیاسییان بۆ بەردەم هێناو لە بەڕێوەبەرایەتی بوشیان خواست گوێیان لێ ڕابگرێ. لە میانی کۆبوونەوەکانی لە کۆشکی سپی و لە وەزارەتی دەرەوەدا کران، سەرکردە کوردەکانیش چوونە ڕیزی سەرانی شیعەکان و جەختیان لەسەر پابەندبوونیان بە ئێراقێکی یەکگرتووی دیمۆکراتی کردەوە. هەمان قسەشیان بۆ میدیاکان دووپات کردەوە، بێ ژمار لە کەناڵەکانی سی ئێن ئێن و بی بی سی ئەم قسانەیان جەخت کردنەوە. بەڵام ئەگەر یەکێک بە چاکی گوێی لێ

ڕاگرتبان، هەستی پێ دەکرد کە قسەکانیان لە ناخیانەوە نەبوو. بەڕێوەبەرایەتی بوش ئەحمەد چەلەبی لە هەموو ئێراقییەکان پتر نەدەویست، بەڵکو بەرهەم ساڵحی لە هەمووان پتر گەرەک بوو. بەرهەم ساڵح سەرکردەیێکی کوردە، لە بریتانیا پەروەردە بووەو خوێندوویەتیو بەر لەوەی بگەڕێتەوە سلێمانیو ببێتە دووەم سەرۆک وەزیرانی کوردستان[٢٩]، دە ساڵ بوو لە واشنتن، نمایندەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوو. لە میانی قسەکانی بەر لەشەڕ دەکران، بەرهەم بە شێوەیێکی بەردەوام لە تێلیڤزیۆنی ئەمێریکا دەردەکەوتو بە ڕەهاییەوە بە شان و شەوکەتی سەرۆک بوش و ئەو هەوڵانەی هەڵدەدا کە بۆ ئازادکردنی گەلی ئێراقیّ دەیدا. باسی بە ئێراقی بوونی خۆی بۆ بی بی سی بەم جۆرە کرد: "تا ئێمەی کورد ناچار بکرێین لە چوارچێوەی ئێراقێدا بژین، دەمەوێ هاوڵاتییەکی تەواوی وڵاتی خۆم بم." ئەم قسانەی کە ئەو کابرایەی بەڕێوەبەرایەتی بوش لە ٢٠٠٤دا کردییە بریکاری سەرۆک وەزیرانی ئێراقیّ، هەر ئەوەتە بۆنی وڵاتپارێزی لێ دێ.

ئەوەی پەیوەندیشی بە شیعەکانی ئێراقێوە هەبوو، ئەو خۆزگەیە بوو کە ئەندازیارانی شەڕەکە خواستیان کە بێتە دی. چونکە نەجەف و کەربەلا کە پیرۆزترین دوو شوێنی شیعەکانن، لە ئێراقێنە، بۆیێ ئێراقی ئازاد، بۆ شیعەکان، شوێنی ئێران دەگرێتەوەو دەبێتە چەقی دونیای شیعەکان. شیعە ئێراقییەکانیش دەبنە پشتیوانی ڕۆژئاواو دێمۆکراتی پەیڕەو دەکەن و ئەمەش ستراتیژێکی ئەوپەڕ گرینگە، چونکە بنەمای حوکمی مەلایەکان لە ئێرانیّ هەڵدەتەکێنێ.

بریکاری وەزیری بەرگری، وۆڵفویتز، کەمێک پاش ڕووخانی بەغدا، ئاوای هەڵسەنگاند:

زۆر چاک بۆمان ڕوون بووەتەوە کە ئێراق، بە تایبەتیش دانیشتوانە شیعەکەی

(٢٩) پارتی دیمۆکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان دوو ناوچەی جیاوازی ناو کوردستانیان کۆنترۆڵ کردبوو، ئەمەش میراتێکی شەڕی ناوخۆی کوردستانی ١٩٩٠کانی بەجێ هێشت. هەر بەشێکیان کابینێت و سەرۆک وەزیرانی تایبەتی خۆی هەبوو، بەڵام هەردوو حکومەت هەر یەک ناویان بەکار دێناو ئەویش حکومەتی هەرێمی کوردستان بوو. لە ٢٠٠٣، هەردوو حکومەت لە نزیکەوەڕا هاریکارییان کرد. لە ئایاری ٢٠٠٦، هەردووک یەکیان گرتەوە.

ئێراقێ، له لایێکرا سەرچاوەی مەترسین بۆ ئێرانێ و له لایێکی تریشەوە هەلێک بۆ ئێرانییەکان دەرەخسێنن. واش تێبگەم مەترسییەکەیان پترە لەوەی کە هەلێکی باشیان بۆ پەیدا بکەن. بەلام کرۆکی مەترسییەکە بۆیان گەلێک دەبێ ئەگەر هەوڵ بدەن دەست لە کاروباریان وەربدەن، چونکە دوا شت کە ئەوان بیانەوێ بیبینن پەیدابوونی سەرچاوەیێکی سەربەخۆی دەسەلاتی ڕێبازی شیعەکانە لە ولاتێکدا کە دێمۆکراسی و لایەنگری ڕۆژئاوا بێ، ئەمەش بە ئەگەرێکی زۆر گونجاو دەزانم...هیچ گومانێکم نییە کە ئەمە دەبێتە ململانێیەکی گەورە.

بە زەقی بەڵگەی بە پێچەوانەی ئەم قسانە هەبوو. ئێران پتر لە دوو دەیانە ساڵ پشتیوانی پارتە سەرەکییە شیعەکانی ئێراقیی کرد. ئەو پارتانە بە ئاشکرا دەیانویست دەوڵەتێکی ئیسلامی لە ئێراقێ بسازێنن، ناوی گەورەترینیان کە ئەنجومەنی بالای شۆڕشی ئیسلامییە لە ئێراقێ، ئەمە بە ڕاشکاوی بە دیار دەخا. لە ۱۹۹۱، ئێران هاریکاری شیعەکانی کرد، کەچی بەڕێوەبەرایەتی بوشی یەکەم بە خراپی بەشداری لە تاوانی کوشتنی دەیان هەزار شیعەی کرد. بۆیێ هیچ ئەگەرێکی وا لە ئارادا نەبوو کە ئەو ١٤ ملیۆن شیعەی ئێراقێ کاتێک کە لە بن نیری دەیان ساڵی سەرکوتکاری دەرباز دەبن و بچن مل لەبەر ملی ئەو دەوڵەتە ٦٤ ملیۆن شیعەیەی ئێرانێ بنێن کە هەمیشە جێی متمانەیان بووە. پەیوەندی نێوان مامۆستاو قوتابی دیار بوو، بەلام بەڕێوەبەرایەتی نەیدەویست کەسێک بەو ڕاستییانە نیگەرانی بکات.

لە میانی گەڤاهییەکەی بریکاری وەزیری بەرگری دۆگلەس فێیت کە لە پێش کۆمیتەی پەیوەندییە نێو نەتەوەییەکانی هاوس لە ١٥ی ئایاری ٢٠٠٢ دای، بە چاکی دەردەکەوێ کە چۆن ڕاستییەکان جێی ئومێد خواستنیان گرتۆتەوە. فێیت بە کۆمیتەکەی گوت: "هەندێ لەو گرووپانەی کە ئێران کاری تێیان کردووە خواستیان کە حکومەتێکی ئایینی لە شێوازی ئەوەی تارانێ پێک بێنن. بەلام وا دیارە کە مەلایەکان پشتیوانییەکی زۆریان لەناو جەماوەردا نییە، تەنانەت لە ناو شیعەکانیشدا وەک پێویست خەڵکیان لەگەڵ نییە. نەریتی شیعە کەیفی بە حوکمی پیاوانی ئایینی نایێ. ئەوەی کە خومەینییەکان لە عیراق کردیان شتێکی تازە

بوو...شێوە حوکمی ئێرانیّ زۆر دوورە لە ئێراقیّ پێک بێ، چونکە نەریتی پارسەکان لە هی عارەبەکان جیاوازە.

بەلاّم کە کۆنگرێسمانی دیمۆکراتی ماساچوستس، ویلیەم دیلاهەنت، فشاری خستە سەری و لێی پرسیار کرد ئایا هیچ داتایێکی "بۆ پشتڕاستکردنەوەی قسەکانی" لەکن هەبوو، فێیت شێوا. "لەم دەمەی هیچم بە مێشکی دانایێ، ئەگەر ڕاستی زانستی بنەڕەت لەو بارەیەوە هەبێ. هیچ ڕاستییەکی زانستی بنەڕەتی بەدەستەوە نەبوو، چونکە قسەکانی فێیت کردیانی ڕاست نەبوون. لە هەلبژاردنەکەی کە لە ئێراقیّ کرا، نزیکەی ٨٠ لەسەدای سەرجەم شیعەکانی ئێراقیّ دەنگیان بەو پارتە ئایینییە شیعانە دا کە لەئێرانیّ نزیک بوون و دەیانەویّ کە دەوڵەتێکی ئیسلامی لە ئێراقیدا پێک بێنن. لە پارێزگا شیعەکانی باشووری ئێراقیّ، هەر لە ئێستاوەڕا ئەو حکومەتە دینییە دروست بووە.

مەرگەساتترین لێکدانەوە کە بەڕێوەبەرایەتی بوش سەبارەت بە ئێراقی پاش شەڕ هەیبوو، ئەوەبوو کە لایان کارێکی ئاسان بوو. وایان دەزانی کە نەک هەر تەنیا لەشکری ئەمێریکا وەک ڕزگارکەر پێشوازی لێ دەکریّ، بەڵکو ڕۆژێک لە پاش هەلاتنی سەددام حوسێن و ژەنراڵەکانی، بەوروٚکرات و پۆلیسی ئێراقیّ دێنەوە سەر کارەکانی جارانیان و دەست پێدەکەن ڕاپۆرت بۆ گەورە ئەمێریکییە تازەکانیان دەنووسن. ئاسایش هیچ گرفتێکی نابیّ و پێویستیش ناکا سەربازانی ولاّتە یەکگرتووەکان ڕۆلّی پۆلیس لە شەقامەکاندا بگێڕن. داهاتی نەوتی ئێراقی تێرای خەرجی بەڕێوەبەرایەتی و ئاوەدانکردنەوەشی دەکاو لە دوای شەڕ ئێراق گەنجینەی ولاّتە یەکگرتووەکان داناچۆڕێنیّ.

بیروبۆچوونەکانی هاولاّتییان نەک هەر ماندەلّ کران، بەڵکو قەدەغەش بوو. تۆمی فرانکسی سەرۆکی ناوەندی هێزە شەڕکەرەکان، کە بەرپرسی یەکەمی شەڕی ئێراقیّ بوو، پێنتاگۆن قەدەغەی کردو نەیهێشت لەگەلّ ژەنراڵ ئەنتۆنی زینی، کە پێش ئەو سەرکردەی لەشکر بوو، هیچ ڕاوێژکارییەکی لەگەڵدا بکا. زینی پلانی زۆر گرینگی بۆ باری دوای شەڕی لە ئێراقیّ ڕێک خستبوو، کە فێیسی چوارەمی ئۆپەراسیۆن دەناسریّ. بە پێی ئەو پلانە دەبوو سوپای ئەمێریکا ئاسایش بپارێزیّ،

بەڵام پلانەکە بە بیانووی ئەوەی کە زۆر گەشبین بوو پشتگوێ خرا، بەڵام گۆیا لەبەر ئەوە بووە چونکە لەشکری لەوە پتر دەویست کە ڕەمسفیلد خۆی دایینابوو بۆ ئێراقێی بنێرێ. کە سەرۆک دەستەی سوپا ژەنراڵ ئێریک شینیسکی بە کۆمیتەی هێزە چەکدارەکانی سێنەتی گوت کە ئەو خۆی وای مەزەندە دەکرد کە ئۆپەراسیۆنەکە چەند سەد هەزار سەربازێکی دەویست تا ئێراقێ داگیر بکا (لێرە بە قسەی ئەو لە ٣٠٠,٠٠٠ بۆ ٤٠٠,٠٠٠ سەرباز پێویست بوو)، وۆلفویتز زۆر بە ئاشکرا سەرکۆنەی کردو جەختی کرد کە شینیسکی "شەقاوی زۆر بەربڵاوە." ناشتوانی بۆ داگیرکردنی ئێراقێ لەوە پتر سەرباز ببا کە بیبەزێنێ.

بەڕێوەبەرایەتی هێندە بە ساکارییەوە خۆی بۆ دوای شەڕ سازدابوو، کە هیچ ئاگای لەو لایەنانە نەبوو کە لێی نەدەزانی. فێیت، ئەو پیاوە بوو کە لە پلانی دوای شەڕ بەرپرسیار بوو، لە ١١ی شوباتی ٢٠٠٣دا، پەیمانێکی بە کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی سێنەت دا کە زۆر گومانیان لە سەرتاسەری بارودۆخەکە هەبوو. فێیت لەڕاپۆرتەکەی وای نیشان دا کە هەموو شتێک کۆنترۆڵ کرابوو و گوتی: "بەڕاستی دەمەوێ ئەم کۆمیتەیە دڵنیا بکەمەوە کە کاتێک ئێمە باسی ئەو ئەرکە سەرەکییانە دەکەین کە پێویستە لە دوای شەڕی ئێراقێ بەڕێوە بچن، ئێمە پێشتر بیرمان لێیان کردۆتەوەو بۆ هەموو بارێکی هەر لە ئەویەڕ خراپییەوە تا باشی خۆمان بۆی ئامادە کردووە." کەچی لە ڕاستیدا بەڕێوەبەرایەتی بوش خۆی بۆ هیچ ئەگەرێک ئامادە نەکردبوو، جا با ئەو ئەگەرە زۆر لە گێنیش بووبێ و ئەویش ئەوەبوو کە هەموو دەسەڵاتدارانی وڵات بەجارێک لەگەڵ نەمانی ڕژێم هەموو بزر دەبن. لە تەموزی ٢٠٠٣دا، وۆلفویتز بە ڕۆیتەرزی ڕاگەیاند کە پێنتاگۆن پێشبینی داتەپینی باری ناو بەغدای لە دوای سەددام نەکردبوو. پێویست بوو لەم دارمانەی بارودۆخی ناو بەغدا نەحەپەسابا. چونکە لە ١٩٩١، لە هەندێ ناوچەکانی ئێراقێ کە لە کاتی ڕاپەڕینەکە، ڕژێم کۆنترۆڵی نەما، هەمان شت ڕووی دابوو.

لە یەنایری ٢٠٠٣دا، پەیمانگەی سیاسەتی کۆچی، لە واشنتن داوای لێ کردم لاپەڕەیێک لە دەربارەی سیناریۆی دوای شەڕیان بۆ بنووسم، نووسیمەوەو ئەوانیش پاشان لە زنجیرەی بڵاوکراوەی خۆیان پەخشیان کرد. لە لاپەڕەکەدا نووسیم:

[ئەگەری داتەپینێکی خێرا زۆر لە ئەگەری بەرگری کردن زۆرترە. بە پێی ئەو ئەزموونەی ١٩٩١، من پێشبینی ئاژاوەگێڕی دەکەم پتر لەوەی کە بە ڕێکو پێکی خۆیان بەدەستەوە بدەن.

(لەم بارودۆخەدا) ڕەنگە سوپای ئێراقی خێرا برووخێ و هیچ بەرگرییەک نەکا (هەروەها هیچ دەزگایێکی تریش) نە توانای ئەوەی دەبێ خۆی ڕابگرێ، نە دەشیەوێ کۆنترۆڵی بارەکە بکاو نەهێلێ بشێوێ. شیعەکان لە بەسرەو نەجەف و کەربەلاو ناسریەو هەندێ شاری تری باشوور، ڕادەپەڕن. لە بەغداش شیعەکان یاخی دەبن و شارەکە تالان دەکەن. هەزاران کەس دەمرن و سەدان هەزارانیش بێ ماڵ و بێ جێ دەمێننەوە. لە باکووریش سەرهەڵدان دەبێ، لە میسل شەڕ لە نێوان عارەب و تورکمان و دیانەکان و کورد ڕوودەدا. کوردەکان "سەربەخۆ" دەچنە کەرکووکێ و عارەبە داگیرکەرەکانیش ڕادەکەن. هێزەکانی هاوپەیمانان دەچنە ناو شارەکانی ئێراقێ، بەڵام هیچ بەرپرسێک نادۆزنەوە بۆ ئەوەی ئیشی لەگەڵدا بکەن. ئەگەر هێزی هاوپەیمانان زوو دەست پێنەکەن ئەرکەکانی پۆلیس جێبەجێ بکەن، ناتوانن بەپەلە یاسا سەقامگیرو بارەکە هێور بکەنەوە].

ئەو بۆچوونانەی خۆمم لەگەڵ پلاندەرانی پێنتاگۆن تاوو توێ کرد، کەسانێکی تریش هەبوون هاوبۆچوونی من بوون. گەلێک شارەزا هەمان خاڵیان درکاند، بەڵام بێ سوود بوو. ڕووداوەکان زۆر لەو پێشبینییانەی منیان سەلماند.

هەرچەندە من کارمەندێکی وەزارەتی بەرگری بووم و لە کۆلێژی شەڕی نەتەوەیی پرۆفێسۆر بووم، بەڵام چونکە بۆچوونەکانم لەگەڵ پارێزگارە تازەکان یەکیان نەدەگرتەوە، بۆیێ بە دەگمەن ڕاوێژیان پێ دەکردم(٤٠).

پێنتاگۆن فەرمەکەرەت منی هەر بۆ ئەوە بانگ دەکرد تا باسی خراپەکارییەکانی ڕژیمی سەددام حوسێنی بکەم، بە تایبەتیش بابەتی گازبارانکردنی کوردەکان بگێڕمەوە. (بەڕێوەبەرایەتی پتر حەزی لەوە بوو کە لەلایەنی سیاسییەوە شەرعییەت بە شەڕەکە بدا، نەک باسی ئەوە بکا کە لەدوای شەڕەکە چ دەبێ.) بەڵام لە میانی ئەو هەموو کارتێکەلییە و ئەو زانیارییانەی کە لە دۆستە کوردەکانم بەدەستم

(٤٠) گومانم نییە کە لە بەڕێوەبەرایەتی کلنتنیش، منیان بە کەسێکی بێ توانا دەزانی.

کەوتبوو، هەندێک شارەزاییم لە پرۆسەی پلاندانان پەیدا کردبوو (ئەگەر بکرێ ئەو ناوەی لێ بنێین)، بە تایبەتیش ئەوەی کە پەیوەندی بە باکوورەوە هەبێ. بەڵام کەس متمانەی پێیان نەهات.

لە تەموزی ٢٠٠٢، بە نهێنی سەردانی کوردستانم کرد بۆ ئەوەی سەرکردەکانی کورد ببینم و هەڵسەنگاندنێکی بارودۆخەکە بکەم. کوردەکان لەودەم باوەڕیان وابوو کە زۆر لەگینە شەڕ بقەومێ و چالاکانە خۆیان بۆی ئامادە دەکردو ساز دەدا. ژەنراڵ بابەکر زێباری لە ١٩٦١ڕا هەر پێشمەرگە بووە، منی بردو ژمارەیێکی نوێی پێشمەرگەکانی نیشان دام کە تازە لە کامپی زاوێتە مەشقیان کردبوو. زاوێتە گوندێکە لە سنووری تورکیاوە نزیکە. پێشمەرگەکان دسپلینێکی زۆریان هەبوو، فرە بە پەرۆشەوە بوون و زۆریش شارەزای کونوکەلێنی خاکەکە بوون. چەکی گرانی چاکیان نەبوو، چەند تانک و مووشەک هاوێژو تۆپی فرەچەشنیان هەبوو کە پێش یازدە ساڵ لە سوپای ئێراقییان گرتبوو. بەڵام ئەگەر چەکی گەورەیان پێبدراباو پشتیوانی هێزی ئاسمانی وڵاتە یەککگرتووەکانیان هەبا، لەو باوەڕە ا بووم کە پێشمەرگە ببن بە هاوپەیمانێکی گرینگ لەدژی سەددام حوسێن. ژمارەی پێشمەرگە لە ١٠٠,٠٠٠ پتر بوو.

سەرکردە کوردەکان لەوە نیگەران بوون کە ئەگەر وڵاتە یەککگرتووەکان پەلاماری سەددامی بدا، ڕەنگبێ ئەو تۆڵەی خۆی لەوان بکاتەوەو چەکی کیمیاییان لە دژی بەکار بێنێ. داوایان لێ کردم دەنگیان بگەیەنمە پێنتاگۆن، بۆ ئەوەی دەمامکی گازو جلوبەرگی خۆپاراستن و شرینقای دژە گازەکانی دەماریان بۆ مسۆگەر بکا. ئەوەندی لە کوردستان بووم، چوار یان پێنج غارەڕێی فڕۆکەم لە چەند فڕگەیێک لەو هەرێمەدا، بەرچاو کەوت.

بۆ ئەوەی چم دیتبوو بۆیان باس بکەم و بابەتی شەڕیش تێکەولێکە بکەین، هەستام چوومە پێنتاگۆن. لەوێ چوار بابەتم وروژاند: مەترسی لە سەددامی دەکرا بۆ وەڵامدانەوەی داگیرکردنی ئێراقێ لەلایەنی وڵاتە یەککگرتووەکانەوە، ڕەنگبوو چەکە کیمیاییەکان لە دژی شارە کوردییەکان بەکار بێنێ. مەترسی هەڵگیرسانی شەڕی کوردو تورک هەبوو، ئەگەر پێنتاگۆن لە پلانەکەی بەردەوام بێ و ڕێگەی هێزەکانی

تورک بدا بۆ ناو باکووری ئێراقێ بچن، ئەگەری ململانێی ڕەگەزی لە کەرکووک کەم بکرێتەوە، ئەمەش بەوەوە جێبەجێ دەبێ کە پلانێکی بەپەلە ڕێکبخرێ بۆ ئەوەی داواکاری ئەو کوردانە چارەسەر بکات کە سەددام لە میانی پرۆسەی بەعارەبکردن، زەوییەکانی لێ سەندبوون؛ ئەگەری داتەپینی تەواوی یاساو ڕێسای گشتی لە دوای ڕووخانی ڕژیم، تاووتوێ بکرێ.

خواستی سەرانی کوردستانم گەیاندە پێنتاگۆن کە داوای دەمامکی گاز کەرستەی خۆپاراستن و دەرمانیان کردبوو. لە ئەنجامی داگیرکردنی ئێراق، سەددام لە حوکم لادەدرێ و ڕەنگە بشکوژرێ، بۆیێ کەس ناتوانێ بڵێ سەددام لەو دەمەدا چەکی کیمیایی بەکار ناهێنێ، بە تایبەتیش ئێمە هەموو دەمانگوت هەیبوو. هەرچەندە ئێراق دەیویست بە شێوەیێکی سەرەکی دەست لە وڵاتە یەکگرتووەکان و ئیسرائیل بوەشێنێ، بەڵام ئەو جۆرە سستەمی چەک هەڵدانەی نەبوو کە ئەو دوو وڵاتە بتەنێ و چەکە کیمیاییەکانیش تەنیا جێی نیگەرانی بوون ئەگینا لە بەرانبەر ئەو هەموو کەرستە سەربازییە پێشکەوتووانەی وڵاتە یەکگرتووەکان هەیبوو، ئەو چەکە کیمیاییانە هەڕەشەیێکی ڕاستەقینە نەبوون. لەبەر ئەمەش چونکە گەورە شارە کوردیەکانیان نیشانی ئاسان بوون تا بپێکرێن، بۆیە تۆیە ئێراقییەکان نیشانیان لێ گرتبوون. هاوقسەکانی پێنتاگۆنم زۆر بە ڕێزەوە گوێیان بۆ شل کردم، بەڵام هیچیان نەکرد. لە ئۆکتۆبەر، سی ئای ئێی مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی سواری فڕۆکە کردن و هێنراینە وڵاتە یەکگرتووەکان بۆ ئەوەی زنجیرەیێک کۆبوونەوەی نهێنییان لەگەڵدا بکەن. ئەوان کەرەستەی پاراستنیان ڕاستەوخۆ لە وەزیر ڕەمسفیڵدو گەورە کارمەندەکانی دیکە خواست.

لە کۆتاییدا، بەڕێوەبەرایەتی گوتی کە هەزار دەمامکی گاز تەسلیمی بارزانی دەکا بۆ ئەوەی سەرکردە کوردەکان و خانەوادەکانیان و زێرەڤانەکانیان بپارێزن. بارزانی پێشنیارەکەی ڕەت کردەوە. خۆشبەختانە، ئێراق چەکی کیمیایی نەبوو. ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکەی لێ دەرکە، ئەگەر ئێراق ژارەکانی هەباو بەکاری بهێنابا، دەیان هەزار کەسی تریش دەکوژران.

پلانەکەی پێنتاگۆنی لە دوو بەرە هەڵمەتی دەگرتەوە. هێزە سەرەکییەکەی ئەمێریکا

له کوێتـەوەڕا بەرەو باکوور هەڵدەکشێ و خۆی لە چوونە ناو شـارەکـانی باشووری ئێراقێ دەدزێتەوەو بەرەو بەغدا دێ. لە هەمـان کاتیشدا، کەرتی زرێپۆشی چوارەم، لە تورکـیـاوەڕا بەرەو باشـوور دێ و ڕووەو پایتـەخت دەچێ. حکومـەتی تورکی بە دوودڵییـەوە سـەری بۆ پلانەکە دانواند، بەڵام داوای کرد کە ڕێگە بە سوپای تورکیا بدرێ تا داخلی باکووری ئێراقێ ببێ، بەڕواڵەتەوە بۆ ئەوەی بوو نەهێڵێ ئەمجارەش شەپۆلی پەنابەندەکان بۆ وڵاتەکەی بچێ. بەڵام ئاشکرا بوو کە خواستەکەی تورکیا هیچ پەیوەندییـەکی بە کێشـەی پەنابەرانەوە نەبوو، چونکە ناوچەکە خـۆی لە ژێر کۆنترۆڵی کوردەکان دابوو، هیچ هێمایێکیش لە ئارادا نەبوو کە سوپای ئێراقێ بچێ هێرش بکاتە سەر ئەو هێزە ئەمێریکییانەی کە لە باکوورەوەڕا دێن تا بەربەرچیان بداتەوە. تورکیا دەیویست بێتە باکووری ئێراقێ تا لەدوای شەڕەکە کوردەکان ناچار بکا ملکەچ بن و بۆ بنبـاری حکومەتی ناوەندی لە بەغدا، بچنەوە. لە بەرانبـەر ئەوەی تورکیا ڕێ بۆ گواستنەوەی کەرتی زرێپۆشی چوارەم بدا، بەڕێوەبەرایەتی بوش زۆر شـادمـان بـوو کە دڵی ئەو هاوپەیمانـەی لە نێیتـۆ (ڕێکخـراوی هاوپەیمانـی باکووری ئەتلەسی) ڕابگرێ.

لە ناو پێنتـاگۆن گرفتەکەم ڕاڤە کردو گوتم لەکاتێکدا تورکیا دێ و ئازادییـەکەیان لێ دەستێنێتـەوە، کوردەکان ناچن خۆیان بەکوشتن بدەن. بێگومـان ئەو قسـانەی کە تورکیـا دەربارەی پەنابەران دەیکا کوردەکان فـریو نادا. پێشـمـەرگەکـانی بارزانی کۆنترۆڵی هەرێمە هاوسنوورەکەی وڵاتی تورکیا دەکەن و بارزانیش بەڕاشکاوی پێی گوتم هێزی پێشمەرگە پەلاماری هەر هێزێکی داگیرکەری تورکیا دەدا.

لە شـوبـاتـی ۲۰۰۳دا، نوێنەری تایبـەتی بـوش کە زاڵمـای خـەلیلزاد بوو، سـەرکردە کوردەکانی لە ئانکارا کۆکردەوەو پێی ڕاگەیاندن کە هەرچەندە ئەوان ناقایل نەبوون، بەڵام وڵاتە یەکگرتووەکـان ڕازی بووە کـە لەشـکرەکـانی تـورک بۆ نـاو کـوردسـتـانی ئێـراقێ بچن. خـەلیلزاد بە توندی وەڵامی نـاڕەزاییـەکـانی داوە. چونکە پارێزگـارە تازەکـانی پێنتـاگـۆن هـەر ویسـتـیـان پلانە تاکـڕەوییـەکـەی خۆیان پیـادە بـکەن، بۆیێ مـەترسی شەڕێکیـان لە نێوان هەردوو هاوپەیمانەکەی وڵاتە یەکگرتووەکان، تورکیاو کـورد، بـەرپا کـرد. خـۆشـبـەخـتـانە، پـەرلەمـانـی تورکـیـا بە چوار دەنگ ڕێگەی لە

لەشکرەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان گرت و نەیهێشت لە سنووری دەرباز بن.

لەوەش دەترسام کە کەرکووک وەک بۆمبێکی داندراوە بێ و لەگەڵ ڕووخانی سەددامی بتەقێتەوە. شاری کەرکووک و ناوچەکانی دەوروبەری پارێزگایەکە وڵاتی کوردو تورکمان و عارەبی سوننەو عارەبی شیعەو ئاشوری و کلدانییانە. دەیان ساڵە، کورد دەڵێن کەرکووک بەشێکی کوردستانە - دەستوری ١٩٩٢ی کوردستان کەرکووک بە پایتەختی کوردستان دەناسێ بەلام حکومەتە یەک لە دوای یەکەکانی ئێراقێ نکوڵییان لەوە کردووە کە کەرکووک بخەنە سەر ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردستان ئەمەش تەنیا یەک هۆی هەیە - ئەویش نەوتە. کەرکووک کەوتۆتە سەر یەکێک لە گەورەترین دەریاچەکانی نەوت لە دونیاو بۆ یەکەمجار لە ١٩٣٤ کەوتە بەرهەمدان و ئێستاش پتر لە دە بلیۆن بەرمیل نەوتی دۆزراوەی تێدا ماوە. لە ١٩٨٠کاندا، سەددام بڕیای دا کەرکووک بکاتە شارێکی عارەبی و بۆ ئەم مەبەستەشی کوردەکانی شارەکەی دەرکردن و عارەبی شێعەی لە باشووری ئێراقێ هێناو لە ماڵەکانی ئەوان جێگیری کردن. دوای ئەوەی لە ١٩٩١ ناوچەی ئارام دامەزرا، سەددام پەلەی لە دەرکردنی کوردەکان کردو لەو هێڵی سەوزی نێوان ئەو ناوچانەی بندەستی حکومەت و ئەو خاکەی بەردەستی کورد، وەدەری نان. لە دەمی بەر لە شەڕەکە دەیان هەزار کورد لە بن چادران، لە نزیکی ماڵەکانی پێشانیاندا دەژیان. کە سەددام ڕووخا، من لەوە دەترسام کە کوردەکان بە تووڕەییەوە شاڵاو بکەن و بچنەوە ناو شارەکەو ماڵەکانی خۆیان بگرنەوەو تۆڵە لەو عارەبانە بکەنەوە کە داگیریان کردبوو. توندوتیژی ناو کەرکووک، ڕەنگبوو لە سنووری ئێراقیش دەرباز ببێ. تورکیا بەخۆی، خۆی بە پارێزەری تورکمانەکانی کەرکووک تەعین کردووە، بۆیێ لەگێن بوو توندوتیژی ئیتنی ناو کەرکووک، بکاتە بیانوو بۆ ئەوەی هێزەکانی خۆی بنێرێ تا بەرپەرچی ئاواتەکانی کورد بدەنەوە.

دوای سەردانەکەی ٢٠٠٢م بۆ کوردستان، پێشنیارێکم پێشکەشی وۆڵفویتز کرد، بۆ ئەوەی وڵاتە یەکگرتووەکان کۆمسیۆنێکی موڵکداری کەرکووک پێک بێنێ، تا خێرا کێشەی ئەو زەوییانە چارەسەر بکا کە لە کوردەکان زەوت کرابوون. ئەگەر بۆ کوردەکان ڕوون ببایەوە کە دەتوانن بە ڕێگەی یاسایی زەوییەکانیان وەربگرنەوە،

نەدەچوون پەنا بەبەر هێز ببەن بۆ ئەوەی زەوییەکانیان وەربگرنەوە.

بۆ ئەوەی ئەو بیرۆکەیە کاریگەر بێ، پێویست بوو، لەگەڵ ڕووخانی کەرکووک، پێکهێنانی کۆمسیۆنەکە ڕابگەیەندراباو دەستی بە کارەکانی خۆی بکردایە. ئەمە تاکە ئامۆژگاری من بوو کە پێنتاگۆن لێی قەبووڵ کردم. لە دیسێمبەری ۲۰۰۲، بڵ لوتی کە بریکارێکی فێیت بوو، دوای کۆبوونەوەیێک لەگەڵ وۆڵفویتزی، بۆ لاچەپێک پەلکێشی کردمو پێی گوتم کە بیرۆکەکەی منیان لەلا پەسند بوو و خەریک بوون کۆمسیۆنێکی موڵکدارییان پێک دێنا. هەژدە مانگی پێچوو، هێشتا کۆمسیۆنی موڵکداری بەگەڕ نەکەوتووە.

لایەنەکانی تری پلانسازی پێنتاگۆنی سەبارەت بە کەرکووک، یەکجار ئاڵۆزوباڵۆز بوو. حەفتەیێک بوو شەڕ بوو، لەگەڵ کەلێک لەو کاربەدەستانەدا کۆبوومەوە کە لە کەرکووک بەرپرسیار بوون. لێم پرسیار کردن، چ پلانێکیان ئامادە کردبوو بۆ ئەوەی باری ناو کەرکووک بپارێزن و نەهێڵن کوردەکان پاکسازییەکی ڕەگەزی پێچەوانە لەوێ جێبەجێ بکەن، کە شارەکە کەوت. لە وەڵامدا گوتیان: "ها، پشت بە پۆلیسی ناوخۆ دەبەستین. پرسیم: "ئایا پۆلیسەکانی ناوخۆ عارەبن یان کوردن یان هەردووک لا تێکەڵن؟" هیچ کام لە کاربەدەستەکان نەیانزانی. حەپەسام، چونکە ئەستەم نەبوو ڕاستییەکانی سەبارەت بە کەرکووک بزانن و وڵاتە یەکگرتووەکانیش لە ماوەی چەند حەفتەیێکدا دەبێ شارەکە بەڕێوە ببا. نەجمەدین کەریمی نوژداری مێشکەو کوردێکی ئەمێریکییە، ئەویش لەو کۆبوونەوەیەدا ئامادە بوو. لە بنەڕەتدا خەڵکی کەرکووک بوو، بۆی ڕاڤە کردن کە هەموو پۆلیسەکانی کەرکووک عارەب بوون و بەشدارییشیان لە دەرکردنی کوردەکانی شارەکەدا کردووە.

جێی سەرسوڕمان نەبوو لەگەڵ بەدیارکەوتنی هێزەکانی ئەمێریکاو کوردو چوونە ناو کەرکووکیان، لە ۱۰ی نیسانێ، پۆلیسی کەرکووک هیچیان دیار نەمان. بێ ئەوەی هێزەکانی ئەمێریکاو میدیا ئاگایان لێ بێ، کوردەکان بەڕاستی عارەبیان لە هەندێ لەو گوندانەی دەوروبەری کەرکووک دەرکردن. ڕەنگبوو لەمەش خراپتر ڕوویدا. پارتە سیاسییە کوردییەکان بە توندی کۆنترۆڵی شارەکەیان کردو دەسەڵاتی خۆیان و پێشمەرگەیان خستە گەڕو نەیانهێشت خەڵکەکە بگەڕێنەوە.

بەچاکی دیار بوو کە بەڕێوەبەرایەتی بوش خۆی باش بۆ دوای ڕووخانی سەددامی ئامادە نەکردبوو، بۆیێ بە خراپی دەستەی بەڕێوەبەرایەتی داگیرکەری وڵاتە یەکگرتووەکانی لەوێ دامەزراند. هەرچەندە لە ساڵێک پتربوو بەڕێوەبەرایەتی پلانی داگیرکردنی ئێراقیی ڕێکدەخست، بەڵام هێشتا وەزیری بەرگری دۆناڵد ڕەمسفیلد تا ٢٠ی یەنایری ٢٠٠٣، ئۆفیسی بەڕێوەبردنی ئێراقی پاش داگیرکردنی دانەمەزراند. سەرۆک بوش ڕامسفیلدی لە کۆلن پاوڵی وەزیری دەرەوە، بە پەسندتر زانی بۆ ئەوەی ئێراق بەڕێوە ببا. ناوی ئۆفیسی ئاوەدانکردنەوەو یارمەتی مرۆیی Office for Reconstruction and Humanitarian (ORHA) لێنا. ئەرکی یارمەتی مرۆیی و بەڕێوەبردنی ئێراقیی لە دوای شەڕ خستە ئەستۆیەوە. ڕەمسفیلد ژەنراڵی خانەنشینی جێی گارنەری بۆ بەڕێوەبردنی ئەرکەکە هەڵبژارد. چەند مانگێکی هاوینی ١٩٩١، جێی گارنەر ئۆپەراسیۆنی پرۆڤاید کۆمفورتی بەڕێوە برد بۆ ئەوەی یارمەتی مرۆیی بۆ کوردەکانی ئێراقێ مسۆگەر بکاو ئەمەش، لە کوردستان، کردبوویە پاڵەوانێکی بچکۆڵە. جگە لەمە هیچ شارەزاییەکی تری نە لە کاروباری ڕۆژهەڵاتی ناڤین و نە لە دووبارە دروستکردنەوەی دەوڵەت، لە دوای شەڕدا، نەبوو. بەڵام پەیوەندییەکی چاکی لەگەڵ ئەو پارێزگارانەدا هەبوو کە وا دەزاندرا ئەویش وەک ئەوان بیری لە بابەتەکە دەکردەوە.

گارنەر لە دوو مانگ کەمتری بەدەستەوەبوو بۆ ئەوەی تەواوی ستافی بەڕێوەبەرایەتی دوای شەڕ، ڕێکبخا. لە هەر هەمان کاتیشدا پێویست بوو خۆی بە ڕووبەڕووبوونەوەی کارەساتێکی مرۆیی ئامادە بکاو ئەمەش وای لێ کرد باش ئاگای لە ئەرکەکەی خۆی نەمێنێ و ستافێکی تایبەتیش بۆ ئەمەیان ئامادە بکا.

بە پێی ئەو زانیاریانەی کە درابووە سەرۆکایەتی بوش و گرینگی ئێراقیی بۆ ڕوون کردبووەوە، مرۆڤ پێشبینیی دەکرد کە بەڕێوەبەرایەتی بایەخێکی تایبەتی بە بابەتەکە بداباو باشترین ستافی کارگێڕی بۆ گارنەر، دابمەزراندبا. کەچی لە ڕاستیدا پسپۆڕترین کاربەدەستانی حکومەتی بە شێوەیێکی زەق لە ئۆفیسی ئاوەدانکردنەوەو یارمەتی مرۆیی دوورخرانەوە. بە قسەی باڵیۆز تم کارنی، کە خانەنشین بوو، بەڵام بۆ ماوەیێکی کورت کاری بۆ ئۆفیسی ئاوەدانکردنەوەو یارمەتی

مرۆیی کرد، بە قسەی ئەو شارەزایانی کاروباری عارەبی لە وەزارەتی دەرەوە، "بە خێرهاتنیان نەدەکرا، چونکە بە بۆچوونی وان، مەحاڵ بوو ئێراق ببێتە دیمۆکراتی."
لە پێنتاگۆنی گەشبینەکان Pentagon of Pollya هەر شارەزایێکی باش لە گرفتەکانی ئێراقیی بزانیبا، هەرگیز نەیاندەویست.

نە داوا لە وەزارەتی دەرەوە کراو نە ئەویش پێشنیاری کرد باشترین کارمەندە شارەزایەکانی کاروباری دەرەوەی خۆی، بەمەبەستی ڕێکخستنی دۆخی ناوەوەی ئێراقیّ ڕەوانی ئەویّ بکات. گارنەر ناچار بوو یان لە ناو جۆخینی خانەنشینەکانی کاروباری دەرەوە (هەندێکیان فرە پیر بوون) یان لەوانەی کە ئێستا هیچ ئەرکێکی دیپلۆماسییان نەبوو ستافەکەی هەڵبژێریّ. بێگومان کەسانێکی زیرەکیان لە ناودا هەبوو، بەڵام ستافێکی تازە دەست بەکار بکا، مەحاڵە بتوانیّ نەخشەیێکی نوێی ڕۆژهەڵاتی ناڤین دروست بکاو بۆ ماوەیێکی درێژخایەنیش سیاسەتێک بۆ ڕۆڵی ئەمێریکا لە دونیا دیار بخا.

ئیشەکە بە پەلە لوول درا، بۆیێ بۆیان نەکرا خەڵکانێکی خاوەن ئەزموون لە شوێنە پێویستەکان دابمەزرێنن. لە شوباتی ۲۰۰۳، هاوپۆلێکم لە کۆلێژی جەنگی کە ناوی ئاڵن کایسوێتەرە تیلیفۆنێکی بۆ کرا. لێیان پرسی ئایا دەیویست، لە بەڕێوەبەرایەتی داگیرکەر، پۆستی وەزیری ئابووری ئێراقیّ، وەربگریّ[٤١]؟ داوای کرد بواری پیّ بدەن تا لە کۆتایی حەفتەدا بیری لیّ بکاتەوە.

کە تیلیفۆنی کردەوە، پێیان گوت وەزارەتی ئابووری پڕکراوەتەوە، بەڵام لێیان پرسیار کرد ئایا حەزی لە وەزارەتێکی تر هەبوو؟ کە تێگەیشت شێوەی بەڕێوەبردنەکە چۆن بوو، نکوڵی لە پێشنیارەکەیان کرد.

لە هەمان کاتدا، ڕۆبن ڕافێل کە پێشتر لە تونس باڵیۆز بوو و لەو دەمیش سەرۆکی زانکۆی بەرگری نەتەوەیی بوو، لە پۆستی وەزیری بازرگانی ئێراقی دامەزرا. خانمی ڕافێل لەو پۆستەدا بووە بەرپرسی کۆبۆنی ئەو ئازووقەیەی کە هەموو ئێراقییێک

---

(٤١) بەشێوەیێکی تەکنیکی، ئەمێریکییەکان پێیان دەگوترا (ڕاوێژکار) نەک وەزیر. بەڵام چونکە نە وەزیر نە هیچ گەورە بەرپرسێکی تر نەمابوون، بۆیێ ڕاوێژکارەکان وەزیری دیفاکتۆ بوون و بە خۆشیان خۆیان بەوەزیر دادەنا

پشتی پێی دەبەستا. ڕافێڵ کارمەندێکی کارامەی کاروباری دەرەوە بوو، هیچ شارەزاییەکی لە بارەی ئێراقەوە نەبوو. بە خۆشی دانی بەوە دانا کە هیچ شارەزاییێکی تایبەتی واشی نەبوو کە یارمەتی بدا تا دەست بە ڕاپەڕاندنی ئەرکێکی بەڕێوەبردنی لەم بابەتەوە بکا. بەڵام خۆ بەلای کەمیەوە، ڕۆبن خان دیپلۆماتێکی سەرکەوتوو بوو و شارەزاییشی لە وڵاتێکی عارەبیدا هەبوو. بەڵام باربرا بۆدین، ئافرەتێک بوو پێشتر لە یەمەن[٤٢] باڵیۆز بوو، زۆر تەققەی لەسەر پشتێ دەکرا.

پێشی یەمەنیش لە کوێت و لە ئێراقێ کاری کردبوو. لە زانکۆی کالیفۆرنیا لە سانتا باربراش پشووێکی کراوەی پێ درابوو. شەڕەکەی ئێراقێ دەستی پێ کرد، ئینجا بەڕێوەبەرایەتی بوش وۆڵتەر سلۆکۆمبی بریکاری وەزیری بەرگری بۆ کاروباری سیاسی لە بەڕێوەبەرایەتی کلنتنی دامەزراند تا سەرپەرشتی سوپای ئێراقێ بکا. (ئەمە تاکە جار بوو کە کەسێک لە پارتێکی جیاواز دابمەزرێنن، ئەگینا ئەوانی تر هەمووی هی یەک تاکە حزبێک بوون و داگیرکردنەکەش داگیرکردنێکی حزبی بوو.) دوای کەمتر لە مانگێک لە دامەزراندنەکەی و بێ ئەوەی شارەزایی پێشتری لە کاروباری ئێراقیدا هەبێ، سلۆکۆمب دەستی لە تواندنەوەی سوپای ئێراقێدا هەبوو. ئەم بڕیارەش دەرئەنجامی ئاڵۆزی لێ کەوتەوە.

بۆ پۆستەکانی تریش، گارنەر ئەفسەرە برادەرەکانی خۆی دامەزراندن هەندێکیان لە ماسی گرتن و قاشوانێ بێزار ببوون؛ بۆیێ ئیشە نوێیەکەیانیان لەلا خۆش بوو ئەگەر ئەمەشی نەکردایە، گارنەر لەو ناوە دەماوەو نەیدەتوانی ئەو هەموو سیاسییانە بدۆزێتەوە کە پابەندی ئایدیۆلۆژییان هەبێت و متمانەشیان پێ بکرێ، بۆ ئەوەی دایانبمەزرێنێ. لە باڵیۆز بۆدین بترازێ، گەورە بەڕێوەبەرەکانی گارنەر هەموویان هیچ ئەزموون و شارەزاییێکیان لە کاروباری ئێراقێدا نەبوو.

نوح فێڵدمەن، پرۆفێسۆری یاسایە لە زانکۆی نیویۆرک و لە سەرەتای داگیرکردنەکە، لە بواری دەستووریدا ئامۆژگاری گارنەری دەکرد. لەگەڵ ئەو کەسانەی تازە لەگەڵ ئەودا دامەزرابوون، لە ئایاری ٢٠٠٣ باسی بەفرۆکە سەفەر

---

(٤٢) بۆدین لەگەل تیمەکەی ئێف بی ئێی کە لێکۆڵینەوەیان لە پەلامارەکەی سەر یو ئێس ئێس کۆوڵ لە عەدەن دەکرد، دووچاری گیروگرفت ببوو.

دەکەن و بۆ ئێراقێ دەچن. پرۆفیسۆر فیڵدمەن لە باسی فرینەکەی دەنووسێ:

تێرامام، زەینێکی دەورپشتی خۆمم داو تەماشای هاوکارە تازەکانی خۆمم کرد. ئەوانەی بەئاگا بوون، هەر یەکەو بە وردی شتێکی دەخوێندەوە. کە زانیم چ دەخوێننەوە، مچورکێکی ساردم بە هەموو جەستەدا هات. واپێدەچوو کەسێکیان نەبوو بیەوێ شتێکی تازە نە دەربارەی ئێراقێ نە دەربارەی ناوچەی کەنداو نە وەبیرەخۆی بێنێتەوە نە فێری ببێ. هەر هەموویان ئەو کتێبانەیان دەخوێندەوە کە باسی داگیرکردنی ئەڵمانیاو ژاپۆن لە لایەن ئەمێرکاوەو پرۆسەی دووبارە ئاوەدانکردنەوەیانی دەکردو هەمووشیان تازە چاپ ببوون.

بێگومان جەرمەنستان و ژاپۆن دوو نموونەی زێرینی دروستکردنەوەی وڵاتن کە ئەمێریکا کردی. ئەمێریکییە سەرکەوتووەکان چەند ساڵ ئەو دوو وڵاتە داگیرکراوانەیان بەڕێوە بردو لە دوو وڵاتی دکتاتۆری لەشکرتارییەوە کردیاننە دوو وڵاتی خودان ئابوورییەکی گەشاوەو سستمێکی دێمۆکراسی سەقامگیری وایان لێ ڕسکا کە باری ڕاستەقینەی ئەورووپاو ڕۆژهەڵاتی دووریان گۆڕی. دوای چەند ساڵ لەو شەڕوشۆڕەی کە جەرمەنستان و ژاپۆن هەڵیان گیرساند، وڵاتە یەکگرتووەکان هەر دووک وڵاتی بە شێوەیێکی زۆر دیار تێکشکاند، ئینجا داگیری کردن. وڵاتە یەکگرتووەکان ملیۆنەها سەربازی لە مەیدانەکانی ئەورووپاو پاسیفیکدا هەبوو. چەند ساڵیش بوو پلانی داگیرکردنیانی داڕشتبوو. لە هەموو ئەوانەش گرینگتر ئەوەبوو کە ئەڵمانیاو ژاپۆن دوو وڵاتی ڕاستەقینەی یەک ڕەگەزو یەک نەریت بوون. لە هەندێ لە هاوتەریبییەکی کەمی نێوان حیزبی نازی و حیزبی بەعس بترازێ، لە دوای شەڕی دووەمی جیهانییەوەڕا، وڵاتە یەکگرتووەکان هیچ شارەزایییەکی شیاوی دەربارەی ئێراقێ نەبوو. بەڵام پڕ بە پێستی نیازو خواستەکانی سەرۆک بوش بوو.

هاوپۆلێکم لە پەیمانگەی هۆڤەر کە ناوی لێری دایەمۆند بوو، لەگەڵ دەسەڵاتی کاتی هاوپەیمانان CPA، کاری کرد. سی پی ئای لە پاشی ئوفیسی ئاوەدانکردنەوەو یارمەتی مرۆیی لە ئێراقێ دەستی بە کارکرد. دایمۆندیش وەک فیڵدمەن لە نەزانی ئەمێرکییان و گوێنەدانیان بە کاروباری ئێراقێ، حەپەسا. لە سەرکەوتنی بەربڵاو Squandered Victory بەکورتی باسی دەودەوانەیێکی نێوان ئێراقییێک و

کارمەندێکی داگیرکەر دەگێڕێتەوە.

ئێراقییەکە بە ئەمەریکییە لە خۆباییەکەی گوت: "لە سەرتان پێویست بوو مێژووی داگیرکردنی ئێراقێ لەلایەنی بریتانیاوەتان بە وردی بخوێندبایەوە."

ئەمەریکییەکە وەڵامی داوەو گوتی: "بەڵێ، خوێندمانەوە.

ئێراقییەکەش گوتی: "منیش هەر وای بۆچووم، چونکە دیارە کە ئێوەش مکوڕن لە سەر ئەوەی کە یەکە یەکەی هەڵەکانیان دووبارە بکەنەوە.

بە هۆی فێلەری بەڕێوەبەرایەتی لە دوای شەڕ، وڵاتە یەکگرتووەکان باجێکی گران دەدا وەکوو دەیبینین، ئەو هەڵانەی کە لەسەرەتادا کرا، بەڕی لە بن ئەگەری سەرکەوتن دەرکێشاو ئەو زۆنگاوەی ئێستای پەیدا کرد. سەیرە! بەڕێوەبەرایەتی کەم شتێک لەو هەڵانە فێر بوو کە لە سەرەتادا کران. دامەزراندنی دەستەی کاربەدەستانی دەسەڵاتی کاتی هاوپەیمانان، هێشتا لە ئۆفیسی ئاوەدانکردنەوەو یارمەتی مرۆیی بێ پلانترو ساویلکەتر بوو. بە پێچەوانەی ئەو هەموو ئەزموونەی کە بۆ پێشیان هات؛ ئەمەریکییەکان لە ئێراق و لە واشنتنیش بەردەوام پێشبینییەکانی پێش شەڕیان دووبارە دەکردەوە.

لە هەموو ئەو پێشبینییانەی کە پتر متمانەی پێ دەکرا، ئەوەبوو کە یەک ئێراق هەبوو. لە ئابی ٢٠٠٤، کۆندۆلیزا ڕایس، کە ئەوکات هێشتا هەر ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی بوو، لە پەیمانگەی ئاشتیی وڵاتە یەکگرتووەکان لە واشنتن، گوتارێکی پێشکەش کرد کە بە گرینگ لە قەڵەم درا. پێشتر من گوتارێکم بە ناوی چۆنیەتی لە ئێراقی دەرچوون، How to Get Out of Iraq " بڵاو کردبووەوەو وەک ستراتیژێکی ئاڵتەرنێتیڤی ئێراقێ، سەرنجێکی زۆری لایەنە سیاسییەکانی بۆ خۆی ڕاکێشابوو؛ بۆیێ بانگهێشت کرام تا گوێ لە ڕایس بگرم و پێشبینییان لێ دەکردم ئەگەر بشێ پرسیارێکیشی لێ بکەم.

پەکوو! گوتارەکەی هێندە بێ بەها بوو، کە نەمتوانی هیچ پرسیارێک بکەم. ئینجا قوباد تاڵەبانی، کوڕی جەلال تاڵەبانی و نوێنەری یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە واشنتن، دەستی خۆی هەڵبڕی. باسی ئەوەی کرد کە لە بری گەلی کورد بوو قسەی دەکرد، سوپاسی ڕایسی کرد؛ چونکە ڕۆڵێکی سەرەکی لە ئازادکردنی وڵاتی ئێمەدا

گیراوە،" پاشان لێی پرسی ئایا بۆچ وڵاتە یەکگرتووەکان بە شێوەیێکی شایستە بایەخ بە ئاوەدانکردنەوەی کوردستان ناداو تێبینی دا کە، "ئەمەش پەیامێکی چەوت بۆ ئەو هاوپەیمانە کوردانەتان دەنێرێ...کە لە ئێراقێ سەرە ڕمی بزووتنەوەی دێمۆکراتی پێکدێنن."

ڕایس گوتی ناتوانێ باسی ئەو پارمەتییە تایبەتییانە بکا کە بۆ باکوور دەچن، بەڵام پاشان ئەم هەڵسەنگاندنەی پێشکەش کرد:

بەڵام ئەوەی تائێستا کاری تێ کردووە ئەوەیە کە ئێراقییەکان بە کوردو شیعەو سوننەو زۆرینەی گرووپە ئیتنییەکانی تریشەوە ئەوەیان سەلماندووە کە دەیانەوێ لە ئێراقێکی یەکگرتوودا بژین. بە تایبەتیش وای بۆ دەچم؛ کورد سەلماندوویەتی کە ئەو جیاوازییە مێژووییانەی لە نێوان لایەنەکاندا هەبوو و سەددام و ڕژیمەکەی گڕیان دەدا، ئەوان بە زۆر ڕێگە کەمیان دەکەنەوە.

ئەرێ ئایا دوای شازدە مانگ لە گرتنی ئێراقێ تا ئێستا هەر ئەوەندە لە پەیوەندی نێوان ڕەگەزە جیاوازەکانی ئەو وڵاتە فێربووە؟ لێم پرسی چۆن توانی بڵێ کورد بە ئێراقێدا پابەندن، لە کاتێکدا ١,٧ملیۆن کورد کە ٨٠ لە سەدی سەرجەم ئادەڵت adult (تەمەن لە ١٨ ساڵ پتر)ی کوردستانیان پێکدێنا، نووسراوێکیان مۆر کردو تیایدا داوایان کردبوو دەنگ بۆ سەربەخۆیی بدەن.

ڕایس گوتی: "ئەم چەشنە ڕاپرسییە لە زۆر شوێنی تریش ئەنجام دراوە، بۆ نموونە، لە کەنەداش، کە کەوتۆتە باکووری ئێمە؛ ئەم ڕاپرسییە کرا. پاشان گوتی: "ئەوەش کە جێی سەرنج و مەزەندەش دەکەم گرینگیش بوو، سەرانی شیعەو کوردو سوننەکانیش بە بەردەوامی دەڵێن دەیانەوێ ئێراق بە یەکگرتوویی بمێنێتەوە."

هەموو ئەو سەرکردە کوردانە دەناسم کە ڕایس چاوی پێیان کەوتبوو، تاکە یەکێکیشیان نەبوو کە بیەوێ ئێراق بە یەکگرتوویی بمێنێتەوە. خۆ ئەستەم نەبوو ڕاستی لە سەر خاکی کوردستانی ئێراقێ، بدۆزرێتەوە. تەنانەت ئەگەر کەسێک بە ڕێکەوت بچێتە هەولێری پایتەختی کوردستان، تێبینی ئەوە دەکات کە پەرچەمی کوردستانە لە هەموو شوێنێکدا دەشەکێتەوەو ئاڵای ئێراقیش تەنیا لە یەک تاقە شوێنیشدا نییە. (قەدەغە کراوە). کە لە مەرزی تورکیاوەشڕا بۆ ناو کوردستان

دەرباز دەبی، پاسـتـپـۆرتی مـیـوانان لەلایەنی کـارمـەندانی حکومـەتی هەرێمی کوردسـتانەوە سـەرنج دەدریّ و مەرجە پێویستەکانی وەرگرتنی ڤیزای ئێراقیّ لێرە، لێرە پەیڕەو ناکریّ. کوردسـتـان سوپای تایبـەتی خۆی هەیەو ڕێگە بە سوپای تازەی ئێراقـیش نادا کە پیّ بنێتـە خـاکی کـوردسـتـانەوە. کـوردەکانیش بۆچوونـی خۆیان بەرانبەر بە ئێراقیّ لە کەس ناشارنەوە. ڕقیان لەو وڵاتە هەیەو شـەرمیشیـان پیّ نییە باسی بکەن. پێویستی بە شیکردنەوەیێکی ئاڵۆز نییە بۆ ئەوەی لەم ڕاستییە بگەین. ڕایس تەنیا پێویستی بەوە هەبوو بیر لەوە بکاتەوە کە ئەمێریکییەک هەست بە چ دەکا، بەرانبەر بە وڵاتێک کە گازبارانی کردووەو مـاڵەکەی خاپوور کردووەو سـەدان هەزار خزمی نزیکی ئیعدام کردووەو – هەر لە سەرەتاوەش نەیویستووە بەشێکی ئەو وڵاتە بیّ.

ئێـراقی هاوچەرخ لە سـەر بناغـەیێکی نـاڕێک دروست کـرا. هـەرگـیـز کـورد نەیویسـتووە ببیتە پارچەیێکی، عارەبەکانیش دوو چین بوون، کەمینەکەیان سوننە و زۆرینەیانیش شیـعەنە؛ دەسـەڵات هـەر بە دەستی سوننەوە بووە. بێگومـان ژمارەیێکی زۆری وڵاتی فرەڕەگـەزو فرە ئاین هـەیە، وڵاتە یەکگرتووەکانیش یەکێکە لەو وڵاتانە. کە هـەموو کۆمـەڵە ئێتنییە جیـاوازەکان تێکەڵی یەکتری دەبن، وەک ئەوەی لە وڵاتە یەکگرتووەکـان، یان لە هیندسـتان هـەیەو هیچ کۆمەڵێکیـان باڵادەست نابیّ و دەست بە سـەر دەوڵەت دانـاگریّ، ئەو کات باشـتـر کـار دەکەن. لە ئێراقیّ هەرسیّ کۆمـەڵە سـەرەکـییـەکـەی کە وڵاتیـان لیّ پێکدیّ کوردو عـارەبی سوننەو عـارەبی شـیـعـە – خـاکێکی جـیـۆگرافی تـایبـەتی خـۆیانیـان هـەبوو کـە لە لایەنی مـێـژووییـیـەوە، سیّ ویلایەتی دەوڵەتی عوسمـانییان پێک دێناو ئێراقیش لەو سیّ ویلایەتە پێکهێندرا(٤٣).

ئێراق یـەکێک بوو لەو چوار وڵاتە فرە ڕەگەزە و/ یان فـرە ئایینە بـوو کە لە دوای شـەڕی یەکەمی جیـهـانیدا پێکهێندران. وڵاتەکانی تر هـەوڵیـان دا کێشـەی نەتەوەیی خۆیان چـارەسـەر بکەن و هـەر گرووپـە ئێتنێک ئەو خـاکەیان پیّ بدەن کە یەک زمان و

---

(٤٣) دوو شـارە پیرۆزەکـەی کەربەلاو نەجـەف لەگەڵ ویلایەتی بەغدا بوون، کە ویلایەتێکی سـوننە بووو شـاری میسلیش عـارەب بوون بەڵام بەشـێکی ویلایەتی میسل بوو کە ویلایەتێکی کـوردی بوو.

یەک کەلتووری تێدا بوو. هەندێ خاڵی دەسەلاتی ناوەندیشیان پێ دان. عارەبە سوننە دەسەلاتدارەکانی ئێراقێ نە ڕێزیان لە ویستی لایەنەکانی تر گرت و نە ئامادەش بوون کە دەسەلاتیان لەگەڵ دابەش بکەن.

دابەشکردنی دەسەلات لە نێوان چیک و سلۆڤاکەکان، لە نێوان هەردوو شەڕی جیهانیدا، چێکۆسلۆڤاکیایێکی سەرکەوتووی لە ئەورووپای ڕۆژهەلاتدا دروست کرد. لە ١٩٤٨یش، جۆزیف برۆز تیتۆ توانی بە شێوەیێکی ڕێکو پێک نەک هەر یوگۆسلاڤیا لە شەش کۆمارو دوو هەرێمی ئۆتۆنۆمی پێک بێنێ، بەڵکو دەسەلاتێکی ئاوای بۆ ولاتەکەی پەیدا کرد کە توانی بەرهەڵستی ستالین بکاو وەک دەوڵەتێکی کۆمیونیستی لای ڕۆژئاواش گەشە بکا. یوگۆسلاڤیای تیتۆ توانی ناسنامەیێکی یوگۆسلاڤی" لە نێوان هەندێ لە هاولاتییەکانی خۆیدا (سربەکان و بۆزنییە موسوڵمانەکان) پەیدا بکاو دە ساڵ دوای مردنی دامەزرێنەری ولاتەکە لە ٤ی ئاياری ١٩٨٠، ئەو ناسنامەیە هەر مابوو. سێیەم ولاتی ئەورووپایی، فرە ئێتنی کە لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانیدا دروست بوو، یەکێتی سۆڤیەتی بوو، کە لە پازدە کۆمار پێک هات. ئەو ولاتە لە شەڕی دووەمی جیهانیدا ٢٠ ملیۆن هاولاتی خۆی لە دەست دا و بەرگەی ئەو لەدەست دانەشی گرت و پاشان، بۆ دەست بەسەرداگرتنی هەموو دونیا، بۆ ماوەی نزیکەی نیو سەدە لەگەڵ ولاتە یەکگرتووەکان پێشبڕکێی کرد.

بەلایەنی کەم بۆ ماوەیێک، چیکۆسلۆڤاکیاو یوگۆسلاڤیاو یەکێتی سۆڤیەتیش دیار بوو کە ولاتی فرە نەتەوەن. یەکێتی سۆڤیەت لەوانی دیکە کەمتر فرەنەتەوەیی پێوە دیار بوو. کە لە ١٩٨٩، دیمۆکراسی بۆ ئەورووپای ڕۆژهەلات هات، یوگوسلاڤیاو یەکێتی سۆڤیەتی لە چیکۆسلۆڤاکیاشی لە ١٩٩٣دا لەناو برد. لە هەر یەک لەو کێسانەش، نەتەوەگەری nationalism بە سەر دڵسۆزی بۆ قەوارە گەورەترەکەدا زاڵ بوو.

بەڕێوەبەرایەتی بوش وای بۆ چووە کە ئێراق - هەرچەندە لە هەموو ئەو ولاتانە سەرنەکەوتووتر بوو کە لە دوای شەڕی یەکەمی جیهانیدا دروست بوون بەلام جیاوازی لەگەڵ ئەو هێزانەدا هەیە کە ولاتە ئەورووپاییە هاوشێوەکانی ڕووخاند. ئەمەش بۆچوونێکی بێ بەها بوو. ڕەنگە ئەندازیارانی سیاسەتی ئێراقی وا

تێگەیشتبن ئەگەر باسی گەلی ئێراقیّ بکەن، دەتوانن ئەو گەلە دروست بکەن.

لە هەر جێیەک کە ڕاستەوەرەکانی ئێراقی لەگەڵ ئومێدو ئارەزووەکانی بەڕێوەبەرایەتی تێکیان نەکردەوە، ڕاستەوەرەکان پشتگوێ خران. چارلس فریدمەن، کە لە عارەبستانی سعودی، باڵیۆزی سەرۆک جۆرج هـ. و. بوش بوو، بەم شێوەیەی لە چوارچێوە دانا: "ئێمە ئێراقمان داگیر نەکرد، بەڵکو ئەو ئێراقەمان داگیر کرد کە لە خەونەکانی خۆمان دا هەبوو. ئەویش وڵاتێک بوو نەبوو، ئێمەش لێی تێنەگەیشتین. هەر بۆیێش جێی سەرسوڕمان نییە ئێمە کالیدۆسکۆپ[٤٤] مان بزواندو شێوەیێکی ترمان پێی دا، بۆیێ ئێمە ئەو کتوپڕیەمان تووش هات. مرۆڤی نەزان هەمیشە تووشی کتوپڕی دێت.

---

(٤٤) کالیدۆسکۆپ Kaleidoscope ئامێرێکە کۆمەڵێک پارچە شووشەی ڕەنگاوڕەنگی تێدا هەیەو لەگەڵ جوولاندنەوەی کۆمەڵێکی بێ ژمارەی شێوەی ئەندازەیی جیاواز دروست دەکا. لە فەرهەنگی (المورد، لە بن پیتی K).

# بەشی ٦

## ئەنجامی کارەسات

"ئومێد دەکەم لە ئارماگێدۆن Kaleidoscope[٤٥] بەرپرسیار نەبم." لەپێش تاقیگەی ناوەندی تەندروستی گشتی، لە بەغدا، من و برایان رۆس لە نوچەی ئێی بی سی، لەگەڵ عەقیدێکی مارینز قسەمان دەکرد. رۆژێک پێشتر، لە ١٦ی نیسانی ٢٠٠٢ بوو، عەقید بەخۆی و بە سەربازەکانیەوە چاویان لێ بوو چۆن دزەکان ئامێرەکانی ناو تاقیگەکەیان کردە ناو گوشانەوەو بە تالآنیان برد. دزەکان ئەو شووشە بچووکانەیان برد کە گرانەتاو ئیفلیجی منداڵ و ئێچ ئای ڤی (ئێیدز)و کۆلێرایان تێدا هەڵگیرابوو. ئەمانە چەکی بایۆلۆژی نەبوون، بەڵام لەوانە بوون کە پێیان دەگوترێ کەرستە (دوو کارە dual use) کار. دەشێ بۆ وەبەرهەمهێنانی چەکی بایۆلۆژی بەکار بێن؛ بەڵام بۆ توێژینەوەی نوژداریش بە شێوەیێکی یاسایی سوودیان دەبێ. لە کاتێکدا کە ئەنجومەنی ئاسایش رێگەی بە ئێراقێ نەدا چەکە بایۆلۆژی و کۆمەڵکوژەکانی تری هەبێ، بەڵام بۆی هەبوو هەندێ لەو کەرستە دووکارانە بهێڵێتەوە. چونکە دەکرا ئەمانە بۆ پرۆگرامی چەکەکان سوودیان لێ وەربگیرێ، بۆیێ پشکنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان، پێش ئەوەی لە ١٩٩٨و پاشان لە ٢٠٠٢دا دەربکرێن، زوو زوو سەردانی ئەو تەلارەیان دەکرد.

لە کاتێکدا کە پشکنەرەکان هیچ بەڵگەیێکیان نەبوو بسەلمێنێ ئەو سامپڵە بایۆلۆژییانەی لە تاقیگەکەدا هەبوون گۆردرابن و بۆ پرۆگرامی چەکەکان چووبن، بەرێوەبەرایەتی بوش زۆر گومانی لێ هەبوو. لە ٥ی شوباتی ٢٠٠٣دا، وەزیری دەرەوە، کۆڵن پاوڵ، هوشیاری دا ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان

---

(٤٥) ئارماگێدۆن Armageddon لەدەستدانی بەکۆمەڵی مرۆڤ.

سەبارەت بە مەترسییەکی زۆر، کە توێژینەوە بایۆلۆژییەکانی ڕژێمی ئێراقی هەیبوو و گوتی: بەڵام هەوڵەکانی توێژینەوەی ئێراقی لەوێوە نەوەستا. سەددام حوسێن لێکۆڵینەوەی لە دەیان ئێجنت agentی بایۆلۆژی کردووە کە هۆی نەخۆشی وەک گانگارین و تاعون و تایفۆس و گەزاز و کۆلێرا و خوێن لێهاتن و ئەو کەرستانەشی هەیە کە بە هۆیانەوە دەتوانێ خوریکەش پەرە پێ بدا.

هەواڵگری نەتەوە یەکگرتووەکان و وڵاتە یەکگرتووەکان دەیانزانی ئەم توێژینەوەیەی کە بووە هۆیێکی سەرەکی بۆ بەرپابوونی شەڕەکە، لەم تاقیگەیەی تەندروستی گشتیدا کرا بەڵام هێشتا بەڕێوەبەرایەتی بوش هیچ پلانێکی دانەنا بۆ ئەوەی نەهێڵێ ئەو کەرستە کوشندانە بکەونە بەردەستی نەزانانەوە. یەک حەفتەی تەواو بوو کە ئەمێریکییەکان چووبوونە ناو بەغدا، کاتێک کە دزەکان بە ناو تاقیگەکە وەربوون. مارینزەکان لەو نەخۆشخانەی تەنیشتییەوەڕا تەماشای دزەکانیان دەکرد. عەقیدەکە بۆی ڕاڤەکردین و گوتی: "کەس پێی نەگوتم چ لەوێدا هەبوو."

ئەو شەو لە یادداشتنامەکەمدا نووسییەوە: "ئاشکرابوو ئەمە تێکدانێکی سەرەکی بوو، گەلێکی تریش لەم چەشنە تێکدانانە کران. چۆن دەکرێ دوا قۆناغەکانی ئەم هەڵمەتە پلانی ئاوا خراپی بۆ داندرابێ؟"

تومیسە ئاواییەکی گەورەیە لە باشووری بەغدا ئێراق لەوێ توێژینەوەی وزەی ناووکی و دروستکردنی بۆمبی ئەتۆمی دەکرد. لە دوای شەڕی یەکەمی کەنداو، ئاژانسی وزەی ئەتۆمی نێودەوڵەتی سەرپەرشتی تێکشکاندنی هەندێ لەو کەرستە ئەتۆمییانەی تومیسەی کرد. کەرستەکانی تریشی بە چاکی داخست و مۆری ئاژانسەکەی لە سەر لێدا. هەندێک لەو کەرستانەی ناو ئاواییەکە بریتی بوو لە چەند بەرمیلێک کە "کێکی زەرد yellowcake تێدا بوو. ئەویش یورێنیەمی خاوەو کاتێک پەیین دەکرێ؛ ئەو کەرستەیەی کەلبوونی لێ پەیدا دەبێ کە بۆمبی ئەتۆمی لێ دروست دەبێ. هەواڵگری وڵاتە یەکگرتووەکان بە چاکی شارەزای تومیسە و کەرستەکانی ناوی بوون. با بڵێین کاربەدەستانی وڵاتە یەکگرتووەکان بەو مەترسیانەیان نەدەزانێ کە لە تومیسەدا هەبوو، بەڵام خۆ لە ١٠ی نیسانی ٢٠٠٣، محمد البرادعی، بەڕێوەبەری گشتی ئاژانسی وزەی ئەتۆمی نێونەتەوەیی، لە ڤیێنا بە

دیبلۆماتە ئەمریکییەکانی گوت، "پێویستە ئەو کەرستە ئەتۆمییانە بپارێزرێن کە لە توەیسە داکراون.

کە سەربازانی ولاتە یەکگرتووەکان گەیشتنە توەیسە، کێکە زەردەکە هێشتا هەر لەناو بەرمیلەکاندا بوون و چۆن پشکنەرانی ئاژانسی وزەی ئەتۆمی نێو نەتەوەیی لە کۆگای تایبەتی بەجێی هێشتبوون، هەر وەتۆ بە سەرمۆری مابوونەوە. لەکاتێکدا کە سوپای ئەمێریکی لە توەیسە بوو، دزەکان کۆگانیان شکاندو چوونە ناویانەوە. بەرمیلەکانیان بردو کێکە زەردەکانیشیان بەوناوەدا پەرت کرد. نزیکەی دوو تەن لەو کەرستەیە بزر بوو. هەرچەندە ڕوون و ئاشکرابوو کە ڕاپۆرتەکانی هەواڵگری سەبارەت بە پەیوەندی نێوان ئێراق و نایجیریا، ساختە بوون، بەڵام لە گوتاری بارودۆخی ولاتە یەکگرتووەکانی ۲۰۰۳دا، سەرۆک بوش گوتی ئەو هەولانەی ئێراق دابووی بۆ ئەوەی کێکی زەرد لە نایجیریا بەدەست بێنێ، هێندە مەترسییان هەبوو کە شەرعییەتیان بە شەڕەکە دا. لەگەڵ ئەمەشدا، بەڕێوەبەرایەتییەکەی هێندە بایەخی بەو کێکە زەردە داکراوە نەدا تا ئەو ڕادەیەی فەرمانێک بە سەربازانی ولاتە یەکگرتووەکان بدا تا بچن ئەو شوێنە بپارێزن.

لە سەرەتای نیسان، لەشکری ولاتە یەکگرتووەکان گەیشتە القعقاع، کە ئەویشیان دەزگایێک بوو سی میل لە باشووری بەغداوە دوور بوو. ژێرزەمینەکانی ئەو دامەزراوە ۱۹٤ تەنی مەتری تەقەمەنی ئەوپەڕ تواوە HMX و۱٤۱ تەنی مەتریش تەقەمەنی خێرا RDXی تێدا بوو. ئەم تەقەمەنییە توندانەی وەکو بۆ ئەوە بەکار دێن تا لە ناوەوەڕا خڕۆکەی یورێنیەم یان پلۆتۆنیەم بتەقێنێتەوەو بەم چەشنە زنجیرەیێک کاردانەوە بەدوای یەکتریدا دروست دەکا و لە ئەنجامدا تەقینەوەی ئەتۆمی لێ پەیدا دەبێ. "فات بۆی" ئەو بۆمبە پلۆتۆنیەمە بوو کە لە ۱۹٤٥دا بە سەر ناگاساکی دا بەردراوەو یەک تەن تەقەمەنی توندی بەکار هێنا. کەچی ئێراق HMX و RDXی بۆ پرۆگرامە ئەتۆمییەکەی خۆی لە ۱۹۸۰کاندا، وەدەستهێنابوو. ئەو تەقەمەنییانە بۆ دروستکردن و ئامانجی سیڤیلیش بەکار دێن. ئاژانسی وزەی ئەتۆمی نێو نەتەوەیی لە ۱۹۹۰، لەبری ئەوەی ئەو کەرستانە تێکبشکێنێ، هەستا خستبانیە ژێر چاودێرییەوە. پاش ئەوەی ئێراق قایل بوو پشکنەرەکان دەست بە پرۆسەی پشکنین بکەنەوە، البرادعی لە ۲۰۰۲، فەرمانی بە پشکنەرەکانی کرد تا بۆ ناو القعقاع

بچنەوەو لە یەنایری ٢٠٠٣ بوو کە ڕاپۆرتێکی بۆ ئەنجومەنی ئاسایش بەرزکردەوەو باسی ئەو کەرستە داکراوەی بۆ ئەنجومەن تێدا کردبوو. یەکسەر لە دوای ڕووخانی سەددامیش، ئاژانسی وزەی ئەتۆمی نێونەتەوەیی لە بارەگاکانی لە ڤیێنا، نیگەرانی خۆی سەبارەت بەو تەقەمەنییانە بۆ دیپلۆماتەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان دەربڕی.

هێشتا سەربازە ئەمێریکییەکان ژێرزەمینەکانی القعقاعیان بێ پاسەوان لێگەڕابوون. لە میانی چەند مانگێکی پاشتر، دزەکان و HMX و RDX ٥,٨ تەنی مەتریش پێتن PETN یان دزی. پێتنیش جۆری سێیەمی تەقەمەنییەکانە. ئەمە کردەیێکی لاوەکی نەبوو، چونکە هەڵگرتنی ئەو هەموو کەرستەیە بە لایەنی کەمیەوە چل لۆری دە تەنی پێویست بوو تا بیگوزنەوە.

ئامێرە ئەوپەڕ وردەکارەکان جۆرێکی تری ئەو کەرستە دووکارەن کە بۆ دروستکردنی چەکە ناووکییەکان پێویستن[٤٦]. دوای ئەوەی وڵاتە یەکگرتووەکان دەسەڵاتی ئێراقیی گرتە دەست، ئەو ئامێرو کەرستانە هەموو بزر بوون، چونکە بەڕێوەبەرایەتی بوش نەیتوانی بیانپارێزێ. لە ئۆکتۆبەری ٢٠٠٤، ئاژانسی وزەی ئەتۆمی نێو نەتەوەیی لە ڕاپۆرتێکیدا گوتی: "بە ڕادەیێکی زۆرو بەشێوەیێکی ڕێکو پێک وێستگە ئەتۆمییەکانی پێشووی ئێراقێ هەڵوەشێندراونەتەوە." بە قسەی ئاژانسی وزەی ئەتۆمی نێو نەتەوەیی، عەسابە ڕێکخراوەکان ئامێری گەورەیان بەکارهێناو "سەرجەم ئامێرەکانی ئەو تەقەمەنییە توندانەیان بۆ خۆیان گواستەوە."

ڕەنگە هەندێ جار دزەکان هەر نەیانزانیبێ چ دەدزن. ئەوانەی تومیسەیان دزی، بەرمیلەکانیان بۆ داکردنی ئاوی بارانێ دەویست. ڕەنگە ئەوانەی تاقیگەی تەندروستی گشتیشیان دزی نەیانزانیبێ چ دەبەن. چونکە سایتەکان پاس نەکران، بۆیێ کەس نازانێ ئەگەر کەرستەکان کەوتبنە دەستی نیازخراپان، یان نا.

دزینی ئامێری وردەکاری لە شوێنە تایبەتەکانی پرۆگرامی ناووکی و هەڵگرتنی

(٤٦) تەقەمەنییە زۆر توندەکان کەرستە دووکارەن؛ چونکە دەشێ بۆ پرۆژەی بیناسازیش بەکاربێ. لەبەر ئەم هۆیەبوو کە پشکنەرانی نەتەوە یەکگرتووەکان مکوڕ نەبوون لەسەر ئەوەی کە ئەو تەقەمەنییانە هاوکات لەگەڵ ئامێرە وردەکارەکان، لەناو ببەن. بەڵکو لە بری ئەوە بەباشیان زانی چاودێرییان بکەن تا دڵنیابن لەوەی کە بۆ مەبەستی نایاسایی بەکار ناهێندرێن.

HMX و RDX له بنكەی القعقاع بە چاكی ڕێك خرابوو و چەند مانگێکیشی خایاند تا تەواو بوو. بەڵگەی زۆری ناوێ تا بزانین ئەم کەرستانە چیان لێهات. چەند مانگ لە پاش ڕووخانی سەددامی و لە سەرتا سەری ئێراقێ، یاخییەکان و پێشمەرگەو میلیشیا شیعەکان چەک و تەقەمەنییان لە کۆگەی چەکە پاسنەکراوەکانی سەربازی کۆ دەکردەوە. سیخوڕە ئێرانییەکان، لە دوای شەڕی، ناوەڕاست و باشووری ئێراقییان تەنی. ئێران مەرەقێکی زۆری هەبوو بۆ ئەوەی ئەو تەقەمەنییە توندانەی بۆ پرۆگرامی ناووکی خۆی بەدەست بێنێ و ئەو کەرستە دزراوانەی ئێراقیش پتر سەرنجی ئێرانییانی بۆ خۆی ڕاکێشا، چونکە شوێنیان هەڵنەدەگیرا. ڕەنگە ئێران توانیبێتی بچێتە نێو القعقاعەوە؛ چونکە کەوتۆتە شوێنێک کە هەمووی هاوپەیمانی ئێرانن. یاخییە سوننەکانیش، کە لایەنگری سەددامی بوون و زانیاری تەواویان دەربارەی کەرستەکان هەبوو، ڕەنگە ئەوانیش دەستەگوڵی خۆیانیان لێی دابێ، چونکە ئەو جۆرە تەقەمەنییانە بۆ ئەنجامدانی کردەوە تیرۆریستییەکان، کەرستەی نایابن. ئەو تەقەمەنییەی کە فڕۆکەکەی پانامی ۱۰۳ی لە ۱۹۸۸ لە ئاسمانی لۆکەربی تەقاندەوە کێشەکەی لە پاوەندێک کەمتر بوو.

لە شوباتی ۲۰۰۳ بوو کە سەرۆکی تیمی لێکۆڵینەوەی ئێی بی سی، برایان ڕۆس، لە کتێبخانەی کۆلێژی شەڕی نەتەوەیی، دیمانەیێکی لەگەڵ سازدام. دیمانەکە دەربارەی عودەی، کوڕە گەورە سادییەکەی سەددامی بوو. عودەی زنجیرەیێک کردەی سووکی ئابڕووبردنی ئەنجام دابوو و کۆمیتەی ئۆڵمپی ئێراقیشی بەڕێوە دەبرد. لەو دەمەی کامێرایان ڕێک دەخست، باسی ئەو هەژدە تەن دۆکیومێنتەم بۆ برایان و ڕۆندا شوارتزی بەرهەمهێنەری کرد، کە کوردەکان لە ۱۹۹۱ دەستیان بە سەر داگرتبوو. ئەوانە فایلی ئەو تاوانانە بوون کە دەزگا سیخوڕییە هەرتمییەکانی سەددامی کردبوویان. ڕەنگبوو لە بەغدا لە کاتی ڕووخانی، لەمە پتر بدۆزرابایەوە. هەر لە دوای تەپینی ڕژێم، برایان بڕیاری دا بە زووترین کات تیمێک بۆ بەغدا ڕەوان بکا. برایان و ڕۆندا، هەردووکیان لێیان خواستم، تا وەک ڕاوێژکارێکی ئێی بی سی نیوز، لەگەڵیان بۆ بەغدا بچم. چونکە سەفەرەکەم کارێکی ئاسایی نەبوو کە پرۆفیسۆرێکی کۆلێژی شەڕی نەتەوەیی بیکا (چونکە بە پێی کارەکەم من

کارمەندێکی وەزارەتی بەرگری بووم)، بۆیێ چووم پرسم بە وۆلفوویتز کرد. ئەویش وەک خۆم، وای پێ باش بوو سەرنج بدەینە ئەو ترس و تۆقاندنەی کە ڕژێمی دەرکراو بەرپای کردبوو[٤٧].

پێش نیوەی شەوی ١٣ی نیسانی ٢٠٠٣، بە کاروانێکی (ئوتومۆبێلی 4X4) هۆتێلەکەی ناو عەممانی پایتەختی ئوردنیمان بەجێهێشت و بەرەو سنووری ئێراقێ چووین، بەو مەرازەی لەگەڵ گەردی بەیان لە مەرزەکە دەرباز ببین. دامەزراوەکانی سنووری هەردوو زۆر فرەوان بوون هەزاران شوێنی وەستاندنی ئوتومۆبێل و سەدان شوێنی پشکنینی تێدا هەبوو. هەمووی چۆل بوو. کە چووینە ناو خاکی ئێراقێ، سەربازە ئەمێریکییەکان یەکسەر لە ناسنامەی ڕۆژنامەوانیمان دڵنیا بوون و ئیتر بەرەو بەغدا دامانە ڕێ. ڕەنگە بەو ڕێگەدا لێخوڕین مەترسیدارترین لایەنی سەفەرەکە بوویێ. ڕانەندە ئوردونییەکان هەزار دۆلاریان لە کرێی خۆیان پتر لە ئێی بی سی وەرگرت و هەوڵیان دا تا بتوانن دایچۆڕن. بەشێوەیێکی ئاسایی، بەیانی زوو دەبوو لە بەغدا دەرچن و ١١پ.ن. بگەنە عەممان و یەکسەر بەرەو بەغدا بچنەوە. ڕانەندەکان شەوێک نا شەوێک دەخەوتن. نوستنەکەشیان لە بەغدا دەبوو، خەوی بەغداش خەو نەمابوو. لە کاتێکدا شوفێرەکەی ئێمە بە خێرایی ١٤٠ کیلۆمەتر لە سەعاتێکدا (ئێس یو ڤی)یەکەی لێ دەخوڕی، ناوە ناوە هەر زللەی لە ڕوومەتی خۆی دەدا تا خۆی بە ئاگا بێنێ.

لەدەرەوەی فەللوجەی ڕامانگرت. قەمەرەیێک لە ڕێی لادابوو. دوو تەرمیش لە تەکیەوە درێژ کرابوون. فڕۆکە هێلیکۆپتەرە جەنگییە بلاک هۆکەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان بە ئاسمانێدا دەسووڕانەوە. ترسام بەناو بۆسەیێکدا کەوتبین. (هێشتا هاوپەیمانان فەللوجەیان نەگرتبوو). ڕۆژنامەنووسەکانی ناو کاروانەکەی ئێمە وەک ڕۆژنامەنووسان کە تووشی مەترسی دەبن چ دەکەن، ئەوانیش بەو شێوەیە هەڵسو کەوتیان کرد: کامێرایەکانی خۆیانیان دەرهێناو دەستیان بە وێنەگرتن کرد. تەقینی تایەی ئوتومۆبێلێک بوو، ببووە هۆی کوشتنی ئەو دوو ڕۆژنامە نووسە

---

(٤٧) من ڕاستەوخۆ لەم بارەیەوە قسەم لەگەڵ وۆلفویتزدا نەکرد، بەڵکو لە ڕێگەی یەکێک لە یاریدەدەرەکانیەوە پەیوەندیم پێیەوە کرد.

ئەرژەنتینییەی کە لە سەر سنووری ئوردون تووشیان ببووین. چەند مانگێک پاشتر یاخیبووەکان وایان لە ڕێگەی سنووری نێوان ئوردون و بەغدا کرد کە هیچ بیانییەک نەتوانێ بەویدا ڕەت ببێ.

کە گەیشتینە بەغدا، لە دزو چەند سەربازێکی ئەمێریکی بترازێ کەس لەسەر خیابانەکاندا نەبوو. کە چووینە ناو شاری تووشی چەندین دز بووین، ناومالیان بزیارییان بەپێش خۆیان دابوو، قەرە بە قەرەی ڕێگا، پالیان دەدا. لە شوێنێک چاومان بە کابرایێک کەوت خەریک بوو ئامێرێکی فۆتۆکۆپی جۆری زێرۆکسی لە ڕیمی بار دەکرد. هەموو خانووەکانی دەزگاکانی میری و سوپەرمارکێتەکان و بانکەکان دووکەڵیان لێ هەڵدەستا. چەند ئۆفیسێکی میریی وەک وەزارەتی بەرگری و ناوەندی پەیوەندییە بێتەلەکان، بۆمبی ئەمێریکییان وەبەر کەوتبوو، هێشتا هەر دەسووتان. بەڵام لە دوای گەیشتنە جێی ئەمێریکییەکان، دزەکان زۆربەی ئاگرەکانیان کوژاندبووەوە.

چووینە شێراتۆن. لە ١٩٨٤ لەو هۆتێلەدا خەوتبووم. شێراتۆنیش وەک بەغدا، بەرگی نابووتی لەبەر خۆی کردبوو، جێی نووستن نەبوو. یەک لە بڵندگەرەکان ئیشی دەکرد ئەویش ناوە ناوە لەکار دەکەوت. ڕێستۆرانتی هۆتێلەکە خواردنی نەبوو. ناچار لەگەڵ خاوەن کەبابخانەیێک ڕێک کەوتین گۆشتی بەرخ و فرێنجفرایز French fries (پەتاتەی سوورکراوە)و سالاتەمان بۆ ئامادەبکا، نرخی ڕۆژانەی خواردنەکەش نەدەگۆڕا. ئەو مەلەوانگەیەش کە لە ١٩٨٤، خانمە میواندارەکانی فڕۆکەکان بە سینگی ڕووتەوە مەلەیان تێیدا دەکرد، زبڵ و قوڕەشینی لەناودا تێکەڵ یەکتری ببوو. وام زانی کە ژوورەکەی من نۆزدە ساڵ بوو پاک نەکرابووەوە.

لە حەفتەی یەکەمی دوای ڕووخانی سەددامی، بەغدا تووشی گێرەشێوێنی هاتبوو، بەڵام جێی مەترسی نەبوو. لەو شارە پێنج ملیۆن کەسییەدا، هەموو دەسەڵاتەکان بەجارێک بنگۆم بوون. نە حکومەت نە سوپا نە پۆلیس هیچیان نەبوون. شەو بەغدا تاریک بوو، تەنیا لێرەو لەوێ هەندێ ئاگری جیاجیاو لایتی ئوتوموبێلان و هەندێ ماڵیش کە جێنەرێیتەریان هەبوو، دەترووسکانەوە. لەشکری ئەمێریکا لە چوارڕیان و سەر پردەکان سەنگەریان گرتبوو. شارەکە لەوە گەورەتر بوو کە بتوانن بەتەواوەتی

کۆنترۆڵی بکەن.

ڕۆژی پاش گـەیشـتنمـان، چوومـە گـۆڕەپانی فـردۆس، تا سـەیرێکی پەیکەرە ڕووخاوەکەی سەددامی بکەم. کابرایێک منداڵێکی بچووکی لەگەڵ بوو، بە منداڵەکەی چەپکە گوڵێکی پێشکەش کردم. لە نزیک بازاڕێکی سەر شەقامێک، وێنەی گەنجێکم گرت، پێلاوی لە وێنەیێکی گەورەی سەددام حوسێنی دەگرت و بە سۆڵی پێڵاوەکەی لە وێنەکـەی دەدا. ئـەمـەش نیـشـانەی ڕێز لـێ نەگـرتنە. لەبەر دەرگـەی وەزارەتی بازرگـانیش، کـابرایێک پێی لە نـاو گـوێی پەیکەرێکی ڕووخـاوی سـەددامـی دانابوو. زەردەخـەنەیێکی کردو ئاماژەی بۆ گوێی خۆی کرد، نیوەی لای سـەرەوەی نەمابوو. ڕژێمی سـەددامی بە شێوەیێکی ئاسایی گوێچکەیێکی ئەو سـەربازانەی قوت دەکرد کە لە ڕیزەکانی سوپا ڕایان دەکرد.

لەو ڕۆژان، کەس لە ئەمێریکییەکان تووڕە نەبوو. تەنانەت قوربانیانی شەڕەکەش لێیـان سڵ نەبوون. لەگـەڵ برایان ڕۆسی سـەردانییـەکی مـەنسـورمـان کـرد. عـارەبە دەوڵەمەندە سوننەکانی بەغدا لەوێ دەژین. ڕۆژی ۷ی نیسانێ، هێزی ئاسمانی وڵاتە یەکگرتووەکـان سێ خـانووی لـەو گـەڕەکـە خـاپوور کـرد. ڕاپۆرتـە هـەواڵگرەکـان ئامـاژەیان بەوە دابوو کـە سـەددام لە ژێرزەمـینی یەکـێک لەو سێ مـاڵانەدا خـۆی حـەشـار دابوو. هەژدە کـەس لەو پەلامـارەدا کـوژران. هـەندێکیـان منداڵ بوون. تەقینەوەکەش زەندەقی گەڕەکێی بردبوو. خانووەکان لە ۱۹٥۰کاندا دروست کرابوون و هیچ نیشانەیێکیش نەبوو کە لەبن ئەو خـانووانە ژێرزەمین هـەبووبێ. وێنەمـان گرت بێی ئەوەی کـەسـێک یان هەراسـانمان بکا یان هـەڕەشـەیێکمـان لێ بکا. چەند دراوسێیەک ئێمەیان بانگهێشتی ماڵەکانیان کرد.

هێـشـتـا یادەوەری کـارە خـراپەکـانی ڕژێمی ڕووخـاو زیندوو بوو. بۆ گـەڕانمان بەدوای بەڵگەنامـەکان، یەکەمـجار ڕوومـان لە بارەگای ئیـستیـخبـاراتی عەسکەری ئێراقی کرد، کە یەکێک بوو لەو تەلارە دەگمەنانەی کە سوپای ئەمێریکی دەیپاراستن. چەند جوامێرێکی ئێراقی لەو سەربازە ئەمـێریکییانە دەپاڕانەوە کە لەسـەر تانکە زەبەللاحـە شـەست تەنییـەکـانیـان دانیـشـتـبوون، تا ڕێگەیان پێ بدەن بچنە ناو تانکەکـانیـانەوە. کابرایێک وێنەیێکی خـۆی نیشـان دام کە لەگـەڵ دوو برای پێکەوە

گرتبوویان. بیست ساڵ بوو هەرسێکیان گیرابوون. ئەویان ئازاد کرابوو، برایەکیانی ئیعدام کرابوو، برای سێیەمیشیان فەرمانی کوشتنی درابوو، بەڵام هەرگیز خێزانەکەی نەیزانی ئایا ئیعدام بیوو یان نا. ئومێدیان دەخواست سەرە داوێکیان وەدەست بکەوێ. کابرایێکی تر لەو برایەی دەگەڕا کە لە ١٩٨١، کاتێک کە تەمەنی ٢٠ ساڵی بوو ئیتر چاوی پێی نەکەوتبووەوە. برایەکەی لەبەر ئەوە گیرابوو چونکە ئازادانە بۆ کرێکارێکی یەمەنی میوانیان قسەی کردبوو؛ ئەویش بە ڕاپۆرت لەسەری نووسیبوو. سەرم سوڕما، لە جیاوازی نێوان سیمای ئەو پیاوانەی قسەیان لەگەڵ مندا دەکردو سیمای وێنەی ئەوانەی کە بزر ببوون. زۆربەی بزرەکان یان برا گەورەی یندووەکان بوون یان ئامۆزایان بوون. هەندێک لەو باوەڕەدا بوون کە هێشتا خزمە ونەکانیان هەر لە زیندانەکانی ژێرزەمین دابوون و داوایان لە ئەمێریکییەکان دەکرد ژووره نهێنییەکانی زیندانەکان بدۆزنەوە. ئەگەر پتر لە ژێرزەمینەکان بمێنن ڕەنگە لە برسانا بمرن. لەڕاستیدا زۆربەی ئەوانەی کە بزر ببوون لە پاکسازییەکەی ١٩٨١ڕا، کەس هیچی لێیان نەبیستبوو.

لە بارەگای کۆمیتەی ئۆلمپی ئێراقیش، کە تا چەند ڕۆژێک پێشتر، داردەستێکی عودەی سەددام حوسێنی بوو، قسەم لەگەڵ کابرایێکی یەک قاچ کرد. کابرایەکە سەرپەرشتی هەندێ لە خزمەکانی خۆی دەکرد کە پاتاری کۆمیتەکەیان لە دوو کووچکووچە بار دەکرد کە دوو گوێدرێژ ڕایان دەکێشان. پێی گوتم کە لاقەکەی بە، "قوربانی بوشی یەکەم بوو". چونکە لەوکات سەرباز بوو و بەشداری پەلامارەکەی شوباتی ١٩٩١ی سەر خەفجی عارەبستانی سعودی دەکرد. گلەیی لە سەددامی کرد چونکە یارمەتی نەدا یەکێک ئەو ژێرزەمینانەی نیشان داین کە عودەی ئەو وەرزشوانانەی تێدا ئەشکەنجە دەدا کە نەیاندەتوانی بە دڵی ئەو سەرکەوتن لە یارییەکان وەدەست بێنن.

ئاشکرا بوو کە زۆر لە دانیشتوانی بەغدا بە نەمانی سەددامی شادمان بوون. بایەخیان بەوە نەدەدا کە کێ بوو ئەوەی سەددامی لادا، ئەوەی بەلایانەوە گرینگ بوو تەنیا ئەوەبوو کە ترس و لەرزی بیست ساڵەی چووی ئیتر نەما. بەهۆی ئەو ڕاووڕووتەوە، هەست بەوە دەکرا کە ئەمە کارێکی ڕاست نەبوو. لە ئێوارەی ١٥ی

نیسانێ، له یادداشتنامه‌که‌مم نووسی: "له‌و ده‌مه‌ی ته‌ماشای به‌غدا ده‌که‌م، ترسم له‌وه هه‌یه که ولاته یه‌ککگرتووه‌کان لێره زۆر خراپی به‌سه‌ر بێ. ئاخر له‌م شاره تاریک و به‌تاڵ و پڕ ترسه‌دا هیچ هه‌ستێک به ئازادبوون ناکرێ. ئه‌گه‌ر ئه‌مرۆ مرۆڤ ئه‌م چه‌شنه هه‌سته‌ی له‌لا زاڵ بێ، ئه‌رێ ده‌بێ دوای سێ مانگی تر، چ بقه‌ومێ؟"

تیمه‌که‌ی ئێی بی سی، به ئاسانی به‌ڵگه‌نامه‌کانی دۆزینه‌وه. له ماڵی عوده‌ی سه‌ددام حوسێنی، له سه‌ر که‌ناره‌کانی دجله، بۆب باوه‌ری سیخوڕی خانه‌نشینی سی ئای ئێی، که یه‌کێک بوو له ڕاوێژکارانی ئێی بی سی نیوز، هه‌موو تۆماره تایبه‌تییه‌کانی فیدائییه‌کانی سه‌ددامی دۆزییه‌وه. ئه‌و میلیشیانه‌ی فیدائییه‌کانی سه‌ددامی چه‌ندین بۆسه‌ی کوشنده‌یان له‌و هێزانه‌ی ئه‌مێریکا دانا‌وه که به‌ره‌و به‌غدا ده‌هاتن. پاشتر هێزی سه‌ره‌کی یاخییه‌کانیان پێکهێنا. فایله‌کانی نوژداری عوده‌یشمان دۆزییه‌وه. چه‌ند په‌یوه‌ندییێکی له‌گه‌ڵ نوژدارێکی پسپۆری بریتانی تێدا بوو، باسی ده‌رئه‌نجامه‌کانی ئه‌و نه‌خۆشییه‌ی جگه‌ری ده‌کرد که به هۆی بادەنۆشییه‌وه دووچاری مرۆڤ دێ.

له به‌رانبه‌ری شێراتۆن و له‌وبه‌ری گۆڕه‌پانی فرده‌وسه‌وه، ناوه‌ندێکی گه‌وره‌ی ئێراقیمان دۆزییه‌وه که شوێنی تۆمارکردن و گوێگرتن له ته‌لیفۆنه‌کانی هاوڵاتیان بوو. له پشت چه‌ند ده‌رێو دیوارێکی ساخته‌وه، په‌یژه‌ی ژێرزه‌مینێکمان دۆزییه‌وه، چه‌ند ژوورێک له‌وێ هه‌بوو، ژووره‌کان پڕبوون له‌و ده‌ستنووسی ئه‌و وتوێژه ته‌لیفۆنیانه‌ی که تۆمار کرابوون. په‌یوه‌ندییه‌کانی نه‌ته‌وه یه‌ککگرتووه‌کان و باڵیۆزخانه بیانییه‌کانیشی تێدا ڕه‌شنووس کرابوون. ده‌زگا سیخوڕییه ئێراقییه‌کان جاسووسییان له‌سه‌ر یه‌کتریش کردبوو. چه‌ندین کاسێتی تۆمارکراوی قسه‌کانیان له‌وێدا هه‌بوو. برایان هه‌ندێ له کاسێته‌کانی زیندی بۆ بینه‌رانی گواسته‌وه. بۆبیش ده‌قه وه‌رگێڕدراوه‌کانی خوێندنه‌وه.

خاوه‌ن ماڵه‌کان پێیان گوتین که شه‌و یه‌کێک هاتۆته لایان و پێی گوتوون ئه‌و په‌ڕانه بسووتێنن. له‌و باوه‌ڕه‌ش دابوون که کابرای شه‌وگه‌رده‌که، ئه‌ندامێکی ده‌زگای سیخوڕی سه‌ددامی بووه. ته‌لیفۆنێکم بۆ ئۆفیسی وۆڵفویتزی کرد، ئۆمێدم ده‌کرد ئه‌و ده‌ستنووسانه بپارێزێ. پێشنیاریشم کرد که فایله‌که‌ی فیدائییه‌کانی سه‌ددامیشیان

بۆ بنێرم. هیچ نەکرا هەرچەندە کە چوار دەوری شیراتۆن سەربازی ئەمێریکە بوون، بەڵام ئۆفیسی بریکاری وەزیری بەرگری نەیتوانی شتێک بکا دۆکیومێنتەکانی فیدائییەکانی سەددامی ببەن. ئاخر پیاو بیر لەوە دەکاتەوە کە ئێستا ناو و ئەدرێسی ئەو کەسانە دەزاندرا کە ئێستاکە پەلاماری هێزەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان دەدەن. نا نەخێر، ئەو دەستنووسانەشیان نەپاراستن.

لە هەموو دزییەکان ناهەموارتر دزینی مۆزەخانەی نیشتمانی ئێراقی بوو. ڕۆژی ١١ی نیسان بوو، دوو ڕۆژ بوو ڕژیمەکەی سەددامی ڕوخابوو و وڵاتە یەکگرتووەکانیش بە یاسایی لە بەغدا بەرپرسیار بوو، کاتێک کە دزان پەلاماری مۆزەخانەکەیان دا. مۆزەخانەکە هەندێ کاری هونەری وای تێدا هەبوو کە هی سەردەمی دەسپێکی شارستانییەتی مرۆڤ بوو. پاشماوەی شارستانییەکانی بابل و ئوورو سۆمەرو ئاشووریی تێدا بوو. هیچ گومان لەوەدا نییە، کە ئەو مۆزەخانەیە دەستەیێک لە گرینگترین کۆکراوەی ئارکیۆلۆژیای هەموو دونیای تێدا هەڵگیرابوو. بە تەنیا کەلتووری ئێراقی نەبوو، بەڵکو هی هەموو مرۆڤایەتی بوو. شوێنەوارناسە ئەمێریکییەکان دەیانزانی کە مۆزەخانەکە، لەبەر شەڕەکە، لە مەترسی دابوو، بەبەردەوامی داوایان لە پێنتاگۆن کرد کارێکی وا بکا بیپارێزێ. لەپێش شەڕەکە، لامعە گەیلانی، شوێنەوارناسێکی ستافی مۆزەخانەکەی بوو، بە خۆی چووە وەزارەتی دەرەوەی وڵاتە یەکگرتووەکان، بۆ ئەوەی هۆشدارییان پێ بداو پێیان بڵێ گومان لەوەدا نییە کە دەدزرێ. وەزارەتی دەرەوە لیستێکی پەنجا ناوی ئەو شوێنانەی بۆ پێنتاگۆن نارد کە پێویست بوو لەناو بەغدادا، بپارێزرێن. مۆزەخانەکە ژمارە دووی سەر لیستەکە بوو (تۆمارەکانی ڕژێمی سەددامی ناوی یەکەم بوو، من خۆم ئەو کەرستانەم بە چاوی خۆم دیت لە بارەگای وەزارەتەکان و بنکە سیخوڕییەکاندا، دڕابوون و تێکەڵو پێکەڵ کرابوون.) مۆزەخانەکە نەپارێزرا

کە دزەکان پەلاماری مۆزەخانەکەیان دا، کارمەندانی مۆزەخانەکە، چوونە لای ئەو مارینزانەی کە لە چوارڕیانێکی نزیکەوە بوون، هاواریان بردە بەریان بێن مۆزەخانەکە ڕزگارکەن. هەرچەندە تەنیا سەد یاردە لەوێ دوور بوون، نەهاتن و نەیارنەتیشیان دان[٤٨]. کارمەندەکان هەندێ لە شوێنەوارە بەهادارەکانیان کۆکردەوە، بەڵام شوێنەواری زۆر گرینگتر هەبوو یان بەهۆی سەنگینییەوە نەدەکرا

بگوازرێنەوە یانیش زۆر ناسک بوون نەدەوێران دەستیان لێبدەن نەکا بشکێن و لەوێ مانەوە. سی و هەشت لە بەهادارترین شوێنەوارەکانی ناو مۆزەخانەکە دزران و هەندێکی تریش وردوخاش کران. دزەکان دەرگەی ژێرزەمینیان شکاندو چوونە ژوورێ. هەزاران شتیان دزی. لەوانە پتر لە پێنج هەزار مۆری لوولەییان برد. ئەو مۆرانە کۆنترین نووسینی دونیایان لەسەر نووسرابووەوە. هەموو میدیای جیهانی ڕوویان لە مۆزەخانەکە کردو بەمەش تا ئەوپەڕ بەڕێوەبەرایەتی بوشیان هەراسان کرد.

بەیانی ڕۆژی ١٥ی نیسان گەیشتمە مۆزەخانەکە. ئەوڕۆژی مارینزەکان ڕەوان کرابوون تا تەلاری مۆزەخانەکە بپارێزن. بەڕێوەبەری مۆزەخانەکە کابرایێکی ئاشوری چوارشانە بوو، ناوی دۆنی جۆرج بوو. دۆنی منی بەناو تەلارەکەدا گێڕا. پەیکەرو گۆزەکان بەو گۆڕەدا کەوتبوون. سندووقی کۆگاکان ژێروژوور کرابوون. سەری پەیکەرێکی قەشەنگی ژنێکی حەزەری نەمابوو. ژنەکە دانیشتبوو. پەیکەرەکە هی سەردەمی هێلێنی بوو. کتێبخانەی مۆزەخانەکەو گەلێک لە تۆمارەکانی تێکوپێک درابوون. جۆرج بۆی ڕاڤە کردم کە کاتێ ئەو بەڵگەنامانە نابن، تەختەیێکی کۆن، لە نووسراوێکی گرینگەوە کە ڕابردووی دووری مرۆڤایەتی ئاشکرا دەکا، دەبێتە تەختە قوڕێک کە چەند خەتخەتۆکەیێکی لەسەر کراوەو چیتر نا. نەک هەر بەهۆی بزربوونی مۆرە لوولەییەکانەوە بوو دۆنی ورەی ڕما بوو، بەڵکو بزر بوونی هەزاران شتی تازە دۆزراوەی کەتەلۆگ نەکراو، بەجارێک شڵەژاندبوویان.

کاتێکیش کە ڕەمسفیلد بەهای لەدەستچووەکانی کەم کردەوەو کردیانیە "لەبیرکراوەکان"؛ بارەکەی هێشتا گرانتر کردو پاشان گلەییشی لە کەناڵە تەلەڤزیۆنییەکان کرد چونکە دووبارەو سێبارە وێنەی ئەو کابرایە نیشان دەدەن کە گۆزەڵەکەی بارکردبوو. (ڕەمسفیلد گەلێک قسەی نابەجێی دەربارەی ئێراقێ کردن،

---

(٤٨) ئاشکرایە کە ئەمە هەڵەی ئەوان نەبوو. فەرمانی ئەومیان پێ نەدرابوو ماڵ و موڵکی ئێراقی بپارێزن. ڕەنگە تووشی گرفتی گەورە بهاتبانا ئەگەر شوێنەکانی خۆیانیان بەجێ هێشتبا، بێ ئەوەی فەرمانیان پێ بکرێ. بەتایبەتیش ئەگەر ناچار بانا هێز لە ناو مۆزەخانەکەدا بەکار بێنن.

تا وای لێ کردم لە خۆم بپرسم هۆی چییە ئەم کابرایە بە کارێکی گرینگ دەزانێ کە وەزیری بەرگری کۆنگرەی ڕۆژانەی ڕۆژنامەوانی هەبێ، کە ئەمەش کارێکە هیچ یەک لەوانەی لە پێشی ئەو هاتوونە نەیانکردووە.)

بەڕێوەبەرایەتی پاشتر ویستی ڕووداوەکە وەک کارێکی بێ بەها نیشان بدا، کە واشنەبوو. وۆلفویتز پاشتر بە کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی سێنەتی ڕاگەیاند کە لە سی و هەشت شت بترازێ، ئەوانی دیکە هەر هەموویان گەڕاونەتەوە. ئەو فێڵە بووە هۆی سڕینەوەی هەزاران دەستکردی گرینگی مرۆڤ کە شکان و ئەوانەش کە لە کۆگەکاندا دزران. بێگومان هەزاران مۆری لوولەییشیان تێدا هەبوو کە نەمان. باسی ئەوەشی نەکرد کە لەمیانی ئەو سی و هەشت ئایتمە ونبووانەدا، بەهادارترین گەنجینەی مۆزەخانەکەی تێدابوو.

دزەکان کتێبخانەی نیشتمانی ئێراقییان سووتاند. لەو کتێبخانەیەدا دەستخەتە کۆنەکان هەڵگیرابوون. هەر کتێبێک کە لە ئێراقێ دەرچووبێ، بەرگێکی لەو کتێبخانەیەدا پارێزرا بوو. هەر لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەمەوەڕا تا ئیمڕۆ، هەر ڕۆژنامەیێک لە بەغدایێ چاپ کرابوو، چەند دانەیێکی لەو کتێبخانەیەدا بەرگ کرابوو. بەم کارە نامۆیەیان، دزەکان تۆماری بەڵگەداری مێژووی نوێی ئێراقێیان سڕیەوە. مۆزەخانەی هونەرە جوانەکانی ئێراقیش زۆربەی کۆکراوەکانی خۆی لەدەست دا.

چونکە بەڕێوەبەرایەتی نەیتوانی نە مۆزەخانەی ئێراقی و نە کتێبخانەی نیشتمانی بپارێزێ، بۆیێ لە ڕاپەڕاندنی ئەرکی یاسایی خۆی وەک هێزێکی داگیرکەر کە دەبێ میراتی کەلتووری ئەو وڵاتە بپارێزێ، هەرەسی هێنا. ئەمەش دەرئەنجامی ئەو خۆبەزلزانینەی ئەو بەڕێوەبەرایەتییە بوو کە گوێی لە هیچ پسپۆڕێک و شارەزایێک ڕانەگرت بەم جۆرەش لە گەڵ وەزارەتی دەرەوەی خۆی کەوتە شەڕو گوێی لە ڕێنماییەکانی شارەزایانی نەگرت و یان هیچی لە یاسای نێونەتەوەیی نەدەزانی یانیش هەر پشتگوێی خست. هیچ بیانوویێک نییە بڵێی ئێراقییەکان بوون دزییەکانیان کرد. دزییەکان ئەنجامێکی ئاسایی نەمانی ئەو یاساو زەبتوڕەبتە بوو کە لەدوای ڕووخانی ڕژێم نەما.

له سێ حەفتە پتر لە ئێراقێ مامەوەو بێ ئەوەی کەسێک بڵێ کێوە دەچی، گەلێک لە تەلارو دەزگا گرینگەکانی ئێراقێ گەڕام. سەردانی تەلاری وەزارەتی دەرەوەم کرد، وەزارەتی بازرگانیم تەنی، کۆشکی مەلیکی پێشووی ئێراقیم دیت و سەرم لە ناوەندی ئۆلیپی ئێراقی دا، بۆ زانکۆی میسل چووم، ماڵی عودەی سەددام حوسێنم پشکنی، زیندانەکان و کۆگاکانی سوپاو دەزگاکانی هەواڵگریشم پشکنی. کەس پێی نەگوتم ماڵت لە کوێیە. دزەکان لە هەر هەموو ئەو شوێنانەن دەست بەکار بوون کە سەردانیم کردن، کەچی هیچ هەستێکم بە هیچ مەترسییەک نەکرد. بە پێچەوانەوە، هەموویان زۆر دۆستانە بوون. تەنانەت هەندێکیان داوایان لێ کردم لەکاتێک کە سامانی گشتییان بار دەکردە نێو کووچکووچەکانیانەوە، وێنەیان بگرم. لە وەزارەتی دەرەوە، دزەکان یارمەتی تیمەکەی ئێی بی سییان داو بەڵگەو دسکیان بۆ کۆکردنەوە. هەندێ جار نووسراوی ڕەسەنی پەیمانەکانیان دەسووتاند بۆ ئەوەی ژێرزەمینەکان بۆمان ڕەوشەن بکەنەوە. (چەند پەیماننامەیێکم ڕزگار کرد. یەکێکیان نەهرۆو ئەویتریان تیتۆ مۆری کردبوو، هەردووکیانم لە کوردستان، تەسلیمی دەستی بەرهەم ساڵحی کرد.)

گەلێک لەو شوێنانەی سەردانیانم کردن، بایەخی هەواڵگری خۆیانیان هەبوو. خۆ ژمارەی سەربازانی ئەمێریکی لە بەغدا، زۆر لە تیمە ڕۆژنامەنووسەکەی ئێی بی سی زۆرتر بوو، کەچی نە پێنتاگۆن و نە سی ئای ئێیش هێندە خۆیان ماندوو نەکرد هەر بۆ هەواڵگری ئەو شوێنانە بۆ خۆیان گر دەن. بەشێک لەو بیانووانەی بوونە هۆی بەرپابوونی شەڕەکە، ئەوەبوو کە بەڕێوەبەرایەتی بوش دەیگوت ئێراق بە نهێنی کەرستەی چەکی کۆمەڵکوژی بەدەست هێناوە (وەک کێکی زەرد لە نایجیریا)و دک چێنیی بریکاری سەرۆکیش مکوڕ بوو لەسەر ئەوەی کە باڵیۆزخانەکانی سەددامی پەیوەندییان لەگەڵ القاعده هەبوو. وەزارەتی دەرەوە ڕاست بوو کە داوای کرد ئەو بەڵگەنامانە هەڵگرن کە تایبەت بوون بە جموجۆڵی هەواڵگری ئێراقی لە هەندەران و بەو دەستکەوتانەش کە لە بواری کەرستە قاچاغەکان پەیدایان کردبوو. بەڵام من تەنیا دزەکانم دیتن سێف[٤٩]ەکانی وەزارەتی دەرەوەیان دەکردەوەو پێیانەوەش دیار بوو کە نیگەران بوون چونکە تەنیا بەڵگەنامەیان دەهاتە دەست و هیچ پارەیان نەدەدۆزییەوە.

له کۆتاییدا ئینجا کاربەدەستانی نوێی ئێراقی هەندێ بەڵگەنامەی گرینگیان لە وەزارەتی دەرەوەدا دۆزییەوە. بەڵگەنامەکان ناوی ئەو کەسانەی تێدابوو کە هبوودیان لە ئێراقێ وەرگرتبوو، ئەمەش بووە سکاندالێک (فەزیحە) لە پرۆگرامی نەوت بەخۆراکی نەتەوە یەکگرتووەکاندا کرابوو. ناوی ئەو جیهادییانەشی تێدابوو کە بەر لە دەستپێکی شەڕەکە بۆ ئێراقێ هاتبوون. دەبێ چەند زانیاری پتر بەدەست بهاتبایە ئەگەر تەلارەکە بپارێزرابا.

ئەوەی من بینیم کاری نەشارەزایان بوو. سەربازە ئەمێریکییەکانی بەغدایان گرت، بە ژن و بە پیاوانیانەوە، هەموویان پیشەوەرو دسیپلین و بەڕێزو کارامە بوون. بەڵام بەداخەوە! سەرکردە سیاسییەکانیان هێندە جەختیان لە سەر کێشەی شەڕەکە کردەوەو هێندە بەپەرۆشەوە بوون تا دوژمنە سیاسییەکانی ناوەوەیان ببەزێنن و هێندەش دڵنیابوون کە ئێراقییەکان بەپیری ئەو سێوە دێمۆکراسییەی ئەمێریکاوە دێن و هێندەش ئایدیۆلۆژییەکەیان کوێری کردبوون کە نەیانتوانی پلانێک دابنێن بۆ ئەوەی ئەرکە هەرە دیارەکانی دوای سەرکەوتنی سەربازییان رابپەڕێنن.

داگیرکردنەکەی وڵاتە یەکگرتووەکان کردی هەرگیز تۆقی ئەو گێرەشێوێنییەی لە مل نەبووە کە لە دەستپێکدا سەری هەڵدا. دزینی وەزارەتەکانی حکومەت و وێستگەکانی وزە، ئاشکرای کرد کە تا چەند مانگێک ناکرێ ئەو ڕاژەگوزارییانە دەست پێبکەنەوە. ڕەنگە هەندێکیان ساڵێکیشی پتر بوێ بۆ ئەوەی بێنەوە سەر دۆخی جارانیان و خزمەتەکان پێشکەشی هاوڵاتیان بکەنەوە. کە ئێراقییەکان ناچار بوون لە ماڵەکانیان دانیشن، چونکە ئۆفیسەکانیان تاڵان کرابوون؛ یان پێیان نەکرا کارگەکانیان بە ئیش بخەنەوە، چونکە وێستگەکانی کارەبا تێکچووبوون، هەستان ئۆباڵەکەیان لە ئەستۆی داگیرکەر بار کرد.

بەڕێوەبەرایەتی بوش گوتی چونکە پێشبینیان نەکردبوو ڕژێم ئاوا زوو بڕووخێ و بە هۆی خێرایی بەڕێوەچوونی هەڵمەتە سەربازییەکە بوو کە نەیانتوانی لە بەغدا یاسا پەیرەو و شارەکە سەقامگیر بکەن. هەندێک دەڵێن خۆ ئەگەر بەقسەی ژەنراڵ شنیسکیش بکراباو ژمارەیێکی زۆرتری سەربازانیش ڕەوانی ئێراقێ بکرابا، هێشتا

(٤٩) سێف = safe = قاسە.

هەر هیچی لە بارەکە نەدەگۆڕی، چونکە کردەوە سەربازییەکان هێندە خێرا بەڕێوە چوون، کە نەدەکرا بەو پەلەپەلە هێزێکی گەورە بۆ ناو بەغدا بچێ. ئەم بیانووە ناپەسندە.

تەنانەت بەو ژمارە سەربازانەی کە لە ٩ی نیسانێ لە بەغدا بوون، ولاتە یەکگرتووەکان دەیتوانی مۆزەخانەی شارستانی و کتێبخانەی نیشتمانی و بیست بارەگای وەزارەتە گرینگەکان بپارێزێ. ولاتە یەکگرتووەکان هیچ شتێکیانی نەپاراست؛ چونکە وەزیری بەرگری و گەورە یاریدەدەرانی هەرگیز وەبیریان دانەهات کە پاراستنی سامانی گشتی و سەقامگیری ولات لە ئێراقێ دوو شتی سەرەکی گرینگ بوون. سەرۆکیش هەر بیری لێیان نەکردەوە.

ڕەمسفیلد بەڕاستی بیری لەوە کردبووەوە کە وەزارەتی نەفتی ئێراقێ گرینگ بوو؛ بۆیێ کە ڕۆژی ١٥ی نیسان بەوێدا ڕەت بووم، تانکێکی ئەمێریکاو پەنجەژمێرێک سەربازم دیت لەناو تەلارەکەوەڕا، ژێرەڤانی دیوارە بڵندەکانی وەزارەتەکەیان دەکرد. لە نزیکی ئەوێش، وەزارەتی ئاودێری سووتابوو. بەم سووتانەشی هەموو نەخشەو پلان و ڕەشنووسی بەنداوە ئێراقییەکان و ئاوەڕۆو هەزاران کیلۆمەتر جۆگەو جۆبار لەناو چووبوون. نیازی ئەو ئیشەش دیار بوو. نۆیل سەردەستە بوو، بەلام ئەو ئاوەی کە ملیۆنەها هاولاتی ئێراقی پێویستییان پێی بوو، گرینگ نەبوو. زۆر ئێراقیش هەمان بۆچوونیان هەبوو.

ئێراقییەکان دوو جۆرە بۆچوونیان بەرانبەر بە تالانەکە هەبوو. لەو باوەڕەدا بوون کە ولاتە یەکگرتووەکان یان ئەو تواناو شارەزاییەی نەبوو کە سەقامگیری لە ولات ڕابگرێ یان هێندە خراپ بوو بۆیێ ویستی ولاتەکە خاپوور بکا. هەردوو بۆچوونەکەش بەرهەڵستکاری کردە کارێکی ڕەواو لۆژیک. قسەیێکی زێدە ناکەم ئەگەر بڵێم ڕەنگە لەو ڕۆژەی کە ولاتە یەکگرتووەکان بەغدای داگیر کرد، هەر لەو ڕۆژی کە ٩ی نیسانی ٢٠٠٣ بوو، شەڕەکەی دۆڕاند.

کە لە ئایارێ گەڕامەوە بۆ واشنتن، یەک کاتم لە پێنتاگۆن بەسەر برد، دیدارەکانی خۆمم بۆ پۆوڵ وۆڵفویتز گێڕاوە. سەربردەی تالانکردنی وەزارەتەکانی حکومەت و شوێنە پڕ کەرستە مەترسیدارەکان وۆڵفویتزیان زۆر نیگەران کرد. ئومێدم خواست

ئەو توورەیییەی وای لێ بکا ئەو هەڵانە ڕاست بکاتەوە کە بۆیم باس کرد، بەڵام بۆم دەرکەوت کە ئەو لە من توورە بوو چونکە ڕەخنەم دەگرت. دوای ئەو دیمانەیەش نە وۆلفویتزو نە ستافەکەی هیچیان چیتر وەڵامی تێلیفۆنەکانی منیان نەداوەو پەیوەندیم لەگەڵ پێنتاگۆن نەما. دوای پێنج مانگ وازم لە حکومەتی وڵاتە یەککرتووەکان نا.

# بەشی ٧

## ناتوانن هیچ شتێک مسۆگەر بکەن

هەرچەندە قەرار وابوو لە پاشی شەڕەکە جێی گارنەر Jay Garner حوکمداری ئێراقێ بێ، بەڵام تا ٢١ی نیسانێ، واتا تا دوازدە ڕۆژ پاش ئەوەی کە سوپا بەغدای داگیر کرد، هەر لە کوەیت ماوە. ژەنراڵ تۆمی فرانکس ڕێی پێ نەدا بچێ و گارنەریش بەخۆی لە چوونەکەی ڕشت نەبوو. تا ئەو گەیشتە بەغدا، شارەکە ئاڵۆزوپاڵۆز ببوو. دەسەڵاتێکی بێهێزی هاتە دەست و گەورەکانی لە واشنتن متمانەیان پێی نەما.

لە ٢٢ی نیسان بوو، گارنەر هاوڕێ لەگەڵ چەند ئەندامێکی تیمەکەی بۆ دوکان فڕین، کە هاوینەهەوارێکە کەوتۆتە سەر لێواری دەریاچەیێک لە سەر زێی سۆران (بچووک) دروست کراوە. لەوێ لەگەڵ جەلال تاڵەبانی و مەسعود بارزانیدا کۆبووەوە. گارنەر ویستی سەرکردەکانی کورد یارمەتی بدەن بۆ ئەوەی حکومەتی ئێراقی کاتی ئاوا پێکبێنێ کە بتوانێ لە چەند حەفتەیێکدا بارودۆخەکە ئارام بکاتەوە. کاکڵەی ئەو حکومەتە هەبوو. لە دیسێمبەری ٢٠٠٢، لە پێترۆڕۆڵ هیڵتنی لەندەن، ئۆپۆزیسیۆنی ئێراقی کۆبوونەوەو ئایندەی ئێراقییان تێکەوڵێکە کردبوو. ئۆپۆزیسیۆن ئەنجومەنی سەرکردایەتی ئێراقییان لە حەوت کەس پێکەێنابوو بۆ ئەوەی پێشڕەویان بکا. ئەنجومەنەکە لە هەردوو سەرکردەی کورد، تاڵەبانی و بارزانی و سەرانی هەردوو حیزبە دینییە شیعە سەرەکییەکە، عبد العزیز الحکیمی ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی و إبراهیم جەعفەری لە الدعوەو سەرکردە عارەبە سێکولارەکانیش، لەوانە أحمد چەلەبی لە کۆنگرەی نیشتمانی ئێراقی و عارەبێکی پارێزەری سوننەش بەناوی نصیر الجادرچی سەرۆکی پارتی دیمۆکراتی نیشتمانی، پێک هاتبوو. ئەنجومەنی سەرکردایەتی ئێراقی بە شێوەیێکی باش نمایندایەتی کوردو شیعەی

دەکرد، بەڵام سوننە عارەبەکان نا، چونکە بەزۆری لە دژی گۆڕینی ڕژێم بوون. (جادرچی پشتیوانییەکی بەرچاوی نەبوو.)

لە کۆنفرانسەکەی لەندەنی ٢٠٠٢، نیاز وابوو حکومەتێکی ئێراقی لەبر(بەدیل) پێک بێنن، بۆ ئەوەی یەکسەر دوای ڕووخانی ڕژێم دەسەڵات وەربگری. (هەرچەندە میدیا بە حکومەتی بانشگەی ناوزەد کرد، بەڵام چونکە بنکەکەی لە کوردستانێ نەبوو، بۆیێ بەشێوەیێکی تەکنیکی هیچ لە گۆڕێ نەبوو.) لە دوای ڕێنماییەکانی وەزارەتی دەرەوە، زالمای خەلیلزادی نمایندەی تایبەتی سەرۆک بوش بۆ ئۆپۆزیسیۆنی ئێراقێ، بە توندی بەرهەڵستی حکومەتێکی لەبری کرد. لە ئەنجامی ئەو بەرهەڵستی کردنە، چەلەبی فشاری خستە سەر سەرانی ئۆپۆزیسیۆنی بۆ ئەوەی بە پرنسیپ و شێوەی حکومەتەکە قایل بن. خەلیلزاد بەری بەو هەوڵەش هاوێشت.

جا کە گارنەر لە نیسانی ٢٠٠٣دا ویستی حکومەتێکی کاتی پێک بێنی، هەمیسان ڕووبەڕووی دەرئەنجامەکەێ بەرهەڵستییەکەی پێشانی وەزارەتی دەرەوە بووەوە. هەرچەندە هەموو پارتە سیاسییەکانی ئێراقێ لەسەر بنەمای بەرهەڵستی ڕژێمی سەددامی ڕێک بوون، بەڵام یەکیان نەگرتبوو. شیعەکان حکومەتێکی ئیسلامییان گەرەک بوو، کوردەکانیش دەیانویست سەربەخۆییە دیفاکتۆکەیان لە کوردستان بپارێزن و عارەبە سێکولارەکانیش دەیانویست حکومەتێکی ناوەندی بەهێزیان هەبێت و ئەوان تێیدا بالادەست بن. دۆزینەوەی بنەمایێک بۆ ئەوەی هەموو ئەو لایەنانەی لێ کۆبێتەوەو دابەشکردنی پۆستەکانی حکومەتیش بەسەر ئەولایەنانەدا، کاتی دەویست. بەو پێیەی کە چەلەبی لە لەندەن باشی تێگەیشتبوو، ئەنجامدانی ئەو ئیشە لەو کاتەی کە گۆڕینی ڕژێم هێشتا هەر بەقسە بوو، زۆر ئاسانتر بوو لە ئێستا، چونکە پارتەکان لەدوای تەپینی ڕژێم، خەریک بوون پاتاری بەغدای پایتەختیان لە نێوان خۆیاندا دابەش دەکرد.

لە ٢٣ی نیسانی ٢٠٠٣، گارنەرو تیمەکەی سواری هێلیکۆپتەرەکان بوون و چوون لە هەولێر لەگەڵ بارزانی ئامادەی خوانێکی نیوەڕۆ بوون. منیش لەوێ بووم. پروپاگێندەو لەیەکتری تێنەگەیشتن، کەشی دوای ململانێیەکەی دژوار کردبوو، بۆیێ پەیوەندیکردن و زانیاری گشتی ببوون بە بنەمایێکی پێویست. مارگرێت تەتوایلەر

ئەو ئەرکانەی بۆ گارنەر رادەپەڕاند. تەتوایلەر، لە بەڕێوەبەرایەتی یەکەمی بوش، یاریدەدەری کاروباری گشتیی وەزیری دەرەوەو لە ۲۰۰۱یشەوەڕا لە مەغریب، پۆستی باڵیۆزی وڵاتە یەکگرتووەکانی وەرگرتبوو. خانمی تەتوایلەر بە شێوەیێکی نادپلۆماتی لە پێش خانەخوێیەکانی گوتی کە پێشتر هەرگیز گوێی لە ناوی ئەنفال نەبیوو، کەچی ئەوان دەیانزانی لەو کاتانەی کە ئەنفال ئەنجام درا، ئەو گەورە گوتەبێژی وەزارەتی دەرەوە بوو. گارنەر لەدوای خۆی مێجەر ژەنراڵ بروس موری خانەنشینی بە بەرپرسی باکوور دامەزراند. شەوی پاشتر تاڵەبانی میوانداری موری کردو ئەویش دەمێکی باشی ئەو ئێوارەیەی بە ناوگەند کردنی تەتوایلەرو باربرا بۆدین بەسەر برد. باربرا بۆدین دیپلۆماتێکی کارامەو بەرپرسی ناوچەی بەغدا بوو. کە پێم گوت کورد دەستبەرداری پێشمەرگە نابن، مور گومانی لە قسەکەم هەبوو و لەوەڵامدا گوتی: "بەڵام تاڵەبانی وای بە گارنەر نەگوت. زانیم ئەرکەکەی گارنەر تووشی تەگەرەی گەورە دێ.

لە ۲۸ی نیسان، لە ناوەندی کۆشکی کۆنگرەکان لە بەغدا، گارنەر پێشوازی لە سێسەدو پەنجا ئێراقی کرد، بۆ ئەوەی حکومەتێکی ئایندە تاووتوێ بکەن. کۆبوونەوە نهێنییەکە بە خراپی ئامادە کرابوو، هیچ سوودێکیشی نەبوو، بەڵام گارنەر ناچار بوو بۆ قایلکردنی ئەوانەی لە بەڕێوەبەرایەتی بوون هاموشۆیێکی ئەو ئێراقییانەش بکا کە لە بانشگە نەبیوون. لە کاتێکدا کە گارنەر هیچ ئەجێندەیێکی نەبوو کە لە کۆبوونەوەکەدا باسی بکاو هیچ شارەزاییەکیشی لە دانوستانی سیاسیدا نەبوو، هێشتا هەر ویستی هەموو توێژە جیاوازەکانی کۆمەڵ لە پرۆسەکەدا پشکدار بن. کۆبوونەوەکە بە ئاژاوە کۆتایی هات. تاڵەبانی و بارزانی لە هەمان ئێوارە بە سەرکەوتوویی هاتنە بەغدا من هەر لە کوردستانەوەڕا تا بەغدا لەگەڵ کاروانەکەیاندا ڕانەندەیم کرد بەڵام درەنگ گەیشتینە جێ و نەکرا کار لە کۆبوونەوەکەدا بکەن.

لە ٥ی ئایار بوو، گارنەر ڕایگەیاند کە لە ماوەی دە ڕۆژی ئایندەدا حکومەتێکی کاتی ئێراقی پێک دێنێ. پێنتاگۆن کە گارنەر کاری بۆی دەکرد، ویستی بە زووترین کات دەسەڵات بە ئێراقییان بداتەوە. ئەمەش ئەوەی دەگەیاند کە هاوپەیمانییەکی نێوان کوردو پارتە ئایینییە شیعەکانی بانشگەو پێکدێت و شیعە سێکولارەکانی

بانشگەش بە توندی تێیدا ئامادە دەبن[٥٠]. هەرچەندە کە هەڵوێستی پێنتاگۆن ئاشکرا بوو، بەڵام لە بێبەختی گارنەر بوو کە بەڕێوەبەرایەتی هێشتا بڕیاری نەدابوو ئایا حکومەتێکی کاتی دەویست یان نا. هەندێ لە لایەنەکانی ناو بەڕێوەبەرایەتی دەیانویست حکومەتێکی ئێراقی بەرفرەوانتر پێکبێ. وەزارەتی دەرەوە مەرەقی بوو ڕۆڵێکی پتر بداتە سەرکردە عارە نا-بەعسییەکانی ناوەوەی ئێراقێ. بەڵام وەزارەتی دەرەوە نەیتوانی ئەو سەرکردانەی لە ناوە بوون دەستنیشان بکا، چونکە ئەو توندیو تیژییەی ڕژێم کەسێکی لە ناوەوە نەهێشتبوو هیچ سەرکردەیێکی نا-بەعسی بتوانێ تەنیا ئحمێکیش بکا، ئەوانەی هەبوون یان لە بانشگە بوون یان لە کوردستان دەژیان. جا بۆئەوەی حکومەتێکی بنکە فرەوانتر دابمەزرێ، پێویست بوو حکومەتێکی داگیرکەر بۆ ماوەیێکی پتر کارەکان بەڕێوە بیات.

لەنێوان پیشەوەرانی سیاسەتی دەرەوە، کەسانێک هەبوون دەیانویست هاوبەشی نێونەتەوەیی لە بەڕێوەبردنی ئێراقێ لەدوای شەڕی بەرفرەمتر بکاو نەتەوە یەکگرتووەکان لە کارەکە پشکدار بکا، بۆ ئەوەی لەلایێکەوە سوود لە شارەزایییەکەیان وەربگیرێ و لەلایەکەی تریەوەش ڕەوایییەکی پێ بدا. لایەنە ئایدیۆلۆژستەکانی ناو بەڕێوەبەرایەتی ویستیان ئەمێریکا ئێراقی دوای شەڕەکە، لە شێوەی جەرمەنستان و ژاپۆن دووبارە دروست بکاتەوە. بە بۆچوونی وان، پێویست بوو ئابووری ئێراقێ بە پێی بنەمای بازاڕێکی ئازاد کار بکاو باجێکی دەرامەتی یەکسانی هەبێت و پیشەسازی و کەرتی ئۆیلەکەی تایبەتی بن و سستمێکی نوێی لە بواری پەروەردەدا هەبێ، سوپایەکەی وەک شێوەی سوپای نێیتۆ بێ و حکومەتێکی دوورە ڕەگەزیی دوور لە تایفەگەری بۆ دابمەزرێ. ئەم سەرکەوتنە عەسکەرییە خێرایەی بەسەر سەددامی بەدەست هات، ئەو گێرمشێوێنییەی لەبیری ڕەمسفیلدو زۆر لە پارێزگارە گرینگە تازەکان بردەوە کە لە وڵات بەرپا ببوو و بۆ ئەوە هەنگاویان دەهاوێشت ئەم ئەجێندە پڕ ئومێدە بەڕێوە ببەن.

هەرچەندە چەند مانگ بوو بینەوبەردەی ئایندەی ئێراقێ لە نێوان بەڕێوەبەرایەتی

---

(٥٠) ئەمە ئەو حکومەتە هاوپەیمانەیە کە لە ئەنجامی ئەو هەڵبژاردنەی یەنایری ٢٠٠٥ هاتە کایەوە کە عارەبە سوننەکان بۆیکۆتیان کرد.

و ڕۆژنامەکاندا تاووتوێ دەکرا، بەڵام هێشتا کێشەی چۆنیەتی بەڕێوەبردنی وڵاتەکە نەگەیشتبووە بەر دەستی سەرۆک تا بڕیارێکی لێ بدا. لە ئەنجامدا لایەنە نەیارەکانی ناو بەڕێوەبەرایەتی هەرکەسەو بۆ خۆی ڕاکێشا. دوو ڕێبازی سیاسی بەرواڵەت ژیرانە لە ئارادا هەبوو؛ یان بە خێرایی دەسەڵات بۆ ئێراقییەکان بگەڕێننەوە، یانیش داگیرکردنێکی توندوتۆڵ پەیڕەو بکرێ، کەچی هیچیان نەکران. بەڕێوەبەرایەتییەک کە کەمتر پلانی کاتی تەنگانەی بۆ ئاسایشی نەتەوەیی هەبێ، دەبوو، بەر لە دەسپێکی شەڕەکە، سەرۆک بڕیاری چارەسەرکردنی ئەو کێشە بنەڕەتییانەی بدابا کە لە دوای شەڕ لە ئێراقێ سەر هەڵدەدەن. کەچی بوش هیچ بڕیارێکی لەو شێوەیەی دەرنەکرد.

ڕەمسفیڵد، لە کۆتایی نیسان، بە گارنەری گوت چیتر پێویستییان بە کارەکانی نەمابوو. جۆون ساوەرز، باڵیۆزی بریتانیا بوو لە میسر، تۆنی بلێری سەرۆک وەزیرانی بریتانی ڕەوانی بەغدای کردبوو، بۆ ئەوەی لەوێ چاودێری بارودۆخەکەی بۆ بکا. ساوەرز، لە دەربارەی گۆڕینی گارنەر، برووسکەیێکی بۆ داونینگ ستریت ناردو تێیدا نووسی: "لادانی گارنەرو نەهێشتنی ئوفیسی ئاوەدانکردنەوەو یارمەتی مرۆیی گێرەشێوێنییەکە باوەڕ ناکرێ. نە سەرکردایەتی و نە ستراتیژێک و نە کار ڕێکخستنێک، نە دەزگایێک هیچیان نییەو کەسیش نییە پەیوەندییەک لەگەڵ ئێراقییاندا بکا...گارنەرو تیمە ژەنراڵە شێست ساڵییەکەی قەوارەیێکی زلیان هەیە، بەڵام ناواخنیان نییە. بریتانییەکان شارەزاو کارامەیان ڕەوانی ئێراقێ کردو زۆر زووتر لە ئایدیۆلۆژستەکانی لە پێنتاگۆن و کۆشکی سپی بوون، تێگەیشتن کە داگیرکردنەکە کارەسات بوو. بلێر تاکە بیانییەک بوو کە بوش نەیتوانی پشتگوێی بخا.

بۆ ئەوەی شوێنی گارنەر پڕ بکاتەوە، ڕەمسفیڵد پەیوەندی بە ل. پۆوڵ برێمەری سێیەم، ناسراو بە جێری، کردو لێی پرسی ئایا دەیویست لە دوای شەڕی ئێراق بەڕێوە ببا. هەرچەندە بەڕێوەبەرایەتی گوتی کە گۆڕینی گارنەرو هێنانی بەڕێوەبەرێکی هەمیشە بۆ ئێراقێ، لە پلانی داگیرکردنەکەدا هەبووە، بەڵام برێمەر لە یادداشتەکەی (ساڵێکم لە ئێراقێ My Year in Iraq) دا دەنووسێ کە لەو ڕۆژەوەی پێیان گوتووە ببێتە بەڕێوەبەر تا گەیشتە بەغدا تەنیا دوو هەفتەی پێ چووە. کە

دەسەڵات لە گارنەر وەرگیراوەو برێمەر جێی گرتەوە، ئۆفیسی ئاوەدانکردنەوەو یارمەتی مرۆییش هەڵوەشاوەو دەسەڵاتی کاتی هاوپەیمانان CAP لە شوێنی ئەو دامەزرا. هەڵبژاردنی برێمەر، لە هەندێ لایەنیەوە، بۆ بەڕێوەبەرایەتی بوش کارێکی بێ وێنە بوو. جگە لەوەی کە برێمەر شارەزای لە کاروباری دەرەوە هەبوو، لایەنگرێکی توندی کۆمارییەکانیش بوو. لە میانی شارەزایی لە کاروباری دەرەوە، برێمەر یاریدەدەری تایبەتی هێنری کیسنگەری وەزیری پێشووی دەرەوە بووەو لە بەڕێوەبەرایەتی ڕێیگنیش باڵیۆزی بەرپرسی دژەتیرۆرو لە هۆڵانداش باڵیۆزی وڵاتەکەی بووە. لە ١٩٨٩ وازی لە کاری میری هێناوەو لە کۆمپانیای کیسنگەر ئەسۆشییێتس، کە کۆمپانیای هێنری کیسنگەرە، پۆستی ڕاوێژکاری پێدراوە. برێمەر هێندە متمانەی بەخۆی هەیە کە جارێکیان لەکن ڕاپۆرتنووسێک ناوی لەخۆی ناوە "بەردی بناغەی کۆماری"و بە توندی پابەندی بەهاکانی پارێزگارانە.

برێمەر هەرگیز نەچاوی بە ئێراقێ کەوتبووو نە عارەبی دەزانی و نە پێشتر، لە ناو کۆمەڵ، لە پاش شەڕو ئاژاوە کاری کردبوو و نە شارەزاییشی لە بنیاتنانەوەی وڵاتدا هەبوو. لە دوو حەفتەش کەمتر کاتی بەدەستەوە بوو بۆ ئەوەی لەو ئەرکە "ورد ببێتەوە" کە دەبوو جێبەجێی بکا، کەچی لە کاتی ئاسایی، ئەگەر ببێتە باڵیۆز لە هۆڵاندا، پێویستی بە چەند مانگ خوێندنەوەو دیدارو قسە هەبوو، تا بە چاکی لە ئەرکەکە بگا. بەر لە داگیرکردنی ئێراقێ، وەزارەتی دەرەوە لەگەڵ ئێراقییەکانی بانشگەو شارەزایان ئیشی کردو ملیۆنەها دۆلاری خەرج کردو پازدە بەرگ ڕێنمایی نووسییەوە تا بزانن چۆن لە پاشی شەڕی ئێراق بەڕێوە ببەن بەڵام بەڕێوەبەرایەتی لەناو خۆیدا هێندە نارێک و دابەشی سەر باڵە جیاوازەکان ببوو، تا ئەو ڕادەیەی کە وەزارەتی بەرگری (برێمەر کاری بۆ دەکردو ڕاپۆرتەکانیشی بۆ بەرز دەکردەوە) هەر باسی توێژینەوەکەی وەزارەتی دەرەوەی بۆ نەکرد. پاش ئەوەی برێمەر گەیشتە بەغدا ئینجا لە ڕێگەی میدیاوە زانی کە ئەو توێژینەوە هەبوو.

برێمەر لەو دەمەی کە خۆی لە کاروباری ئێراقێ شارەزا دەکرد، گەورە کارمەندانی ستافەکەی دامەزراندن. چەند باڵیۆزێکی خانەنشینیان تێدا بوو، هەندێکیان لە ماوەی ئەو پازدە ساڵەی کە لە وەزارەتی دەرەوە بوو، ئیشیان لەگەڵ کردبوو. ئەو گرووپە لە واشنتن، لۆبییەکی بەهێزی کۆمارییەکان بوون و شارەزای چۆنیەتی

ڕاپەڕاندنی کاروباری بیانی بوون. لە باڵیۆز هیوم هۆران بترازێ، ئەوانی تر هیچیان نە شارەزاییان لە ناوچەکە هەبوو نە ئاشنای زمانەکەشی بوون.

لە ٧ی ئۆکتۆبەر، برێمەر لەگەڵ سەرۆک بوش نانی نیوەڕۆیان خواردو پاشان کۆبوونەوەیەکیان کرد. پاش دەمێک پاوڵ و ڕەمسفیلدو ڕایس و ئەندرۆ کاردی گەورەی ستافی کۆشکی سپی بەشداری کۆبوونەوەکەیان کرد. بە قسەی برێمەری لە دانیشتنەکەدا بابەتی بەڕێوەبردنی کاروباری پاشی شەڕی بە تێروتەسەلی تاووتوێ کرا، بەڵام نە سەرۆک و نە تیمەکەی هیچ بڕیارێکیان دەربارەی پاشەڕۆژی وڵاتەکە نەدا. برێمەر داوای کرد دەسەڵاتی تەواوی، "ئەرکەکانی بەڕێوەبردن و یاسادانان و دادوەری" لە ئێراقێ پێ بدرێ و دەسەڵاتەکەی وەرگرت.

هەرچەندە سەرۆک بوش هەر لە دوای ١١ی سێپتێمبەر بڕیاری شەڕی لە دژی ئێراقێ دابوو، بەڵام هەرگیز کاری بۆ چۆنیەتی بەڕێوەبردنی ئێراقێ لەپاش شەڕی نەکردبوو. ئایا وڵاتە یەکگرتووەکان وەک چۆن ئەڵمانیاو ژاپۆنی بۆ ماوەیێکی زۆر داگیرکرد، ئاواش ئێراقێ بەڕێوەدەبا؟ ئایا حکومەتێکی کاتی دەبێ، ئەگەر بوو چۆن دەستنیشان دەکرێ؟ ئایا هەڵبژاردن دەبێ؟ ئەگەر بوو کەی دەبێ؟ دەستووری ئێراقێ چۆن دەنووسرێتەوەو چی تێدا دەنووسرێتەوە؟ هەڵوێستی وڵاتە یەکگرتووەکان لە بەرانبەر فێدراڵی کوردان و ویستی شیعەکان بۆ ئەوەی دەوڵەتێکی ئیسلامی پێک بێنن چ دەبێ؟ سوپای ئێراق و حیزبی بەعس چیان لێدەکرێ؟ ئەو هەموو کێشمەکێشەو شەڕە ناوخۆیەکانی ناوەوەی بەڕێوەبەرایەتی، دەبوو ئەو پیاوەی کە تەواوی ئەو دوو حەفتەیە خۆی بە ئێراقێوە خەریک کردووە، چارەسەریان بۆ بدۆزێتەوە.

لە ١٢ی ئایاری ٢٠٠٣ بوو برێمەر گەیشتە بەغدا. لە ١٦ی ئایارێ ئەنجومەنی سەرکردایەتی ئێراقیی پێکهێناو ئەمەش واتای ئەوەی دەگەیاند کە حکومەتێکی کاتی دروست نابێ و بەم زووانەش دەسەڵات تەسلیم ناکرێتەوە. ئەو ڕووداوە لەو ڕۆژە ڕووی دا کە جێی گارنەر گوتبووی لە ١٥ی ئایار بنەمای حکومەتێکی کاتی ئێراقی دادەمەزرێ. هەر لەو ڕۆژیش برێمەر بڕیاری ژمارە یەکی دەسەڵاتی کاتی هاوپەیمانی ڕاگەیاند. بەو بڕیارە هەموو ئەو کەسانەی کە لە حیزبی بەعس چوار پلەی سەرەوەیان هەبووە، نابێ نە ئێستاو نە لە ئایندەش کاری حکومەتییان هەبێ. لە

٢٣ی ئایار، برێمەر بڕیاری سی پی ئای ژمارە ٢ی مۆر کرد. بە پێی ئەو بڕیارە سوپای ئێراقیّ و هێزی ئاسمانی و دەزگای ئەمن و موخابەرات و گاردی کۆماری و میلیشیاکانی حیزبی بەعس و وەزارەتی بەرگریی هەڵوەشاندنەوە.

هەشتا ساڵ بوو عارەبە سوننەکان ژێرەڤانی یەکێتی خاکی ئێراقیّ بوون و بە زەبرو زەنگ وڵاتیان یەکپارچە هێشتەوە. داگیرکاری وڵاتە یەکگرتووەکان حوکمی عارەبی سوننەی نەهێشت. ئێستا برێمەر بە قەڵەمکێشێک شۆڕشەکەی بە ئەنجام گەیاندو کۆڵەگەکانی عەسکەری و ئەمن و موخابەرات و حیزبی بەعسی هەڵتەکاند کە عارەبە سوننەکان بۆ حوکمڕانی ئێراقیّ پشتی خۆیانیان پیّ بەستابوون.

برێمەر نەیزانی بەم کارەی دەرگەی بەسەر بەردەوامی یەکێتی خاکی ئێراقێدا داخست. هەرچی هێزی زەبەلاحی دونیا هەیە ناتوانیّ جارێکی تر ئێراق پێکەوە بنووسێنێتەوە. برێمەر چواردە مانگی پاشتر هەوڵی دا لێکی گریّ بداتەوە.

***

بەم جۆرە دەسپێکی هاتنی برێمەر ستراتیژەکەی گارنەری ١٨٠ پلە سووڕاندەوە. گارنەر پلانی وابوو دەسەڵات بۆ ئێراقییان بگەڕێنێتەوە، بەڵام برێمەر ئاشکرای کرد خۆی بەرپرسیار بوو. وەک خۆی باسی یەکەم کۆبوونەوەی لەگەڵ سەرکردەکانی ئێراقیّ دەکا، "چەکوچەکەی دانا." تیمەکەی گارنەری، بۆ ئەوەی حکومەتە بەئیش بخەن، لەگەڵ گەورە کاربەدەستانی حکومەت کاریان دەکرد. برێمەر زۆربەیانی دەرکرد؛ چونکە پێشان بەعسی بوون. سوپای وڵاتە یەکگرتووەکان خەریک بوو گەورە ژەنراڵەکانی ئێراقێی دەهێناو هێندەی نەمابوو سوپای ئێراقێی بانگ بکەنەوە تا ئاسایش بپارێزیّ دەست بەکارەکانیان بکەنەوە. برێمەر هات و سوپای ئێراقێی هەڵوەشاندەوە.

ئەندامەکانی حیزبی بەعس وەک ئاندامانی حیزبی نازی هیتلەرو حیزبی شیوعی ستالینی بوون. لە دەورەی سەددام حوسێنی کۆمەڵێکی وەک ئەوەی ستالینیان پێکهێنابوو کە ڕەنگە ئێرەییان پیّ دەبردرا ئەندامانی حیزبی بەعس هان دەدران بۆ ئەوەی لەسەر ئێراقییانی دیکە بنووسن و ئەو کەسانە لە ناو ببەن کە متمانەیان پیّ نەدەکرا. ئەو کەسەی کە تۆمەتبار دەکرا، لێکۆڵینەوەی سەختی لەگەڵدا دەکراو

ئەشکەنجە دەدراو ئیعدام دەبوو. حیزبی بەعسی ڕێکخراوی لاوانی خۆی هەبوو، پێیان دەگوترا أشبال، واتا بێچووە شێرەکانی سەددامی و ئەو ڕێکخراوە بیرۆکەی ڕەگەزی عارەبی بالای لە ناو ئەندامانی خۆیدا دەسەپاند (بەلام لەڕاستیدا مەرامی عارەبی سوننە بوو)، تێیدەگەیاندن کە ئەوان لە کوردو ڕەگەزە ناعارەبەکانی تری ئێراقێ بالاتر بوون. بۆیێ شیعەو کوردە ئێراقییەکان ڕێگەیان نەدا بەوانەی کە بە کەوش ماچکردنی سەددام حوسێن و حیزبە ڕەگەزپەرستەکەی پۆستی بالایان پێ درابوو، چیتر دەزگاکانی ولات بەڕێوە ببەن. لە لایێکی ترەوەش، بڕیارەکەی برێمەر کوتک و سنگی بوو، چونکە زۆر لەو دکتۆرو مامۆستاو پیشەوەرانەشی لە ئیشکردن بۆ حکومەتی دوور کردنەوە کە پەیوەندییان بە حیزبەکەوە هەبوو پلەی بەرزیان تێدا وەرگرتبوو هەر بۆ ئەوەی ئیشەکانی خۆیانیان لەدەست نەچێ (خۆ زۆر لە پیشەوەرانی شارەزا پەیوەندیشیان بە حیزبەکەوە نەبوو بەلام هەر ئیشەکانی خۆیانیان دەکرد.) ڕەنگبوو ئەگەر هەنگاو بە هەنگاو ئەو کارمەندە پلەبەرزانە لەکار دەرکرابان، ئەنجامی باشتری هەبا.

برێمەر بیانووی هەلوەشاندنەوەی سوپای ئێراقێی بەوە دەهێناوە کە کاتێک ئەو بڕیاری هەلوەشاندنەوەی سوپایەکەی دەرکرد، سوپایەکە نەمابوو. لە نیسانی ۲۰۰۳، بە زۆربەی ناوچەکانی ئێراقێدا گەڕام، نە یەکەیێکی سەربازی نە تاقە سەربازێکیشم بینی کە پۆشاکی فەرمی لەبەردا بێ. لەو کاتەی کە تالانچییەکان دەستیان بە دزینی سەربازگەو سەنگەرەکانیان کرد، لەوکاتەدا سەربازان و ئەفسەرانی سوپا پۆشاکی فەرمی خۆیانیان شاردەوەو بۆ مالەکانیان چوونەوە. لە باکووریش پێشمەرگە دەستیان بە کۆکردنەوەی ئەو تانک و تۆپانە کرد کە لە فەیلەقەکانی سوپا لە میسل و کەرکووک و دیالا بەجێیان هێشت. لە درەنگی نیسانێ بوو کە لە باکووری بەغدا، لە بنکەیێکی موجاهیدینی خلقی ئێرانی کە سەددام حوسێن پشتیوانی دەکردن هەلوەستەیێکم کرد. لەو دەمی کارمەندانی ئێی بی سی فیلمیان دەگرت و سوپای ئەمێریکیش چاودێری دەکرد کاتێک کە موجاهیدەکانی خەلق ترێلەیێکیان لێخوڕیە ناو بنکەکەی خۆیان. ترێلەکە تانکێکی ئێراقێی لەسەر بارکرابوو. هەرچەندە ناوی ڕێکخراوی موجاهدینی خەلق لە سەر لیستی ناوی ڕێکخراوە تێرۆریستەکانی وەزارەتی دەرەوە بوو، بەلام پێدەچوو کە سوپای ئەمێریکا پەیوەندییەکی باشی لەگەل

سەرکردەکانی هەبێ. سوپا کارێکی وای نەکرد ڕێگەیان لێ بگرێ و نەهێڵێ چەکەکانی سەددامی ببەن[٥١]. لە باشووری ئێراقیش، میلیشیا شیعەکان و ئێرانییەکان بە ئازادی چەکە قورسەکانی سوپای ئێراقییان کۆکردەوە. بەڵام نەزاندراوە چەند لەو چەکانە ئاودیوی ئەودیوی سنووری ئێرانێ کران.

کە وای لێ هات، ئیتر ئیشەکە ئاسان نەبوو تا سوپای ئێراقێ، بەو شێوەیەی کە کارنەر دەیویست، بانگ بکرێتەوە. ئەگەر سەربازەکانیش بهاتبانایەوە، خۆ نە کەرستە نە چەک، نە سەنگەر هیچیان نەمابوو. لە ٢٠٠٣، نە سی پی ئێی نە سوپای وڵاتە یەککگرتووەکان، نەیاندەتوانی ئەو سوپایە بەسەرپێ بخەنەوە. ئەو کارە پێویستی بە پلانێکی پێشینەو سەرچاوەوە هەبوو. ئەندازیارانی شەڕەکە هیچیان لەم لایەنەوە لە باریدا نەبوو[٥٢].

لە هەموو شتێک گرینگتر ئەوەبوو کە سوپایە ئێراقییەکەی سەددام حوسێن لەشکری عارەبە سوننەکان بوو، سوپای نیشتمانی نەبوو. هەرچەندە عارەبە

---

(٥١) دیار نەبوو بۆ سوپای وڵاتە یەککگرتووەکان لەگەڵ ئەم ڕێکخراوە تیرۆریستە هاریکاری دەکرد، ئایا لە نەزانی بوو یان لە بێ پلانی بوو (نەیانتوانی بوو پلانێکی کاتی بۆ چۆنیەتی هەڵس و کەوت کردن لەگەڵ موجاهدینی خەلق دابنێن و لە ڕێبازی تیرۆریستی ئەو ڕێکخراوە ئاگاداری سوپای وڵاتە یەککگرتووەکان بکەنەوە) یان هەر بڕیارێکی سیاسی پارێزکارە تازەکانی پێنتاگۆن بوو بۆ ئەوەی لەگەڵ موجاهدینی خەلق کار بکەن چونکە ئەو ڕێکخراوە ئۆپەراسیۆنی سەربازی لە دژی ئێرانێ ئەنجام دەدا. لە ناو بەڕێوەبەرایەتییەکی کە هێندەی ئەوەی بوش بێ دسیپلین بێ، زۆر لە گینە کە چالاکەکانی ناو پێنتاگۆنی ئەجێندەی خۆیان وەپێش بخەن ؛ بە تایبەتیش کەلێکیان باوەڕیان وابوو کە موجاهدینی خەلق جەنگاوەرانی ئازادی ئێرانی بوون نەک تیرۆریست. لە کاتی شەڕەکە سوپای وڵاتە یەککگرتووەکان چەند بۆمبێکی خستوانەدە سەنگەرەکانی موجاهدینی خەلق، بەڵام لەو کاتاندا سەنگەرەکانیان بەتاڵ بوون. سەددام بۆ ماوەی بیست ساڵ پشتیوانی موجاهدینی خەلقی کرد و ئەوانیش لە ١٩٩١ پاداشتیان داوەو سەرهەڵدانەکەی کوردیان سەرکوت کرد. بوونیان جێی نیگەرانی حکومەتی تازەیە، بە تایبەتیش کە زۆرینەی ئەندامانی حکومەتەکە یان شیعەی لای ئێرانێنەو یانیش ئەو کوردانەن کە یادداشتی تاڵیان لەگەڵیاندا هەیە.

(٥٢) کارێکی باش نەبوو ئەگەر ئەو سوپایەی کە عارەبە سوننەکانی تێدا بالادەست بوون بکرێتە هێزێک بۆ ئەوەی ئاسایش بپارێزێ، لە کاتێکدا ئەو عارەبە سوننانە بوون کە گەورەترین هەڕەشەیان لە ئاسایشی ئێراقێ دەکرد.

سوننەکان ٢٠ لەسەدای سەرجەم دانیشتوانی ئێراقیّ بوون، بەڵام ڕێژەی ئەفسەرە سوننەکان لە نیوەی دەستەی ئەفسەرانی سوپا کەمتر نەبوو. هەرچەندە پلەو پایەی ئەفسەران بەرز دەبووەوە هێندە ڕێژەی عارەبە سوننەکانی تێدا پتر دەبوو. لە ٢٠٠٣، ژمارەی ئەو ئەفسەرانەی کە پلەکانیان لە رائید باڵاتر بوون، ژمارەیێکی زۆر کەمیان عارەبی سوننە نەبوون. یەکە هەڵبژاردەکانی وەک گاردی کۆماری و گاردی کۆماری تایبەت، ئەوانەی کە بڕبڕەی پشتی ڕژیم بوون، هەمووی عارەبی سوننە بوون. کەچی شیعەکان زۆربەی ئەو سەربازانە بوون کە لە شەڕی دژی ئێران و شەڕی دژی وڵاتە یەکگرتووەکان، سووتەمەنی شەڕەکان بوون. کوردەکانی ئێراقیش کە بەڕاستی لە ١٩٩١ڕا سەربەخۆ بوون، لەشکری تایبەتی خۆیانیان هەبوو. پێشمەرگە. سوپای ئێراقیشیان بە سوپایێکی دوژمن لەقەڵەم دەدا.

بەم شێوەیە، نە کوردەکان و نەشیعەکانیش سوپایە ئێراقییەکەی سەددامیان بە دەزگایێکی نیشتمانی نەدەزانی. ئەزموونیان لەگەڵ سوپاو دەزگا ئەمنییەکان هەر سەرکوتکردن و کوشت و کوشتار بوو. لە ئەنفال، سوپای ئێراقیّ و هێزی ئاسمانی لە سەرەوی ١٨٠، کوردیان کوشت. ئەو ژمارەیە ئەوانەشی دەگرتەوە کە بە بۆردومانکردنی گوندەکانی کوردان بە چەکی کیمیایی لەناو چوون. لە ١٩٩١یش، سوپاو گاردی کۆماری هەزاران شیعەیان کوشت. بۆیێ هیچ کام لەو دوو کۆمەڵە نەیاندەویست سوپایەکەی عارەبە سوننەکان بگەڕێتەوە. کوردو شیعە پێکڕا ٨٠ لە سەتای دانیشتوانی ئێراقیّ پێکدێنن.

لە کاتێکدا کە دەڵێین بانککردنەوەی سوپای ئێراقیّ کارێکی ژیرانە نەبوو، لە هەمان کاتیشدا دەڵێین نەدەبوو ئاوا بە فەرمی هەڵبوەشێندرێتەوە؛ چونکە بۆ خۆی بزر ببوو. بڕیارەکەی برێمەر، وەک خۆی لە کتێبەکەیدا باسی دەکا، بۆ ئەوە بووە کە هەر لە سەرەتاوە سامی خۆی لە ئێراقیّ بنوێنێ. بڕیارەکە بۆ عارەبە سوننەکان، بەتایبەتیش ئەو ئەفسەرانەی کە نەیاندەویست بگەڕێنەوە بۆ ناو ڕیزەکانی سوپا، سووکایەتی پێکردنێک بوو. ئەفسەرو سەربازە عارەبە سوننەکان، نەک هەر دەیانزانی کۆگاکانی ئەو چەک و تەقەمەنییەی ئەمێریکییەکان پاسەوانییان نەکرد، لە کوێ بوون، بەڵکو دەشیانزانی چۆن ئەو چەکانە بەکار بێنن. کارێکی زیرەکانە نەبوو لە ئێراقیّ دوژمن بۆ ئەمێریکا پتر بکەن، بەڵام برێمەر کردی.

ئەو بڕیارەی برێمەر دای بۆ ئەوەی دەسەڵات تەنیا بۆخۆی بێڵێتەوەو نەیداتە حکومەتێکی ئێراقی، ڕەنگە کوشندەترین بڕیاری بێ کە دابی. هەموو سەرکردە ئێراقییەکان، بەوانەشەوە کە زۆر لایەنگری ئەمێریکان، دەڵێن ئەو بڕیارەی برێمەر بۆ هێشتنەوەی دەسەڵات بۆخۆی، لە کن زۆران، وڵاتە یەکگرتووەکانی لە ڕزگارکەرەوە، لەبەرچاوی هەموو جیهان کردە داگیرکەر. ئەگەر حکومەتێکی ئێراقی سوپای هەڵبوەشاندبایەوەو حیزبی بەعسی قەدەغە بکردایە، ئەنجامەکەی باشتر پەسند دەکرا لەوەی کە بیانییەک بڕیارەکەی دەرکرد. ئەو عارەبە سوننانەی کە خۆیان لە بەرانبەر ئەمێریکییەکان بێدەسەڵات هاتە بەرچاو، ڕەنگبوو دانووستانیان لەگەڵ شیعەکان و کوردەکان بکردایە بۆ ئەوەی چارەسەرێکی مامناوەندی بۆ خۆیان بدۆزنەوە. ئەگەر حکومەتێکی ئێراقی هەبایە، ڕەنگبوو ڕاپەڕینەکەی ٢٠٠٤ی شیعەکان ڕووی نەدابا (چونکە شیعەکان لە حکومەتەکە باڵادەست دەبوون.) هێشتاش، ئەو چاکسازییەی کە پێویست بوو بکرێ (بۆ ئەم مەبەستە برێمەر سەد یاسای لە سەردەمی داگیرکەر دەرکرد) ڕەنگبوو ئەو چاکسازییە کارامەتر ئەنجام بدرابا، ئەگەر بە دەستپێشخەری خودی ئێراقییەکان با، نەک ئەمێریکییەکان بەسەریان داسەپاندبان، بۆیێش هیچیان جێبەجێ نەکران.

هەرچەندە ڤیێرا دیمێلۆی نمایندەی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ئێراقێ، کۆششێکی زۆری کرد تا لە برێمەر بگەیێنێ کە دەسەڵاتی خۆماڵی بۆ بنیاتنانەوەی وڵات زۆر گرینگ بوو، بەڵام برێمەرو دەسەڵاتی ئەمێریکای داگیرکەر لە مەبەستەکە نەگەیشتن. وا تێگەیشتن کە بەخۆیان کارەکانیان لەو ئێراقییە زۆر شارەزاو پسپۆڕانە باشتر ڕادەپەڕاند کە هەموو ژیانی خۆیانیان لە خەبات بۆ ڕووخاندنی ڕژیمی سەددام حوسێنی بەسەر بردبوو. چونکە دەیان ساڵبوو عارەبە ئێراقییەکان لە هەندەران دەژین، بۆیێ ڕەنگبوو ڕاستی بارو دۆخی ئەو وڵاتەیان نازانیبا کە سی و پێنج ساڵ بوو لە بن باری دکتاتۆریدا دەناڵی[٥٣].

---

(٥٣) برێمەر لە کتێبەکەی خۆیدا تاڵەبانی و بارزانی بە بانش منفی- exile ناوزەد دەکا، بەڵام هەردووکیان دوازدە ساڵ بوو کوردستانیان بەڕێوە دەبردو دەسەڵاتیان لەو هەڵبژاردنەدا پێدرابوو کە تاکە هەڵبژاردنێکی ئازادبوو لەو وڵاتە کرا

هەموو ئەوانی تریش لەنزیکەوە چاودێری ڕووداوەکانی ناوەوەی ئێراقییان دەکرد. زۆربەشیان خزمی نزیکیان هەبوو کە لەسەردەمی سەددامیش هەر لەناو وڵاتدا مابوونەوە. جگە لەمە هەموویان مێژوو و کەلتوورو سیاسەت و ئایینی ئێراقییان خوێندبوو، ئەگەر ئاگاشیان لە ڕووداوەکانی وڵاتەکەیان نەبووبێ، خۆ هەر لە کابرایێک پتر شارەزای بوون کە تەنیا چوار ڕۆژ بوو لەوێ بوو. بێگومان لەو سەرۆکە ئەمێریکییەش شارەزاتر بوون کە تا دوو مانگ بەر لەوەی کە فەرمان بە لەشکرەکەی بدا بۆ ئەوەی ئێراقێ داگیر بکا، نەیدەزانی کە ئیسلام لە نێوان سوننەو شیعەدا دابەش ببوو.

پاش ئەوەی برێمەر لە ١٦ی ئایارێ، بە ئەنجومەنی سەرکردایەتی ئێراقیی ڕاگەیاند کە حکومەت دانامەزرێنێ، داواشی لێ کردن کە ئەنجومەنەکەیان فرەوانتر بکەن بۆ ئەوەی (پتر نمایندەی خەڵکی بکا.) کە بە قسەیان نەکرد، برێمەر سل بوو و لەکن خۆیەوە سیاسەتوانە ئێراقییەکانی بە ناکارامەو خۆپەرست ناوزەد کردن. لەڕاستیدا ئەنجومەنی سەرکردایەتی ئێراقێ خۆی بە نمایندەی گەل دەزانی و بە لادانی عارەبە سوننەکان، کە زۆربەیان لایەنگری ڕژێمی پێشوو بوون، ئەنجومەنەکە بە ڕاستی نمایندە بوو. ئەندامەکانی بە دێمۆکراتیترین هۆیە بەردەستەکان دەستنیشان کرابوون کە ئەویش کۆنفرانسەکەی لەندەنی ئۆپۆزیسیۆنی ئێراقی بوو. لە هەڵبژاردنەکانی یەنایری ٢٠٠٥یش، ئەو پارتانەی کە ئەندامەکانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی ئێراقێ سەرکردایەتییان دەکرد، ٩٠ لە سەدی دەنگەکانیان بردەوە، چونکە عارەبە سوننەکان بۆیکۆتی هەڵبژاردنەکانیان کرد، بۆیێ ڕێژەکە کەمێک لە ڕاستەقینەی ڕێژەی هەموو ئێراقێ زۆرتر بوو. بەڵام لە هەڵبژاردنەکانی دیسێمبەری ٢٠٠٥، عارەبە سوننەکان بەتەواوەتی بەشداری هەڵبژاردنەکانیان کرد، کەچی سەرکردەکانی ئەنجومەنی سەرکردایەتی ئێراقێ، هێشتا ٧٥ لە سەتی دەنگەکانیان وەدەست هێنا[٥٤].

---

(٥٤) هەندێ لە هەژدەکە خۆیان لەسەر لیستی ئەو حیزبانە کاندید کرد کە ئەندامانی سەرکردایەتی ئێراقێ، سەرکردایەتییان دەکرد. لە هەڵبژاردنەکەی یەنایریش، هەندێک لەوانەی کە برێمەر دایمەزراندبوون نەیانتوانی سێیەکی ئەو ١ لە سەدە بەدەست بێنن کە پێویست =

هەرچەندە برێمەر ناوی ئەنجومەنی حوکمڕانی ئێراقیی، لە داهێنانەکەی خۆی نا، بەڵام نەیویست هیچ لە دەسەڵاتەکانی خۆی پێی بدا. لە تەمموزی ٢٠٠٣بوو، بیرۆکەیێکی بۆ هات، کە دەبوو ئەنجومەنی حوکم داوا بکا دەسەڵاتی کاتی هاوپەیمانان ئەو شتانە بکا کە لە پلانی ئەنجومەنەکە دابووە. بەخەیاڵی برێمەر ئەم هەنگاوە پلەوپایەی ئەنجومەنی حوکم لەناو ئێراقییەکان بەرزتر دەکاتەوەو کاریگەرتری دەکا. ستافەکەی لیستێکی "دەستکەوتە خێراکان" یان داهێناو بە پێی ئەو لیستە ئەنجومەنی حوکم داوا لە دەسەڵاتی داگیرکەر دەکا کە دەبێ تا ئۆکتۆبەری ٢٠٠٣، جێنێرێتەرەکانی کارەبا هەموویان چاک بکرێنەوەو کارەبا وەک کاتی بەر لە شەڕی لێبێتەوەو ڕێگەچارەیێکیش بۆ بێکاری بدۆزرێتەوە. برێمەر نووسی:

"چونکە ئەگەر ئەو پلانانەمان لەبەردەست با، ڕەنگبوو ئۆپەراسیۆنەکە سەرکەوتوو - سەرکەوتوو باو کە بە پێی پلانەکە، ئەنجومەنی حوکم داوای لە سی پی ئێی دەکردو ئێمەش بۆیمان جێبەجێ دەکرد؛ متمانەیێکی باشی هاوڵاتیانی بە دەست دەهێنا."

جێی سەرسوڕمان نەبوو کە ئەنجومەنی حوکم هیچ داخوازییەکی لەم چەشنەی نەکرد. ئەندامەکانی ئەنجومەنی حوکم، حکومەتێکی ئێراقییان گەرەک بوو کە دەسەڵاتی ئەوەی هەبێ کارەبا چاک بکاتەوەو گومانیش لەوەدا نەبوو کە پێشنیازەکەی برێمەریشیان بە کات بەفیرۆبردن و نابەجێ زانی. هەڵسوکەوتی برێمەری لەگەڵ شارەزاترین سیاسەتوانی ئێراقێ، وەک ئەوەبوو کە مامۆستا لەگەڵ

= بوو بۆ ئەوەی کورسییێکیان بەربکەوێ. لە هەڵبژاردنەکانی دیسێمبەریش، لەگەڵ هەندێ ئەوانەی کەمیان وەدەست هێنابوو ناوەکانی خۆیانیان لەگەڵ لیستی ئەو حیزبانە نووسی کە ئەندامەکانی سەرکردایەتی ئێراقێ سەرۆکیان بوون. لیستی پارتەکانی تر، کە لەو چوار لیستەکەی ئەندامانی سەرکردایەتی ئێراقێ جیاواز بوون، تەنیا ٣ لەسەدی دەنگەکانیان هێنا. توندترین ڕەخنەی برێمەر ئاراستەی ئەنجومەنی سەرکردایەتی ئێراقیی کرد ئەوەبوو کە بە چاکی نوێنەرایەتی عارەبە سوننەکانی نەدەکرد. بۆیێ چەند عارەبێکی سوننەی بە ئەندامی ئەنجومەنی حوکم دامەزراند، بەڵام هیچ کامیان ڕێژەیێکی دیاری دەنگەکانی لە نێوان عارەبە سوننەکاندا بە دەست نەهێنا.

قوتابییەکی ئامادەییدا دەیکا[٥٥]. پاش ماوەیێک گەورە سەرکردەکان چیتر ئامادەی ئەنجومەنی حوکم نەبوون، بریکارەکانی خۆیانیان ڕەوان دەکرد. سی پی ئێی سەلماندی کە نە پێی نەکرا کارەبا چاک بکاتەوەو نە پێشی کرا کێشەی بێکاری چارەسەر بکا.

دوای ئەوەی برێمەر هات، ئەو پیشەوەرو شارەزایانەی کە گارنەر کۆی کردبوونەوە هاندران کە کارەکانیان بەجێ بێڵن یانیش پەراوێز کران. هەر کە باربرا بۆودین، بە تێلیفۆن ئاگادار کراوە کە کاری لە ئێراقێ پێ دراوە، یەکسەر ڕەمسفیلد لە کارەکەی لادا. بۆودین پێشتر لە یەمەن باڵیۆز بوو و لە ١٩٨٠کانیشدا لە ئێراقێ کاری کردبوو. باڵیۆزی خانەنشین تم کارنی کە پێشتر لە سودان باڵیۆز بوو و ئەرکەکانی دروستکردنەوەی کامبۆدیاو هایتیشی بەڕێوە بردبوو، کە لە خوێندیەوە واشنتن پۆوست پەلامارێکی توندی بەڕێوەبەرایەتی دا، چونکە ئامادەکاری باشی لە ئێراقیدا نەکردبوو، ئینجا دەستی لە کار کشاندەوە. باڵیۆزی پێشووش لە تونس ڕۆبن ڕافایێل، کە کرابووە وەزیری دیفاکتۆی بازرگانی، بۆ وەزارەتی دەرەوە گەڕاوە. پاشتر خانم ڕۆبن لە دیمانەیێکی لەگەڵ پرۆژەی زارەکی مێژوودا گوتی: "خۆ ئاشکرابوو کە نەماندەتوانی وڵاتێک بەڕێوە ببەین کە هیچمان لە بارەیەوە نەدەزانی. بۆ ئەرکەکە ئامادە نەبووین. ڕایان کرۆکەریش پێشتر لە چەند وڵاتێک لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست باڵیۆز بووەو بۆ ماوەیێکی زۆریش لە ئێراقێ بووە، دەستبەرداری ئیشەکەی بوو و لە کۆلێژی شەڕی نەتەوەیی پۆستی مامۆستایەتی وەرگرت. باڵیۆز بڵ ئیگڵتن کە پێشان لە ١٩٨٠کان، لە بەغدا سەرۆکی کەرتی بەرژەوەندییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان بوو، پسپۆڕێکی دیاری کوردناسیش بوو، بۆ نوژدارییەک ئێراقی بەجێهێشت و پاشان برێمەر ڕێی پێ نەدا بگەڕێتەوە.

کۆشکی سپی، لە شوێنی ئەو پسپۆڕانە، هەواداره کۆمارییەکانی ناردن. پێنتاگۆن

(٥٥) یان ڕەنگە هێشتا بە چاوێکی کەمزانتریش سەیری کردبن. چونکە لە ئیمەیڵێک کە برێمەر بۆ ژنەکەی نارد، موناقەشەکانی ئەنجومەنی حوکمی بەو "قۆمەتە خۆڵە" چوواند کە "کۆی قاشوانێی لەسەر دادەندرێ و یاریزانەکان ناتوانن لە کۆیەکە بدەن و تۆزو خۆڵی قۆمەتە کڵەکەیان بۆ دەگەڕێتەوە.

گوێی بەوە نەدا کە ئەو هەموو سیڤیلەی ڕەوانی ئێراقێیان دەکا هیچیان نەتوانایان هەبوو نە شارەزاییـیـان لە کـاتی دوای شـەڕەکـاندا هەبوو. سـەرباری ئەوەش هیچ زانیارییەکیان دەربارەی ئێراقێ نەبوو. بەڵام ئێراقییەکان ئەم کارانەیان لەلا زۆر پڕ بایەخ بوو. جـێری برێـمـەر ئەجـێندایێکی زۆر ئومـێدبەخـشی هەبوو. لە حـوزەیرانی ۲۰۰۳بوو، لە گوتارێکی لە وۆڵ ستریت جێرنەڵ بڵاوی کردەوە؛ سەردێڕی ئامانجە ئابوورییەکانی خۆی بەدیارخست:

دەبێ کەرتی تایبەتی هانبدرێ تا بە پەلە سەرچاوەکانی دارایی خۆی کۆبکاتەوەو بکەوتە بەرهـەمـهێنان. لە ئابوورییە ئینتیـقـالییەکانی تردا، گۆڕان لە ئابوورییـەکی گـشـتـیـیـەوە بۆ ئابوورییـەکی تایبـەتی، لە ڕێگەی هـاندانی ئیـشـە بچـووک و مامناوەندییەکانەوە بەدی دێ. ئەو ئیشە بچووکانە بە خێرایی کار لە بازاڕی دروست دەکەن و بە کەمکردنەوەی یارمەتی دارایی لەو کۆمپانیایانەی کە موڵکی حکومەتن و بە دانانی یاسایێکی ڕێکو پێک و ڕوونی بازرگانی ئەو ئیشانە هان دەدرێن (دادوەری دەستپاکیش دابمەزرێن تا ئەو یاسـایە ڕاپبـەڕێنن، پشـتـیوانییـەکی ترە بۆیان.) بە شێـوەیێکی گـشـتی، بـۆ ئەوەی ئابووری گـەشـە بکا، دەبێ سـسـتـمێکی مـافـەکـانی موڵکدارێتیش پێکبێ.

بە کورتی، بەتایبەتکردن Privatization کلیلەی بنیاتنانەوەی ئێراقێکی دیمۆکراتی و سـەقـامـگـیـرو گـەشـاوە بـوو. تۆم فـۆوڵی، گـەورە پـارەکـۆکـەرەوەی بوش بـوو، هیچ ئەزمــوونێکی دەربارەی گــواســتنەوەی ئـابووری و (دەربـارەی ئێـراقێ) نەبـوو. ئەو فۆوڵیـیـە بە بەڕێوەبەری بەتایبـەتکردنی پیـشـەسـازی ئێراقێ دامـەزرا. چەند مـانگێک ماوە پاشـان مایک فلێشەری لە شوێنەکەی دامـەزرا. فلێشـەر برای یەکەم سکرتێری ڕۆژنامـەوانی بوش بـوو. فلێشـەر بۆ شێکاگۆ تریبیـون، باسی کـرد کە لە ڕێی ئاری برایەوە کـارەکـەی وەرگرتووە، ئینجـا، بێ ئەوەی گـاڵتـەجـاڕی پێـوە دیار بێ، گـوتی ئەمێریکییەکان دەچن ئێراقییەکان فێری شێوازی نوێی بزنسیان دەکەن. گوتیشی: "تاکە ڕێگەیێک کە ئەوان دەیزانن پەسندکردنی خزمانە.

بەتایبەتکردن جێبەجێ نەبوو. بەڵام هەر هێندە سوودی هەبوو کە فلێشـەرو فۆوڵی بە بەرپرسی دامــەزران. یاســای نێـو نەتەوەیی ڕێگە بە داگـیـرکـەر نادا کـە هـیچ سەرمایەیێکی وڵاتی داگیرکراو بفرۆشێ. پێنەدەچوو کە هیچ کەسێک لە سی پی ئێی

ئاگای لەم یاسایە هەبێ.

دووبارە کردنەوەی ستۆک ئاڵوگۆڕکردن Stok exchange کە جمگەیێکی گرینگی بەتایبەتکردنە، تەسلیمی سیاسییەکی تەمەن بیست و چوار ساڵی کرا برێمەر پەیمانی دا تا کۆتایی ۲۰۰۳، ئاڵۆگۆڕکاری بۆ دڵنیانی بازرگانی بکاتەوە، بەمەرجێ لە سەردەمی سەددامی روونـاکتر بێ. لەڕاستیدا، سی پی ئێی تەنیا چوار ڕۆژی مابوو کە ئاڵوگۆڕی ستۆکی ئێراقی ISX کراوە. تەنیا یەک ڕۆژ، ۲٤ی حوزەیرانی ۲۰۰٤، لە چاودێری ئەمێریکییان بوو، ئەو ڕۆژەش پەنجاو یەک بەشی شەش کۆمپانیایان ئاڵوگۆڕکران. نرخەکەشیان چەند سەد دۆلارێک بوو. بۆ گەیشتنە ئەم ئامانجەش، باجدەرانی ئەمێریکا چەند ملیۆن دۆلارێکیان لە مووچەدان و ئاسایش و تازەکردنەدا خەرج کرد. لەو کاتەوە تائێستا ئاڵوگۆڕی ستۆکی ئێراق، لە هەموو ئاڵوگۆڕی ستۆکەکانی ڕۆژهەڵاتی ناڤین کەمترەو ناونرخەکەی نزیکەی ناونرخ Parی دەسەڵاتی فەلەستینی دەبێ.

هەرچەندە کە مکوڕبوونی بەڕێوەبەرایەتی لە سەر ئەوەی کە پۆستەکانی ئێراقێ بە پاداشت بداتە هەوادارە سیاسییەکانی کاریگەرییەکی سەرەکی لە مەیدانێدا هەبوو؛ بەڵام لە لایەنی ئایدیۆلۆژی نەیبوو. ئاندی زایاج ڕۆژنامەوانی شیکاگۆ تریبیون، باس دەکا چۆن بەڕێوەبەرایەتی بوش گەورە کارمەندی تەندروستی لە ئوفیسی ئاوەدانکردنەوەو یارمەتی مرۆیی، دکتۆر فرێدریک بێرکڵی لەسەر کارەکەی لادا دکتۆر بێرکڵ پزیشک بوو، پەیوەندییەکی نزیکی لەگەڵ ڕێکخراوە مرۆییەکاندا هەبوو، شارەزاییەکی زۆری لە ناوچە پڕ ئاژاوەکاندا هەبوو. ئەویان لاداو جەیمز هێیڤمەن لە شوێنەکەی دامەزرا. هێیڤمەن هەوادارێکی حاکمی پێشووی کۆمارییەکانی میشیگەن بوو، پلەی نوژداریشی نەبوو. بێرکڵ چەند مانگ بوو پلانی دادەنا بۆ ئەوەی سستمی تەندروستی لەگەڵ ڕووخانی بەغدا دابڕێژێتەوە، کەچی هێیڤمەن بە پێچەوانەی ئەو تا ۷ی حوزەیرانی ۲۰۰۳ هەر نەگەیشتە ئێراقێ. هەرچەندە هێیڤمەن هەرگیز لە لە بوارێکی دوای ململانێدا کاری نەکردبوو، بەڵام بەتوندی نکوڵی لەوە کرد کە شارەزایی لە کاروباری نێونەتەوەییدا نییە. ڕەنگە وەک خۆی بە تریبیونی گوت وای زانیبێ کە ئەو سەفەرانەی بۆ بیست و شەش وڵات کردبوونی بۆ ئەو شارەزایی بووبن. هەرچەندە سستمی تەندروستی تایبەتی نزیکەی

نیوەی سەرجەمی سستمی تەندروستی ئێراقە، بەڵام، بە قسەی تریبیون، هێیڤمەن ئەو سستمەی لە پلانەکەی خۆی دانەنابوو. پارەیێکی زۆریشی بە فیڕۆداو نەیهێشت ڕاستییە بنەڕەتییەکان data دەربارەی ئەو کلینیکانە (عیادانە) کۆ بکاتەوە کە هەبوون و ئیشیان دەکرد.

ڕەنگە سەرسوڕهێنەرترین سەربردەی سی پی ئێی ئەوەبووبێ کە لە ۲۳ی ئایاری ۲۰۰٤دا، واشنتن پۆوست بڵاوی کردۆتەوە. تایتڵی گوتارەکە ئەمە بوو "لە ئێراقێ، هەلێکی کارکردن بە درێژایی ژیان؛ بودجەی ۱۳ بلیۆنی لەبەردەست دایەو هیچ شارەزاییەکیشی نییە." باسی شارەزایی شەش لاو دەکا کە خۆیان لە ئێراقێ دۆزیەوە. هەر شەشیان کتوپڕ ئیمێیڵیان لە وەزارەتی بەرگرییەوە بۆ هات و لێیانیان دەپرسی ئەگەر بیانەوێ بچن لە ئێراقێ لەگەڵ سی پی ئێی، ئیش بکەن. هیچیان باسی ئەوەیان نەکردبوو کە دەیانەوێ بچن لە ئێراقێ ئیش بکەن و هیچ کامیشیان ئەو جۆرە شارەزاییە پێویستەیان نەبوو. هەر شەش بەکرێ گیران بێ ئەوەی دیمانەیان لەگەڵ بکرێ یان پاکێنەی ئاسایش Security clearance یان هەبێ. وا بڕیار بوو پۆستی نزم لە ئۆفیسی بودجەی سی پی ئێی وەربگرن؛ بەڵام چونکە سی پی ئێی پسپۆرو شارەزای بەکرێ نەگرتبوون، بۆیێ بودجەی ئێراقێ کەوتە بەردەستی ئەوانە. هیچیان دەربارەی یاسای خەرجکردنی فیدراڵی و بودجە سازکردن نەدەزانی، بۆیێ بە ئەویەڕ هێواشی پارەکەیان خەرج کرد.

لە ئابوورییێکی کە پتر لە ٥٠ لەسەدای بێکار بێ، خەرجکردنی لەسەرخۆ بێزاری لە ناو ئێراقییە بێکارەکان پەیدا کردو بێگومان ئەمەش دەستی گوڕزوەشێنی بۆ یاخییەکان پەیداکرد. بە پێی پۆوست، گرووپەکە، کە یەکێکیانی کچی کابرایێکی پارێزگاری چالاک و دیار بوو، تێنەگەیشتن چۆن ئەوان بۆ ئەو شوێنە، ئاوا دەستنیشان کرابوون. گەنجەکان لە دوا قۆناغدا تێگەیشتن کە ئەوان بەوەوە پەیوەندییان پێوەکراوەو دامەزراون، چونکە پیشەنامە Curriculum Vitaeی خۆیانیان لە هێریتج فاوندێیشن بڵاو کردبووەوە، کە هزردان think tank ێکی پارێزگارەو بنکەکەی لە واشنتنە. پێنتاگۆن یازدە کەسی لەوانە بەکرێ گرت کە پیشەنامەکانی خۆیانیان لەسەر وێبسایتی هێریتج فاونێیشن بڵاو کردبووەوە. ئەو شەش کەسەش کە بودجەی ئێراقییان پێ سپێردرا لەوانە بوون.

فرێد بارنێز کە توانجوانێکی پارێزگاری ناسراوەو پشتیوانی هەموو ئەو باڵە ڕاستانەی دەکرد کە دەیانویست لەشکر بۆ بەغدا بنێرن، لە ٢٤ی نیسانی ٢٠٠٤، لە ویکلی ستاندارد دەنووسێ:

لیبراڵەکان بەوە بەناوبانگن کە کێشەکانیان لە سەر بنەمای ڕەوشت دادەمەزرێنن. حەزیان لێیە خۆیان هەڵکێشن. بەڵام لەم گەورەترین پرۆژە مرۆییەی ئەمڕۆ کە ئێراقە، جێدەستیان دیار نییە. کەچی پارێزگارەکان ملیان لە بەر ملی ئەو هەموو مەترسییەی ئەوێ ناو سەدان ڤۆڵەنتیریان بۆ ئێراقێ نارد بۆ ئەوەی ئێراق بکەنە وڵاتێکی ئازادو دیمۆکرات. هێندەیان هاتن تا پۆڵ برێمەری بەڕێوەبەری دەسەڵاتی کاتی هاوپەیمانانیان ناچار کرد کە شەپۆلەکە بوەستێنێ. برێمەر دەڵێ: "ژمارەیان لەوە زۆرتربوو کە بتوانم وەریان بگرم.

نە مووچەکەیەو نە حەسانەوەیە کە هانیان دەدا بچن. بەڵکو وەک تیمە پارێزگارێکن بۆ ئاشتی کار دەکەن. هەر چوار کەسیان لە ناو ترێلەیێکدا دەژین کە بە گوشی پڕ لە زیخ چوار لای گیراوە. یەک جۆرە خواردن دەخۆن. حەوت ڕۆژ لە حەفتەو هەر ڕۆژێکیش لە ١٢ تا ١٤ کات ئیش دەکەن. زۆربەی کاتی خۆیان لەو شەش مایڵ چوار گۆشەیەی "گرین زۆون" بەسەر دەبەن، کە بارەگا پاسکراوەکانی سی پی ئێیو ئەنجومەنی حوکمی ئێراقیی تێدایە. ڕووبەڕووی پەلامارەکانی تۆپ و مووشەک و چەکداران دەبنەوە.

قوربانییان دا تا بگەنە ئێراقێ.

خۆ ئەو قسانە هەمووی وانییە. کارمەندانی سی پی ئێی سوودیان لە مووچە نائاساییەکانیان دیت. لەبری مەترسی و کارزەحمەتی و هەندێ شتی تریش سەرمووچەیان هەبوو[٥٦].

---

(٥٦) ڤۆڵەنتیرەکانی تیمی ئاشتی مووچەی مانگانەی دوو سەد دۆلاریان هەبوو، دوای دوو ساڵ لە کاری گران بەسەر بردن، مووچەکانیان چاک دەکراوەو دەبووە شەش هەزار دۆلار. کەمترین مووچەی مانگانەی کارمەندە ئەمێریکییەکانی سی پی ئێی سی جار هێندەی ئەو مووچەیەیە کە دەستپێشخەرەکانی تیمی ئاشتی پەیدای دەکەن.

مـــووچەی ئەو گـــەنجـــانەی کـــە تازە لە کـــۆلێـــژ دەرچوونە، بە لەبری مـــەترسی و کارنەستەمییەوە، ساڵانە شەش ڕەنووسیان وەردەگرت (واتا مووچەکانیان لە ملیۆنێک دۆلار پتـــر بوو - وەرگـــێـــڕ) چونکە ئەو کـــۆمـــارییـــانەی لە ئێـــراقێ کـــاریان دەکـــرد مـــووچەکـــانیـــان لەوە پتـــر دەبوو کـــە حکومـــەتـــی فـــێـــدراڵی ڕێگەی پێ داوە، بۆیێ دەبوو بەشـــەش مـــانگ ئێـــراق بەجێ بێـــڵن و بچنەوە، واتا کـــە دەهـــات کـــەمـــێک لە وڵاتەکـــە شارەزابن، بە جێیان دەهێشت. کە دیمۆکراتەکانی کۆنگرێسیش داوایان لە ئۆفیسی لێپرسـینەوەی گشـتی General Accountability Office تا لێکۆڵینەوە لە خشـتـەی مووچەی سی پی ئێی بکات، بەڕێوەبەرایەتی بە ئۆفیسەکەی ڕاگەیاند کە سی پی ئێی ڕێکخراوێکی نێو نەتەوەییەو کۆنگرێس دەسەڵاتی کۆنترۆڵکردنی نییە.

دەسـەڵاتی کـاتی لە کێشـە بەرجـەسـتەکـان پتر، جـەخـتی لەو کێشـە ڕەمزییـانە دەکردەوە کە لەناو بازنەی کۆمـارییـەکـان لە واشنتن، دەنگی دەداوە. ڕەنگە لە هـەمـوو ئەو کێشـانەش سـەیرتر ئەو بڕیارەی برێمـەر بووبێ کە ١٥ لەسەدا باجێکی نەگۆڕی flat tax خستە سەر ئەو دەرامەتەی کە لە ئێراقێ وەردەگیرا. ئەمەش لە ناو بازنەی کـۆمـاری و دژەباجـەکـان، لە وڵاتە یەکگرتووەکـان، زۆری پێـدا هەڵگوترا، چونکە لەمێژبوو پێیان نەدەکرا باجی نەگۆڕ لە وڵاتە یەکگرتووەکان بسەپێنن. پارێزکارەکان تێبینییان نەکرد کە لە ئێراقێ کەس باجی دەرامەت نادا(٥٧).

تۆمـارەکـانی سی پی ئێی، ئەوانـەی کـە تایبـەت بە ئابووری و جـێی بـایەخ بوون، کـارەسـات بوون. نۆهەت و پێنج لەسـەدای داهـاتی حکومەتـی ئێـراقێ لە نەوتەوە بوو. بەر لەوەی وڵاتە یەکگرتووەکان ئێراق داگیر بکا، ئێراق ڕۆژانە ٢,٦ ملیۆن بەرمیل نەوت هـەنـاردەی هـەبوو. بەڕێوەبەرایەتی بوش لە سـەرەتای شـەڕەکـە، ١,٧ بلـیـۆن دۆلاری بۆ باشکردنی پیشـەسـازی نەوت لە ئێراقێ تەرخان کرد. زۆربەی پارەکە بێ

(٥٧) دەشێ باجی دەرامەت لە مووچەی مانگانەی حکومەتی ناوەندی دەربکرێ، بەڵام کە باج تەنیا لە کەرتـی تایبـەت وەردەگـیرێ، ئەوکات کـاریگەرییـەکەی ئەم باجـە جیـاوازی نابێ ئەگەر ١٥ لەسـەدای لە ڕاژەگوزاری گشتی وەربگیرێ. مووچەی ڕاژەگوزارییە گشتییەکان لەسـەردەمی سی پی ئێیدا زۆر زێدە کرا، ڕەنگە کۆمارییەکان ئەمەیان نەویستبا. باجی نەگۆڕ لە کوردستان پەیڕەو نەکرا؛ چونکە حکومەتی کوردستان نە ڕێگەی بەبەغدا داوەو نە ڕێگەشی پێدەدا تا باج لە هاوڵاتیانی بستێنێ.

هیچ کۆنتراکتێک تەسلیمی کۆمپانیای هالیبێرتن کرا. لە ئایاری ٢٠٠٤، بۆ ماوەی یک مانگی ڕەبەق، سی پی ئێی ڕۆژانە تەنیا ١,٩ بەرمیل نەوتی بەرهەم دەهێنا. لە دیسێمبەری ٢٠٠٥، کەم بووەوە گەیشتە ١,١ ملیۆن بەرمیلی ڕۆژانە. دەزگا نەوتییەکانی ئێراقێ یەکێک لەو ژێرخانە ئابوورییە گرینگانە بوو کە لەشکر پاسی کردو لە شەڕەکەش زیانی بەبەر نەکەوت و پاشان تالانیش نەکرا. بەڵام چونکە نەکرا بۆرییەکانی نەوت لە دوای شەڕ بپارێزن، ڕۆژانە دووچاری کردەوە خراپکارییەکان و دزی دەبێ و ئەمەش کاری لە ڕێژەی ڕۆژانەی بەرهەمهێنان کردووە.

وزەیێکی کارەبا کە پشتی پێ ببەسترێ، بۆ ئابووری ئەم سەردەمە پێویستە. بەر لە شەڕ، بەغدا نزیکەی بیست و چوار کات کارەبای هەبوو. لە نیسان و ئایارێ، کارەبا نەبوو، نەبوونی کارەباش زۆربەی چالاکییە ئابوورییەکانی ڕاگرت و ژیانیشی ناخۆش کرد؛ چونکە پلەی گەرمی خۆی لە ١٢٠ی دەدا. دوای پازدە مانگ، کە سی پی ئێی دەسەڵاتی بە ئێراقییەکان داوە، دانیشتوان و بزنسەکانی بەغدا، ڕۆژێ، شازدە کات کارەبایان هەبوو. هەرچەندە ٧,٧ بلیۆن دۆلار بۆ ژێرخانی وزەی ئێراقی تەرخان کرابوو، بەڵام هەموو بەرهەمی کارەبای ئێراقێ، لە دوای ساڵێک لە داگیرکردنی لە لایەنی ئەمێریکاوە، هێشتا لەو ڕادەیە کەمتر بوو کە حکومەتەکەی سەددام حوسێنی بە خەڵکی دەدا.

هەموو ئەوانەی لە کاروباری دوای ئاژاوەکان شارەزاییان هەیە، دەزانن کە زۆر گرینگە خەڵکی خێرا ئەو گۆڕانکارییانە ببینن کە لە ژیانیان ڕوودەدا. لە دوای هەر ململانێیەک، بێکاری زۆر دەبێ. دووبارە بنیاتنانەوە هەر ئەوە نییە کاولگەکان ئاوەدان بکەیەوە، بەڵکو دەبێ خەڵکی بخەیە سەر ئیش. دەبێ بە پەلەش دەست بەو شتانە بکرێ. لە نۆڤێمبەری ٢٠٠٣، سەرۆک بوش چەکێکی بە ١٨,٤ بلیۆن دۆلار مۆر کرد بۆ ئەوەی ئێراقی پێ ئاوەدان بکرێتەوە. تا کۆتایی حوزەیرانی ٢٠٠٥م سی پی ئێی نزیکەی ٥٠٠ ملیۆنی لەو پارەیە خەرج کرد. هەرچەندە ئۆباڵی هەڵەکە لەپێش هەموان، دەکەوێتە ئەستۆی بەڕێوەبەرایەتیْ سی پی ئێی، چونکە ستافێکی ناکارامەی دامەزراندبوو، بەڵام برێمەر لە یادداشتەکانی خۆیدا ئۆباڵەکە دەخاتە ئەستۆی سەرپەرشتیارەکانی لە واشنتن؛ چونکە گرینگییەکی وایان بە خەرجییەکان

نەدابوو. ئەو هەرمسانەی یەک لەدوای یەک تووشی سی پی ئێی بوو، وای لێ کرد کە ئێراقییەکان پێی بێژن: "هیچی بۆمان پێ ناکرێ."

بریمەر بلیۆنەها دۆلاری ئێراقیی بە داهاتی نەفتیشەوە، بەڕێوە برد. پشکنەری سی پی ئێی، ژەنراڵ ستیوەرت باوین ڕاپۆرتێکی دەرکرد تێیدا دەڵێ کە ٨،٨ بلیۆن دۆلاری ئێراقێش خەرج کراوە، یان بە دەستەواژەیێکی تر، بێی ژمێریارییەکی گونجاو، بزر بوو. بریمەر لە وەڵامدا گوتی کە ژمێریاری ئاسایی لە کاتی شەڕدا ناکرێ. بەڵام هەندێ لەوانەی کە ژەنراڵی پشکنەر دۆزییەوە لە هەڵەیێکی لاوەکی فرەتر بوو. ملیۆنەها دۆلاری کەڵای سەدی هەر بە بلۆک کراوی لە ئۆفیسەکانی سی پی ئێی ماوە. کارمەندێک لە شاری حللە، ٦٧٨،٠٠٠ دۆلاری لە چەکمەجەیێکی بێ تۆ پو کلیل هەڵگرتبوو. سەربازێکی ئەمێریکی کە بۆ یارمەتیدانی تیمی بۆکسێنی ئێراقێ دەستنیشان کرابوو، قوماری کردو ئەو پارەیەی پێی درابوو هەمووی دۆڕاند. کەس نەیتوانی پێی بڵێ ئەرێ ٢٠،٠٠٠ یان ٦٠،٠٠٠ دۆلارت فەوتاند، چونکە تۆمارێک نەبوو بڵێ چەندی وەرگرتبوو. ئەو پارەیەی خەرج کرا، پێدەچی یان لێپرسینەوەی نەرمی لەبارەوە کرابێ، یان لێپرسینەوە هەر نەبووبێ. نزیکەی ٧٠٠ دۆلار درا بۆ ئەوەی نەخۆشخانەی حللە، بە بڵندکەرەکەیەوە، تازە بکرێتەوە. ئیشەکە نەکراو بڵندکەرەکەش کەوتە خوارەوەو سێ کەسی کوشت. کۆنتراکتەرێکی تر بەهای ١٠٨،١٤٠ دۆلاری وەرگرت تا مەلەوانگەکەی حللە، کە بە قەوارەی مەلەوانگەی ئۆلیمپییە، نوێ بکاتەوەو پەمپو بۆڕی تازەی بۆ دابنێ. هەموو ئەو کارەی کۆنتراکتەرەکە کردی، بریتی بوو لە دووبارە ڕەنگکردنەوەی پەمپەکان، بۆ ئەوەی وەک پەمپی نوێ دیار بن.

لە حللە، ڕۆبێرت ج. ستێین جر، کارمەندی کۆنتراکتکردنی سی پی ئێی بوو، دواتر دانی بەوەدا نا کە تاوانی کردووەو دوو ملیۆن دۆلاری لە کرینی کەرستەکان دزیوە. هەرچەندە ئەو کابرایە لە ١٩٩٦، بە تاوانی فێڵبازی، هەشت مانگ لە زیندانی فیدراڵیدا بەند بووە، بەڵام هێشتا سی پی ئێی بەکرێی گرتبوو. ئەم چەشنە بەکرێگرتنە لە ئەنجامی سستمێکی کەسی بوو کە هەواداریتی سیاسی ڕەچاو کردو گوێی بەوە نەدا کە بە شێوەی روتینی خۆی، لە ڕابردووی بکۆڵنەوە.

له ۲۰۰٥، حکومەتی وڵاتە یەکگرتووەکان بە دوودڵیەوە پشتیوانی لەو دەعوایە کرد کە لە دژی کەستەر باتلز بەرز کرابووەوە. کەستەر باتلز بەهۆی پەیوەندییەکانی لەگەڵ گۆپ Gop چەن کۆنتراتێکی لە ئێراقێ وەرگرتبوو. دوو لە کارمەندەکانی کەستەر باتلز بە تاوانی بە فێڵ خواردنی چەند ملیۆن دۆلار لە هاوپەیمانان شکایەتیان لەو کۆمپانیایە کردبوو. کۆمپانیاکە پارەی وەرگرتبوو بەڵام ئیشەکەی نەکردبوو. کەستەر باتلز لە ۲۰۰۳، کۆنتراکتێکی بە ۱٦.۸ ملیۆن دۆلار وەرگرتبوو، بۆ ئەوەی ئاسایشی فرۆکەخانەی بەغدا مسۆگەر بکا. هەرچەندە پارەیێکی زۆری لەبەرایدا وەرگرتبوو و لە دەقی کۆنتراکتەکەشدا نووسرابوو بەڵام ئامێری تیشکی ئێکس X-Ray نەهێنابوو. سەگی بۆنکەری بۆمب و ڕاهێنەرانی سەگەکانیشی هێنابوو، بەڵام سەگەکان ئۆتۆمۆبێلیان بۆن نەدەکرد. لەم بارەیەوە کۆڵۆنێل ڕیچەرد باڵارد، کە لە ئێراقێ پشکنەری گشتی سوپا بوو، بە پرۆگرامی ٦۰ خولەک ٦۰ -Min utesی سی بی ئێس CBSی گوت: "بەڕاستی بڵێم، وابزانم پیاوێک بوو خۆو بە سەگەکەیەوە بوو."

بەڕێوەبەری فرۆکەخانەکە بۆ سی پی ئێی نووسی: "کەستەر باتلز نە وەڵام دەداتەوە، نە هاریکاری دەکا، نا شایستە و فێڵباز و یاریباز manipulative و لەوانەنە کە قازانج لە شەڕ دەکەن. بە بەڕێوەبەری دارایی سی پی ئێی لەبری ئەوەی کەستەر باتلزی دەربکا، هەستا هەندێ کۆنتراکتی تری پێ دا. مایک باتلز کە یەکێکە لە دامەزرێنەرانی کۆمپانیایەکەیە، لەسەر لیستی کۆمارییەکان خۆی بۆ کۆنگرێس کاندید کردو سەرنەکەوت، بەڵام پەیوەندی خۆی لەگەڵ کۆشکی سپی توند کرد. کۆڵۆنێلی بریتانی فیلیپ ویلکنسن بە ٦۰ خولەکی گوت: "بەڕاستی نازانم چۆن ئاوا لێی دەرچوون. ڕای ئێمە وابوو کە ئەوانە پشتیوانێکی سیاسی باڵایان هەبووە." لە ئاداری ۲۰۰٦، جورییەکی فیدراڵی بۆی دەرکەوت کە کەستەر باتلز سی و حەوت جار فێڵی لە ئیشەکانیدا کردووە.

کەستەر باتلز نموونەیێکە لەو کارانەی کە سی پی ئێی کردی و بە قسەی پشکنەری گشتی سی پی ئێی چاودێری: "بە شێوەیێکی گشتی نەبوو." کوردێک زۆر لە بریتانیا بووەو لە نزیکەوەش ئیشی لەگەڵ ئەمریکییەکان کردووەو لە بەغدا لە

سەردەمی داگیرکردندا وەزیر بوو، پێیگوتم کە گەندەڵی ئەمریکییەکان بڵاوەی دەکرد. گوتیشی کە هەرگیز بەخۆی پێشبینی ئەمەی نەدەکرد.

هەرچەندە بریمەر بەخۆی لەو گوتارەی کە لە وۆڵ ستریت جێرنەڵ بڵاوی کردەوە باسی گرفتە هەرە گەورەکانی ئێراقیی کرد کە سووتەمەنی و بەشە خۆراکن، بەڵام سی پی ئێی هەرگیز بایەخی بەو دوو گرفتە هەرە سەرەکییانەی ئێراقیی نەدا. چونکە لە لایێک دراوی ئێراقیی هیچ نرخێکی نەبوو، لە لایێکی تریشەوە لە بازاڕی زۆر بوو، بۆیێ نرخی بەنزین لە ئێراقیی بە ڕادەیێکی سەیر هەرزان بوو. نرخی یەک گالۆن بەنزین نزیکەی ٥ سنت بوو (دۆلارێک ١٠٠ سنتە - وەرگێڕ) کارمەندانی حکومەتیش مووچەی مانگانەیان لە نێوان ٢ دۆلار بۆ ١٠ دۆلار بوو (نیوەی خاوەن کارەکانی ئێراقیی بوون). جۆرە پارسەنگێک لە نێوان هەرزانی کاڵاو کەمی دەرامەتدا هەبوو. کە سەددام ڕووخا، نەتەوە یەکگرتووەکان گەمارۆی ئابووری لە ئێراقیی هەڵگرت و بەپەلە بەرەو ئابووری جیهانی بردەوە. سی پی ئێی مووچەی کارمەندانی حکومەتی بەجارێک بەرزکردەوە. بەڵام سی پی ئێی هەوڵێکی ڕاستەقینەی نەدا بۆ ئەوەی توانای پاڵاوگەکان پتر بکا. بۆ ئەوەی پێویستی بازاڕی ناو ئێراقیی بدا، سی پی ئێی بەنزینی بە نرخی جیهانی لە هەندەران کڕی و هێنای لە ناو ئێراقیی، هەر گالۆنێکی بە ٥ سنت فرۆشتەوە. کە نرخی نەوت هەڵکشا، ئەو یارمەتییەی سووتەمەنی مانگانە سەدان ملیۆن دۆلاری لێ خەرج دەکرا هەرچەندە جێری بریمەر بەخۆی دەڵێ (بەردی بناغەی کۆماری)، هەرچەندە کە پەیمانیشی دا، بەڵام زاتی ئەوەی نەکرد نرخی سووتەمەنی هەڵکێشێ. وا تێگەشت ئەگەر وابکا، خۆی بە کوشتن دەدا.

چونکە سوپای سەددامیان تواندەوە، بۆیێ سی پی ئێی و لەشکری وڵاتە یەکگرتووەکان ویستیان سوپایێکی نوێ دابمەزرێنن. پرۆسەکە ئەمە بوو: ئەفسەرەکان لەسەر بنەمای دڵسۆزی و شارەزاییان هەڵنەبژاردران و مەشقکردنیان کارامە نەبوو؛ خێرا بوو؛ پرۆسەکە هەوڵی دا ژمارەیێکی زۆری بەتالیۆنی سەربازی پێکەوە بنێ، بێ ئەوەی بایەخ بە توانستیان بدا. لە نیسانی ٢٠٠٤، ئەنجامی ئەو هەوڵانە تاقی بووەوە.

لە ٣١ی ئاداری لە فەللوجەی بوو کە چەکداران چوار زێرەڤانی ئاسایشی

بلاکوۆتەریان لە بۆسەدا گرت. خەڵکی شارەکە ئۆتۆمۆبیلەکانیان سووتاندن. تەرمە سووتاوەکانیان پارچە کردو دوو قەدی سووتاوی دووانیان بە پردێکی ئاسنەوە هەڵواسین. کە وێنەکان لە تێلیڤزیۆنەکانی جیهاندا بڵاو بوونەوەو کاریگەرییەکی زۆریان لە ئەمێریکییان کرد، سەرۆک بوش فەرمانی بە هێزی یەکەمی مارینز دا بۆ ئەوەی دووبارە فەللوجە داگیربکەنەوە.

لە هەمان کاتداو لە ٢٦ی ئاداری بوو کە موقتەدا سەدریش گوتارێکی خوێندەوەو تێیدا ڕەخنەی توندی لە سەرۆک بوش و وڵاتە یەکگرتووەکان و ئیسرائیل گرت و ستایشی پەلامارەکانی ١١ی سێپتێمبەری کرد. چەند مانگ بوو هاوپەیمانان بە تاوانی کوشتنی عبد المجید الخوئی، فەرمانی گرتنی موقتەدایان بەدەستەوە بوو. الخوئی مەلایێکی نەرمڕۆ بوو، لە ١٠ی نیسانی ٢٠٠٣، لە ناو مەرقەدی ئیمام علی لە نەجەف کوژرا. هێزی هاوپەیمانان نەیویست فەرمانەکە جێبەجێ بکاو لەو دەمەی کە سەدر نەیویست میلیشیا تایبەتەکانی قەدەغە بکاو سوپای مەهدی دروست دەکرد تا ژمارەکەی گەیاندە پتر لە ٦٠٠٠ چەکدارو زیندانی تایبەتی خۆی هەبوو و یاسای توندی خۆی پەیڕەو دەکرد، ئەمێریکییەکان چاوی خۆیان لێی نووقاند. کە سەدر گاڵتەی بە ئەمێریکاو بە سەرۆک بوشی کرد، ئینجا برێمەر فەرمانی دا کارێک بکا. فەرمانی دا ڕۆژنامەی الحوزە سەدر بۆ ماوەی دوو مانگ دابخرێ. ئەمەیان کارێکی دیاری سی پی ئێی بوو، پێشتر ئەم جۆرە کارە لە ئێراقیدا نەکرابوو. چاودێرێک ئەو کارەی بەوە چوواند کە بە مێشکوژ پەلاماری پڵینگ بدەی. برێمەر بێ ئەوەی چاوەڕێ بکا تا بزانێ سەدر چ دەکا و کاردانەوەی هاوپەیمانان چ دەبێ، ئەو پەلاماری دا

موقتەدا سەدر بە توندی وەڵامی داوە. سوپای مەهدی شاری سەدرو بەشێکی نەجەف و کەربەلاو کوت و ناسرییەو عیمارەشی گرت. ستافی سی پی ئێی لە باشووری ئێراقێ دیتیان چ دەقەوما، بۆیێ داوایان لە برێمەر کرد تا باشتر بیانپارێزێ. خواستەکانیان پشتگوێ خران. سوپای مەهدی چەندین بارەگای سی پی ئێی داگیرکرد.

ئەمێریکییەکان بە فەللوجەی بێ باشووری ئێراقێ تا ئەوپەڕ پەلبەست ببوون، ناچار داوای یارمەتییان لە سوپاو پۆلیسی ئێراقێ کرد. نیوەی سوپاکە فراری کرد.

هەندێک لە سەربازە عارەبە سوننەکان پەیوەندییان بە یاخیبووانی فەللوجەوە کردو هەندی لە سەربازە عارەبە شیعەکانیش چوونە ناو سوپای مەهدی. عارەبە سوننەکان نەچوون لەبری ئەو سوپایەی کە زۆرینەکەی شیعەو کوردەو لەبری داگیرکەر، بچن شەڕ لە دژی عارەبە سوننەکان بکەن. تەنانەت ئەو سەربازە شیعانەش کە سەر بە میلیشیا نەیارەکانی سەدر بوون، وەک میلیشیاکانی ڕێکخراوی بەدر، ئەوانیش نەچوون شانبەشانی ئەمێریکییەکان لە دژی هاوباوڕە شیعەکانیان بەشەڕبێن.

زۆر لە پۆلیسە عارەبە سوننەکان یان لەگەڵ یاخیبووەکان بوون یان هاریکارییان لەگەڵدا دەکردن. هەر پۆلیسێکی دڵسۆزی "ئێراقە نوێیەکەی" ئەمێریکییان با و لە شارەکانی سێگۆشەی سوننەکان با، مەترسی هەبوو بکوژرێ. بەڵام زۆربەیان لە هاوسۆزییانەوە یارمەتی یاخییەکانیان دەدا نەک لەبەر ئەوەی کە ناچار بوون کە وابکەن(٥٨).

لە باشووریش، ئەمێریکی و بریتانییەکان ڕێگەی پارتە ئایینییە شیعەکانیان دا تا بەڕێوەبەرایەتی ناوخۆ بەدەستەوە بگرن. شیعەکان پۆلیسی ناوخۆیان، بە زۆری لە ریزی میلیشیاکانی خۆیان، بەکرێ گرت. پۆلیسە شیعەکان لە باشوور، فەرمانیان لە دەسەڵاتی ناوەندی ئێراقێ وەرنەگرت، بەڵکو لە سەرکردە سیاسییە شیعەکان وەرگرت کە مووچە زۆرەکانیان پێیان دەدا. سی پی ئێی مووچەی مانگانەی مووچەخۆرانی گەلێک لە سەردەمی سەددامی بەرزتر کردەوەو ئەمەش بووە هۆیەکی سەرەکی بۆ ئەوەی بێکاران پەیوەندی بە سوپاو بە هێزی پۆلیسەوە بکەن.) کە کارمەندە شیعە ناخۆییەکان پشتیوانی هاوپەیمانانیان لە دژی سەدری نەکرد، پۆلیسیش پشتیوانی نەکرد.

کە ئەمێریکییەکان بە خەیاڵ ویستیان سوپایێکی نیشتمانی دروست بکەن، بارزانی و تاڵەبانی بە پێی داخوازی ئەمێریکییەکان ٦,٠٠٠ پێشمەرگەیان ناونووس کرد بۆ ئەوەی پەیوەندی بە ریزی سوپای ئێراقێوە بکەن. نۆ بەتالیۆنیان پێک هێناو

(٥٨) سێگۆشەی سوننە لە بەغداوەرا بەرەو ڕۆژئاوا تا سنووری ئوردن دەچێ و لە بەغداوەشرا بەرەو باکووری ڕۆژئاوا تا میسل دەرواو لایەکەی تریشی سنووری سوریایە.

هەموو کورد بوون و بارەگایەکەشیان هەر لە کوردستانێ بوو. ئەو بەتالیۆنانە کاریگەر بوون و دڵسۆزی هاوپەیمانە ئەمێریکییەکانیان بوون. هیچ سڵ یشیان لە شەڕی یاخییە عارەبە سوننەکان نەکرد. بەڵام تەنیا ئەمێریکییەکان ئەوانیان بە ئێراقی دەناسی. پێشمەرگە دڵسۆزی کوردستانە، نە هی ئێراقێ بێ. لەوەش گرینگتر ئەوەبوو کە عارەبە سوننەکان پێشمەرگە بە ئێراقی نازانن، بەڵکو بەو بەکرێگیراوە بیانییەی دەناسن (زۆربەی سەربازە کوردەکان عارەبی نازانن) کە دەستی خستۆتە نێو دەستی ئەمێریکای دوژمنیانەوە. کە ئۆپەراسیۆنەکەی فەللوجە کۆتایی پێهات، عارەبە سوننەکان هەڕەشەی تۆڵە سەندنەوەیان لە کوردەکان کرد. ستراتیژی ئەمێریکا بۆ ئەوەی سوپایێکی یەکگرتوو دابمەزرێنێ، نەک هەر هەرەسی هێنا، بەڵکو شەڕی ناوخۆشی تۆو دا.

لە نیسانی ٢٠٠٤ بوو کە ئەمێریکییەکان ویستیان بزانن هۆی فێیلەری سوپاو پۆلیسی ئێراقێ چ بوو. مەشقەکەیان خێرابوو، بایەخیش بە بنەما سەربازییەکان نەدرابوو. دەستەی یەکەم خۆ فریودان بوو: یەکەم، چونکە باوەڕ وابوو کە سەربازانی ئێراقێ تا ئەوپەڕ دڵسۆزی دەسەڵاتی نیشتمانی ئێراقی دەبن، کەچی لە ٢٠٠٤ ڕوون بووەوە کە هیچ چین و توێژێکی ئێراقێ سوپایەکەی بە هی خۆی نەدەزانی؛ دووەمیش، وا مەزەندە دەکرا کە سەربازە عارەبە ئێراقییەکان شانبەشانی ئەمێریکی داگیرکەر لە دژی کۆمەڵگە ئایینییەکەی خۆیان دەجەنگن. ئەگەر نەتەوەیێکی ئێراقی ڕەسەنت نەبێ، ناتوانی سوپایێکی ڕەسەنی نیشتمانی پێک بێنی.

پارتە سیاسییە شیعەکان ئەو هەلەیان هەڵقۆستەوە کە ئەمێریکییەکان ویستیان میلیشیاکان نەهێڵن، بۆ ئەوەی باڵەکانی خۆیان بخەنە ناو سوپاو هێزی پۆلیسی ئێراقییەوە، ئەم کارە لە باشوور بە بەربادی کرا. ئەمێریکییەکان وایانزانی ئەگەر ئەو چەکدارانە یەکبەرگی سوپاو پۆلیسیان لەبەر بکرێ، دڵەلا loyalty ی خۆیان دەگۆڕن. بەڵام وا نەبوو. چونکە تا پارتە دینییە شیعەکان، لە هەڵبژاردنەکانی یەنایری ٢٠٠٥، حکومەتیان نەکەوتە بەردەست، سەربازو پۆلیسە شیعەکان دڵەلای خۆیان نەگۆڕی. بەڵام هێشتا گۆڕینەکە هەر بە ڕواڵەت بوو پتر لەوەی کە بە ڕاستی بێ. دەستبەسەرداگرتنی حکومەت لەلایەنی شیعەکانەوە، تەنیا بووە هۆی ئەوەی کە

عارەبە سوننەکان پتر لە سوپاو پۆلیس نامۆ بن. ئێستا ئەگەری ئەوە زۆر کەمترە کە عارەبە سوننەکان پەیوەندی بەو سوپاو پۆلیسی ئێراقییەوە بکەن کە عارەبی شیعە کۆنترۆڵی دەکەن.

کوردەکان وڵات و سوپای خۆیان هەبوو، بۆیێ لە دوورەوەڕا بە جوانی سەیری ئەو ڕووداوانەیان کرد. هاوپەیمانییەکی ڕێکیان لەگەڵ شیعەکاندا کرد. دڵی ئەمێریکییەکانیشیان ڕاگرت و هاوبەشی سوپای ئێراقییان کرد بۆ ئەوەی کە ئاسایشی لەشکری خۆیان بشڵەژێنن.

ئەوەی کە پەیوەندیشی بە پێشمەرگەوە هەبوو، سی پی ئێی سیاسەتێکی پەیڕەو کرد کە لە سەرەتادا زۆر نامۆ بوو، کۆتاییەکەشی گاڵتەجاڕی بوو. تا نیسانی ٢٠٠٤، بەتەواوەتی ڕوون بووەوە کە پێشمەرگە تاکە هێزی سەربازی ئێراقی بوو کە کاریگەر و جێی متمانە و لایەنگری ئەمێریکا بوو. لەگەڵ ئەمەشدا، برێمەر ویستی بۆ بەرژەوەندی سوپایێکی ئێراقی بێ متمانە بیتوێنێتەوە. بۆ ئەم مەبەستەش ڕاوێژکارێکی ڕاند RAND ی نارد کە ناوی دێیڤد گۆمپێرت بوو، بۆ ئەوەی پێشمەرگە هەڵوەشێنێتەوە. چەند ڕۆژ گۆمپێرت لەگەڵ مەسرور بارزانی کۆبووەوە. مەسرور کوڕی مەسعود بارزانییە، وەک مووس تیژە و لە ئەمێریکا پەروەردە بووەو سەرۆکی دەزگای ئاسایشە. مەسرور لە کۆتاییدا، لەگەڵ گۆمپێرت توانی بە ڕێککەوتنێک بگا. پێشمەرگە بزر دەبن. بەڵام لە شوێنی ئەواندا، حکومەتی هەرێمی کوردستان سێ هێزی چەکدار: کە هێزی زێرەڤانی و هێزی کاردانەوەی خێراو هێزی دژە تیرۆر، دادەمەزرێنێ.

لەو کاتەی کە گۆمپێرت چاوەڕێی هێلیکۆپتەرێکی دەکرد کە بیگەڕێنێتەوە بۆ بەغدا، تێبینی ئەوەی کرد کە ئەو کوردانەی خودانی گەورەترین میلیشیای ئێراقین، ئامادەبوون لە پێناوی یەکێتی نیشتمانیان دەستبەرداریان ببن. بەڵام کە لە واتا کوردییەکەی زێرەڤانی چیایی پرسی، گومانی لا پەیدا بوو. چونکە وەڵامەکە هەر (پێشمەرگە) بوو. ئەگەر پرسیاری تریشی بکردایە، بۆی ڕوون دەبووەوە کە (هێزی کاردانەوەی خێرا)و (هێزی دژە تیرۆر)یش، هەموویان لە کوردی هەر دەبوونە (پێشمەرگە).

هەرچەندە سەرۆک بوش گوتی ئەرکی ئەمەریکا ئەوەبوو ئەو سەرفیرازییە بۆ ئێراقییان بێنێ کە لە ئازادی بەدەست دێ، بەڵام بەڕێوەبەرایەتییەکەی دوودڵ بوو لەوەی کە دیموکراسییان بۆ مسۆگەر بکا. بریکاری وەزیری بەرگری وڵاتە یەکگرتووەکان، دۆگلەس فێیس، لەو کەڤاهییەی کە لە دوای یەک مانگ لە ڕووخانی سەددامی، لە ئایاری ٢٠٠٣، لە پێش کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی هاوس دای، بە ڕاشکاوی دیار بوو کە نەیویست بڵێ وڵاتە یەکگرتووەکان بەوە قایل دەبێ ئەگەر ئێراقییەکان بە هەڵبژاردنێکی دیموکراسییانە حکومەتێکی ئیسلامی هەڵبژێرن.

بەڕێوەبەرایەتی بۆ ئەوە دەستووری هەمیشەیی ئێراقێی بەو ئێراقییانە نووسییەوە کە ئەمەریکییەکان هەڵیان بژاردبوون، تا بوارەکانی بەردەم ئێراقییەکان لە هەڵبژاردن تەنگ بکاتەوە. بەمەش، ڕاوێژکارە دەستوورییە ئەمەریکییەکان یارمەتی ئەو ئێراقییانە بدەن کە بۆ نووسینەوەی دەستوورەکە دەستبژێر کرابوون، ئینجا ئەمانە ئەوە مسۆگەر دەکەن کە دەستوورەکە بەندەکانی پاراستنی مافەکانی مرۆڤی لە شێوەی دەستوورەکانی ڕۆژئاوایی تێدا بێت و سیستەمێکی پشکنین و پارسەنگکاری هەبێ و یەکێتی خاکی وڵات بپارێزێ و لە سەنتەرەوەڕا کۆنترۆڵی نەوت بکرێ و سیاسەتەکانی ئابووری و کۆمەڵاتی ئاوای تێدا بنووسرێتەوە کە بە دڵی پارێزگارەکانی ئەمەریکا بێ. پاشان دەستوورەکە بخرێتە بەردەستی ئێراقییەکان تا دەنگی لەبارەیەوە بدەن. لەوکاتدا، ئێراقییەکان دوو ڕێگایان لەپێش دیار دەکرێ؛ یان دەبێ دەنگ بۆ بەڵێی دەستوورەکە بدەن، یان دەبێ مل بۆ داگیرکردنێکی دوورخایەن کەچ بکەن. ڕێبازەکە لێی دیار بوو کە پارێزگارە تازەکان دەیانویست نیازەکانی خۆیان لەوێ بهێننە دی و ببنە دروستکەرەوەی وڵاتێک و جێپەنجەی خۆشیان لەسەر ئێراقێ نیشان بکەن. ئەمەشیان هەر نادیموکراتی بوو.

لە ٢٠٠٣، دەرکەوت کە کاریگەرترین پیاو لە ئێراقێ جێگری بریمەری، جێگری شای ئێراقێ، نەبوو، بەڵکو مەلایێکی حەفتاو سێ ساڵەی لاواز بوو کە لە ماڵێکی ئاسایی لە نزیکی مەزاری عەلی لە نەجەف دەژیا. ئایەتوڵڵاهیلعوزما عەلی سیستانی لە ئێرانێ هاتۆتە دونیاو ڕەگەزنامەکەشی ئێرانییە، بۆی ڕوون بووەوە کە بەڕێوەبەرایەتی بوش ڕێگە بە سەرکردە ئایینییە شیعەکان نادا دەوڵەتێکی ئیسلامی

پێک بێنن، ئەگەر دەنگدەرەکانیشیان دەنگی بۆ بدەن. سستانی باش دەیزانی کە دەنگی بۆ دەدەن(٥٩).

سیستانی هەڵوێستێکی ڕاست و ڕەوانی هەبوو: دەبێ دەستووری ئێراقێ ئێراقییەکان، بە خۆیان، بینووسنەوەو وەک ئەنجامێکی سروشتیش دەبێ وڵاتە یەکگرتووەکان دەسەڵات بۆ حکومەتێکی هەڵبژێردراو بگەڕێنێتەوەو نابێ دەسەڵات بە حکومەتێکی دەستنیشانکراو بداتەوە. ویستی بەزووترین کاتی گونجاو هەڵبژاردن بکرێ، بەو مەرجەی لە ٢٠٠٤ ڕەت نەداو پاشتر یەکسەر داگیرکاری نەمێنێ.

بۆ ئەوەی نێتە بن باری سیستانی، ناوە ناوە برێمەر ستراتیژییەکانی خۆی دەگۆڕی. لە ئەنجامدا سیستانی بووە پاڵەوانێک کە داوای دیمۆکراسی دەکا و بەڕێوەبەرە ئەمێریکییەکەش وا دەرکەوت کە نەیدەویست متمانە بە ئێراقییان بکا. سیستانی هەموو ململانێیەکانی لە برێمەر بردەوەو ئەمەش بارەکەی لە ئەمێریکییان ئاڵۆزتر کرد. برێمەرو بەڕێوەبەرایەتی بوش نەک هەر بوونە نادیمۆکراتی، بەڵکو زۆر بە لاوازیش هاتنە بەرچاو. ئەمەش یەکێک لەو شەڕانەی پەیوەندی گشتی بوو کە بێهوودە وڵاتە یەکگرتووەکان دۆڕاندی.

لە هاوینی ٢٠٠٣بوو کە برێمەر وازی لە بیرۆکەی دامەزراندنی کۆمسیۆنێکی دەستووری هێناو قایل بوو کۆمەڵێکی دەستووری هەڵبژاردراو پێکبێ، بەڵام باسی ئەوەی نەکرد کە کەی سەروەری بۆ ئێراقییەکان دەگەڕێتەوە. لە نۆڤێمبەر، کۆشکی سپی برێمەری هێناوە واشنتن و لێی خواست تا لە ٣٠ حوزەیرانی ٢٠٠٤ دەسەڵات بۆ ئێراقییان بگەڕێنێتەوە. ئەمەش چوار مانگ پێش لە هەڵبژاردنی سەرۆکایەتی وڵاتە یەکگرتووەکان بوو. لەوکات برێمەر ڕێبازێکی ئاڵۆزی بۆ کۆمەڵەی هەر پارێزگایێکی ئێراقی پێکهێنا. بە گوێرەی ئەو ڕێبازە سی پی ئەی و ئەنجومەنی حوکم و ئەنجومەنی پارێزگاکان کە ئەمێریکا دایمەزرادبوون و ئەنجومەنەکانی شارەوانی پێنج لە شارە گەورەکانی هەر پارێزگایێک، ئەوانیش ئەمێریکا دایمەزراندبوون، ئەمانە هەموو شاندی خۆیان هەڵدەبژێرن و ئەمانەش لەلای خۆیانەوە ئەو ئەنجومەنە نیشتمانی ئێراقی کاتییە هەڵدەبژێرن کە دەستوورێکی

---

(٥٩) ڕەنگە کەڤاهیدانەکەی ڤێیس کاری لە سیستانی کردبێ.

کاتی دەنووسێتەوەو حکومەتێکی کاتیش پێکدێنێ.

سستمەکە هێندە ئاڵۆز بوو کە ژمارەیەکی کەمی ئەمێریکییەکان دەیانتوانی ڕاڤەی بکەن. بێگومان ئەو ئێراقییانەی کە لە سستمەکەش گەیشتن، ژمارەیان زۆر نەبوو. سیستانی کرۆکی پێشنیازەکەی هەڵقۆستەوە: هەر ئێراقییەکی کە لەو ئەنجومەنانە بەشداری دەکات، بەخۆیان لەلایەن ئەمێریکییەکانەوە دەستنیشان کراون کە دەشچن حکومەتی ئایندەی ئێراقیٚ هەڵدەبژێرن، ئەوە دەگەیەنێ کە ئەمێریکییەکان لە کۆتاییدا بەخۆیانن کە حکومەتەکەیان هەڵبژاردووە. پرۆسەکە وەک ئێراقییەک پێی گوتم وادەبێ کە هەڵبژاردنەکە کەسانێک دەیکەن کە دەستنیشان کراون و ئەوانیش کەسانێک دەستنیشانی کردوون کە برێمەر هەڵیبژاردوون. سیستانی مکوڕ بوو هەڵبژاردن بکرێ ئەگینا فەتوا (بڕیارێکی ئایینی) لە دژی سستمی ئەنجومەنەکە دەردەکا. لە شوباتی ٢٠٠٤، ئەخدەر ئیبراهیمی، وەزیری پێشووی دەرەوەی جەزایرو نمایندەی تایبەتی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ ئێراقێ، یارمەتی پێشکەش کرد بۆ ئەوەی شێوازێکی دۆزییەوە کە توانی تۆزێک ئابڕووی برێمەر بپارێزێ. بە پێی یاسایەکە ئەنجومەنەکان نابن، لە بەرانبەریش سیستانی قایل بوو کە حکومەتێکی کاتی تەمەن کورت نەتەوە یەکگرتووەکان پێکی بێنێ و لەو ڕۆژەوە کە سەروەری لە ٣٠ حوزەیرانی ٢٠٠٤ دەدرێتەوە ئێراقییان تا هەڵبژاردنەکانی یان لە دیسێمبەری ٢٠٠٤ یانیش لە یەنایری ٢٠٠٥دا دەکرێ، ئەو حکومەتە کاتییە تەمەن کورتە کارەکان بە دەسەڵاتێکی کەمەوە بەڕێوە ببا.

لە بەشێکی گواستنەوەی دەسەڵات، برێمەر قایل بوو کە ئەنجومەنی حوکم یاسای بەڕێوەبەرایەتی کاتی بەر لە شوباتی ٢٠٠٤، دابنێ. یاسای بەڕێوەبەرایەتی کاتی ڕێنەخشە roadmap یێک بۆ هەڵبژاردنەکان دابنێ و دەستەبەری دانانی دەستوورێکی هەمیشەییش بکاو دیاریش بخا دەبێ لە سەردەمی ئەو حکومەتە کاتییە چۆن ئێراق بەڕێوە بچێ. دەکرا یاسای بەڕێوەبەرایەتی کاتی کورت بێ. لە دەزگایەکانی حکومەتێکی کاتی (سەرۆک و ئەنجومەنی وەزیران و یاسای کاتی) و دیارکردنی کەمترین دەسەلاتی پێویست بۆ حکومەت و دانانی خشتەیێکی کاتی هەڵبژاردن و چۆنیەتی هەڵبژاردنی ئەنجومەنێکی دەستووری بترازێ، پێویست نەبوو یاسای بەڕێوەبەرایەتی کاتی باسی چیتر بکا. پێویست بوو ئەو دۆکیومێنتەی کە بە

شێوەیێکی نەرم، کەمترین دەسەڵاتی دیاری دەکرد، بۆ خودی ئێراقییەکان بمابایەوە، بۆ ئەوەی کێشە ئاڵۆزەکانی تایبەت بە ئایندەی خۆیان بەخۆیان چارسەر بکەن. وەک کێشەی ئیسلام و دابەشکردنی دەسەڵات بەسەر کۆمەڵە سەرەکییەکانی ئێراقێ و باری یاسایی کوردستان و ئەگەری ئەوەی کە ئایا شیعەکانیش دەیانتوانی دەوڵەتی خۆیان دابمەزرێنن، ئەمانە هەموو بۆخۆیان لێگەڕابان. ئەو ئاڵۆزییەی لە دەسەڵاتی کاتیدا هەبوو، ڕەنگە بە دوایدا بچێ.

بەڕێوەبەرایەتی بوش بە پەرۆشەوە بوو بۆ ئەوەی جێ پەنجەی خۆی لەسەر دەستووری ئێراقیدا بەێڵێتەوەو یاسای بەڕێوەبەرایەتی کاتیش هەڵێک بوو بۆی هاتبوو. لە سەرەتای یەنایری ٢٠٠٤ بوو کە برێمەرو گەورە یاریدەدەرانی چەندین "بنەما"یان ئامادە کردبوو بۆ ئەوەی وەک خۆیان دەیانویست بیکەنە بناغەیێکی یاسای بەڕێوەبەرایەتی کاتی و سی پی ئێی دەستی پێکرد وەک دەستووریکی کاتی ناوی دەهێنا.

گەلانی ئێراقێ نە بە یەک شێوە سەیری دەوڵەتی ئێراقێ دەکەن و نە بەهای هاوبەشیان لە نێواندا هەیە. بۆیێ گومان لەوەدا نییە کە داڕێشتنی دەستووریێکی ئێراقی زۆرتر لەوە دەکا کە دانوستانێک بێ بۆ گەیشتن بە پەیمانێکی ئاشتی، نەک بۆ ڕێکخستنی دەستنووسێکی درێژدادڕی دەوڵەتێکی هاوبەش بێ. پارتە ئایینییە شیعەکان ویستیان دەوڵەتێکی ئیسلامی پێک بێنن کە زۆر لە لایەنەکانی نموونەی ئێرانێ بێ. کوردەکانیش بە تێکڕای دەنگ داوای سەربەخۆییان کردو چونکە ئەمەیان بۆ نەچووە سەری، بۆیێ بە سستمێکی فیدراڵی شل قایل بوون کە هەموو دەسەڵاتە گونجاوەکانی سەربەخۆیی بۆی مسۆگەر کرد. عارەبە سێکولارەکانیش وڵاتێکی یەکگرتوویان گەرەک بوو، کە کەمێک لە دەسەڵاتەکانی بۆ ئەو هەرێمانە بێ کە بە پێی بنەمایێکی جیۆگرافی دابمەزرێ نەک لەسەر بنەمایێکی ئێتنی بێ (ئەمەش لە بنەڕەتدا بۆ ئەوە بوو کە نەهێڵن کورد هەرێمی تایبەتی خۆیانیان هەبێ، بەڵام دەکرا ئەو سێ پارێزگایە کوردییانە بە جودا جۆرە حوکمێکی زاتییان هەبێ). عارەبە سوننەکان لە ئەنجومەنی حوکم نوێنەریان نەبوو[٦٠]، بەڵکو بەشێوەیێکی گشتی

---

(٦٠) عارەبی سوننە لە ئەنجومەنی حوکمدا هەبوو، بەڵام وەک لە هەڵبژاردنەکانی یەنایرو دیسێمبەری ٢٠٠٥ دەرکەوت هیچ پشتیوانییەکیان لە ناو دانیشتوانی عارەبی سوننەدا نەبوو.

ئێراقییەکیان دەویست دەسەڵاتێکی مەرکەزی، بەو شێوەیەی کە پێشان خۆیان بەڕێوەیان دەبرد، حوکمی بکا. کەچی شیعەکان دەیانویست ئێران ببێتە مۆدێلی سیاسییان و عارەبە سوننەکانیش سەیری عارەبە هاوبیرەکانی خۆیان دەکرد و کوردەکانیش چاویان لە مۆدێلی ڕۆژئاوا بوو.

ئەم دابەشبوونە کاری لە شێوەی تێڕوانینی کۆمەڵگەی ئێراقی کردو هەر لایەنێک بە جۆرێک بیری دەکردەوە. بابەتەکانی کۆنترۆڵکردنی سەرچاوە سروشتییەکان و ڕۆڵی سوپای ئێراقی و مافی ئافرەتان و جووتەزمانی و ئایا دەبێ ئێراق بەشێک لە جیهانی عارەبی بێ، کێشەکانی هەمووان بوون.

برێمەر ویستی دەست بەسەر ئەو مافەی کۆمەڵەی هەڵبژێردراوی دەستووری ئێراقیدا بگرێ و ئەو کێشانە لە یاسای بەڕێوەبەرایەتی کاتی، بە پێی مەرجە ئەمێریکییەکان، چارەسەر بکا. بە خۆی ئێراقێکی یەکگرتووی دەویستو هەر بۆیێش مکوڕ بوو لەسەر ئەوەی کە حکومەتی ناوەندی دەبێ کۆنترۆڵی نەوت و ئاوی ئێراقێ بکاو تاکە دەسەڵاتی بە سەر هێزی چەکداری ئێراقیدا هەبێ و لە سنوورەکانی وڵاتیش بەرپرسیار بێ. هەموو ئەم پێشنیازانە بە بێ بەشکردنی کورد تەواو دەبوو. بنەمایەکانی برێمەر مافەکانی ژنان و کەمینە ئایینییەکانی دەپاراست و هێندە مافەشی بە هاوڵاتیان دابوو کە تا ڕادەیێکی بەرچاو ڕۆڵی ئیسلامی سنووردار کردبوو. ئەمەش پارتە شیعە دینییەکانی نیگەران کردبوو. سیاسییە عارەبە سێکولارەکانیش نزیکەی هەموو لایەنی بنەمایەکانی برێمەریان پێ پەسند بوو. برێمەریش لەلای خۆیەوە یەکێکیانی کردە سەرۆکی دەستەی نووسینەوەی دەستوورەکە، ئەویش عەدنان پاچەچیی بوو کە عارەبێکی سوننەی بەتەمەن و وەزیری پێشووتری دەرەوەی ئێراقێ بوو. لە ڕاستیدا، ئەو بەڵگانەی لەناو دەق و شێوەی دارشتنی دەستوورەکەدا هەیە، بەدیاری دەخەن کە زۆربەی دەستوورەکە لەلایەنی پارێزەرانی حکومەتی وڵاتە یەکگرتووەکان و ئەو سیاسییانەی کە بەڕێوەبەرایەتی دایەزراندبوون، نووسراوەتەوە. برگەیێکی زۆر ئاشکرایە لە وڵاتە یەکگرتووەکان نووسراوەو دادگای باڵای ئێراقێ دادەمەزرێنێ، ئەمەش لە فەقەهی یاسای هەموو ڕۆژهەڵاتی ناقیندا داهێنانێکی تازەبوو. ئەم دادگایەش وەک ئەوەی وڵاتە

یەکگرتووەکان دوا پلەی دادگای ئیستیئناف و دەستووریشە.

بەڕێوەبەرایەتی بوش بە توندی کۆنترۆڵی وتووێژەکانی ناو ئەنجومەنی حوکمی کردبوو. هەرچەندە پێشنیارەکە وابوو کە ئێراقییەکان خۆیان بڕیار لە بەڵگەنامەی یاسای بەڕێوەبەرایەتی کاتی بدەن، بەڵام برێمەر هەموو گۆڕانکارییەکی سەرەکی کە لە بنەما ڕەسەنەکانی ئەمێریکا کرا، لەگەڵ کۆندۆلیزا ڕایسی ڕاوێژکاری ئاسایشی نەتەوەیی ساغ کردەوە ئینجا کردی.

بەڕێوەبەرایەتی زۆربەی خواستەکانی خۆی لە یاسای بەڕێوەبەرایەتی کاتی بەدی کرد، بەڵام هەمووی نەبوو. برێمەر لە ترسی سیستانی قایل بوو کە ئێراق بکاتە دەوڵەتێکی ئیسلامی نەرم. برێمەر، لەگەڵ کورد، زۆر بە ڕەقی هەڵسوکەوتی کردو نەیویست ئەو وەڵامە نووسراوانەیان لەگەڵ تاووتوێ بکا کە دەربارەی بنەما پێشنیازکراوەکانی خۆی دابوویانەوەو پاشان بۆ ئەوەی دەمکوتیان بکاو ڕێگەیان نەدا لە وتووێژەکانی ئەنجومەنی حوکم بەشداری بکەن، هەڕەشەی لێ کردن ئەگەر قسە بکەن (پەیوەندییە تایبەتییەکەیان) لەگەڵ وڵاتە یەکگرتووەکان تێکدەدا.

برێمەر بە چاو سوورکردنەوە توانی لە ٨ی ئادار، واتا یەک حەفتە دوای کاتی دیارکراوی، بە ڕێککەوتنەکەی ئەنجومەنی حوکم گەیشت. ئاهەنگێکی گەورەی بۆ مۆرکردنەکەی سازدا، ویستی لەگەڵ کۆبوونەوەکەی دەستووری فیلادێلفیای ١٧٨٧ ی بەراورد بکا. بیست و پێنج خامەی پەندان لە سەر ئەو مێزە درێژکرابوون کە فەیسەڵی یەکەم، یەکەم مەلیکی ئێراقیّ بەکاری هێنابوو. پاشان یەکە یەکەی ئەندامەکانی ئەنجومەنی حوکم هاتنە پێشەوەو ئەو دۆکیومێنتەیان مۆر کرد کە کۆشکی سپی بە دیمۆکراتی ترین دەستووری ڕۆژهەڵاتی ناڤینی ناوزەد کرد.

سەرکەوتنێکی گرانبەها بوو. هەرچەندە یاسای بەڕێوەبەرایەتی کاتی چەندین دەقی سەنگینی سەبارەت بە مافەکان تێدا بوو، بەڵام هەرگیز لەدەرەوەی گرین زۆون پەیڕەو نەکرا. لە باشوور، پارتە ئایینییە شیعەکان کە ئێستا کۆنترۆڵی تەواوی ناوچەکە دەکەن، هیچ بایەخێکیان نە بە یاسای بەڕێوەبەرایەتی کاتیو نە بە بەندەکانی تایبەت بە مافەکانی مرۆڤ ئافرەت دا، هەستان بنەمایێکی توندی یاسای ئیسلامییان پەیڕەوکرد. لە باکووریش، کوردستان بەردەوام یاساو سستەمی

دەستووری خۆیان پەیڕەو کرد. نە کوردو نە شیعەکانیش دەستبەرداری هێزە چەکدارەکانی خۆیان نەهاتن. هەرچەندە کوردەکان ناچار کران، لەسەر قاقەز، بەوە قایل بن کە بەغدا سەرچاوە سروشتییەکانیان بەڕێوە ببا و کۆنترۆڵی سنوورەکانیشیان لەگەڵ تورکیاو ئێران بکا، بەڵام هێشتا کوردەکان بەردەوام نەوتی خۆیان پەرە پێدەدەن و وەک پێشانیش گومرگی خۆیان هەڵدەسوورێنن و خاڵەکانی سنووریش کۆنترۆڵ دەکەن.

ئەو پرۆسەیەی کە دەسەڵاتی کاتی هاوپەیمانان لە دەرچواندنی یاسای بەڕێوەبەرایەتی کاتی پەیڕەوی کرد، شەرعییەتەکەی لەدەست چواند. زۆربەی یاسای بەڕێوەبەرایەتی کاتی ئەمەریکییەکان، بە نهێنی نووسیانەوە؛ ژمارەی ئەو ئێراقییانەی چاویان بە یاسای بەڕێوەبەرایەتی کاتی کەوت بەر لەوەی کە بریەمەر بە فەرمی ڕایبگەیەنێ، لە سەد کەس کەمتر بوو. بوار بە کەسانی سادە نەدرا بۆ ئەوەی توانجو بۆچوونەکانیانی خۆیان بڵێن، لە نووسینەوەی دەستووری هاوچەرخ، نەبیستراوە کە قوتکردن هەبێ و ئەو پشتگوێخستنەش بوو کە زۆر ئێراقییانی تووڕە کرد. هەروەها، بە پێچەوانەی هیواو ئومێدی ئەمەریکییان، ئەو کێشە سەرەکییانەی کە ئەوان ویستیان لە ناو یاسای بەڕێوەبەرایەتی کاتی چارەسەری بکەن، هەموویان بە شێوەی جیاواز لە ناو دەستووری هەمیشەییدا چارەسەریان بۆ دیار کرا. کێشەکانیش: کۆنترۆڵکردنی سەرچاوە سروشتییەکان و سوپاو باج وەرگرتن و پەیوەندییەکان و ڕۆڵی ئیسلام و لائیحەی مافەکانی دەگرتەوە.

لە کاتێکدا کە بەندە سەرەکییەکانی یاسای بەڕێوەبەرایەتی کاتی بە شێوەیێکی بەرباد پشتگوێ خران، لایەنە سیاسییە ئێراقییەکان پشتیوانی ئەو خشتەی بڕیاردانی دەستوورو هەڵبژاردنی حکومەتی دائمییان کرد. بڕیار بوو حکومەتی کاتی لە ٣٠ حوزەیرانی ٢٠٠٤ دەسەڵات وەربگرێ. لە ٣٠ یەنایری ٢٠٠٥، دەبوو هەڵبژاردن بکرێ و ئەنجومەنی نیشتمانی ئینتقالی هەڵبژێردرێ و ئەمیش دەبوو تا ١٥ی ئاب دەستوورێک دابنێ و ئەگەری شەش مانگ درێژکردنەوەشی هەبوو. گرییان کرد درێژکردنەوەکە نەبێ، دەبوو تا ١٥ی دیسێمبەر دەنگ لەسەر دەستوورەکە بدرێ. ئەگەر لەو دەنگدانەش زۆرینە پەسندیان کرد (ئەگەر دوو سێیەکی دەنگدەرانی سێ

پارێزگاش ماندەلیان نەکرد)، دەبوو هەڵبژاردنی حکومەتێکی هەمیشە لە ١٥ی دیسێمبەری ٢٠٠٥ دا بکرێ. ئەگەر دەستوورەکەش بە زۆرینە یان بە دوو لەسەر سێی سێ پارێزگا، ماندەل کرا، ئەوکات لە بەرواری ١٥ی دیسێمبەر هەڵبژاردن بۆ ئەنجومەنێکی تازەی نووسینەوەی دەستوور دەکرێ. لە هەڵبژاردنەکانی یەنایری ٢٠٠٥، دەنگدەران ئەنجومەنەکانی پارێزگاکان هەڵدەبژێرن، لە کوردستانیش، ئەنجومەنێکی نیشتمانی کوردستانی نوێ هەڵدەبژێردرێ.

یاسای بەڕێوەبەرایەتی کاتی دیاری کرد کە ئەنجومەنی نیشتمانی ئینتیقالی بە دوو سێیەکی دەنگ ئەنجومەنێکی سەرکردایەتی سێ کەسی هەڵبژێرێ کە لە سەرۆک کۆمارو دوو جێگرەکەی پێک دێ (بۆ ئەوەی هەر سێ کۆمەڵە سەرەکییەکەی ئێراقێی تێدا بن). ئینجا ئەنجومەنی سەرۆکایەتی سەرۆک وەزیران دەستنیشان دەکا و ئەویش کابینێتەکەی خۆی هەڵدەبژێرێ. بۆ ئەوەی ئەم سستەمە کار بکا، پێویستی بە دەنگی زۆرینەی دوو سێیەکی هەبوو. واتا زۆرینەی شیعەکان، بەلای کەم، پێویستی بە پشتیوانی یەک لە دوو گرووپەکەی تریانەوە هەبوو. ئەمەش ڕێگەی بۆ هاوپەیمانێتی شیعەو کورد خۆش کردو لە هەڵبژاردنەکانی یەنایر/ ٢٠٠٥ تا ئێستا حوکمڕانی ئێراقێ دەکەن و پێکڕا دەستوورێکی هەمیشەییشیان دانا.

بەگوێرەی ڕێککەوتنەکەی ئەخدەری ئیبراهیمیی نمایندەی نەتەوە یەکگرتووەکان لەگەڵ سیستانی، وا بڕیار بوو کە حکومەتێکی کاتی کاربەڕێوەبردن caretaker پێک بێ، بۆ ئەوەی لە ڕۆژی ٣٠ حوزەیرانی ٢٠٠٤ڕا، کە سەروەری دەدرێتەوە ئێراقییان تا حکومەتێک لە دوای هەڵبژاردنەکانی یەنایری ٢٠٠٥، پێک دێت، کاروباری وڵات بەڕێوە ببا. بەڕیوەبەرایەتی هەر نەیدەویست دیاریکردنی ئایندەی ئێراقێ بخاتە ژێر کۆنترۆڵی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە. بۆیێ لەوکاتەی کە براهیمی، لە ئایاری ٢٠٠٤، لەگەڵ ئێراقییەکان دەستی بە ڕاوێژکاری کرد، ڕۆبێرت بلاکویڵ لە ستافی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی، هاتە بەغدا تا لەگەڵ برێمەر کارێک بکەن کە ئەنجامەکەی هەر لەبن دەستی خۆیان بهێڵنەوە (دەستنیشانکردنی بلاکویڵ نیشانەی ئەوە بوو کە کۆشکی سپی، لە کۆتایی بێنەویەردەکەدا، چیتر متمانەی بە برێمەری نەمابوو.)

سەرۆک بوش تاقە یەک مەراقی لە دڵ مابوو. ئەویش ئەوە بوو کە سەرکردە ئێراقییەکان بە ڕاشکاوی سوپاسگوزاری خۆیان بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان دەرببڕن. بۆیێ لە کۆبوونەوەکەی ۱۹ی ئایاری ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بە برێمەری گوت: "گرینگ ئەوەیە کە یەکێک هەبێ بیەوێ هەستێتە پێوەو سوپاسی گەلی وڵاتە یەکگرتووەکان بکا بۆ ئەو هەموو خۆبەختکارییەی بۆ ئازادکردنی ئێراقێ داویانە. پێشبینی ئەوە ناکەم پیاوێک دەستنیشان بکەین کە هەر بەڵێی هەبێ. بەڵام بەلای کەمی یەکێکمان دەوێ سوپاسگوزار بێ." لە ڕاستیدا بوش کابرایەکی دەویست هەر بەڵێ بزانێ و سوپاسی خودی خۆی بکا. سێ جاران ئەم باسەی لەو کۆبوونەوانەی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەییدا کرد کە بۆ ئێراقێ تەرخان کرابوون.

لەوکاتدا براهیمی ڕای لە سەر ئەوە ڕاوەستا کە حوسێن شەهرستانی زانای ناووکی و سەرۆکی پێشووی کۆمسیۆنی وزەی ئەتۆمی ئێراقی، ببێتە سەرەک وەزیران. شەهرستانی کابرایێکی شیعەیەو لە پارتە سیاسییە شیعەکانەوە نزیکەو کەسیش گومانی لە ئازایەتی و ڕاستی ئەودا نەبوو. شەهرستانی قایل نەبوو یارمەتی سەددامی بدا بۆ ئەوەی بۆمبێکی ئەتۆمی دروست بکا. لەبەر ئەم هەڵوێستەشی یازدە ساڵ لە زیندانی ئەبوغرێب گیرا زۆربەی لە زیندانی ئینفرادی بەسەر برد. ئەو هەڵوێستەشی بوو وای لێ کرد ئەو قسانە نەکا کە بوش لێی دەویست بیکا. بە پێی ڕێنماییەکانی بوش بوو کە برێمەر نکوڵی لە دامەزراندنی شەهرستانی کرد.

برێمەرو بلاکویڵ نکوڵییان لە دامەزراندنی عادل عبد المهدیش کرد. عبد المهدی ئابووریناسێکی زیرەکەو سەبارەت بە بابەتە ئایینییەکانیش، کابرایێکی نەرمڕۆیەو نکوڵی لێکردنیشی لەبەر ئەوە بوو چونکە ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی پشتیوانی لێ دەکرد. إبراهیم جەعفەریشیان ڕەت کردەوە. ئەمەش نوژدارێکە کە سەرکردایەتی حیزبی دەعوە (بانگەواز) دەکا، کە لە ئێراقێ، کۆنترین پارتی ئایینی شیعەیە. بە گوێرەی ئەوەی کە برێمەر نووسییەتی، بەڕێوەبەرایەتی بوش نەیویستووە دەسەڵات لە ئێراقێ تەسلیمی پارتێکی ئیسلامی بکا کە پەیوەندی بە ئێرانێوە هەبێ. بەڕێوەبەرایەتی نەیویست بەلای کەم تا دوای هەڵبژاردنەکانی سەرۆکایەتی ئەمێریکا، کابرایێکی ئیسلامی بێنێ کە جێی سەددامی دەگرێتەوە.

چەند ڤیتۆیێک براهیمی سووڕاند تا گەیاندییە ئەوەی کە دەستنیشانی ئەو پیاوە بکا کە بەڕێوەبەرایەتی دەیویست، ئەویش ئەیاد عەللاوی بوو. عەللاوی دکتۆرەو پێشان ئەستێرەی گەشی حیزبی بەعس بوو کاتێک کە لە ۱۹۷۰کاندا چووە لەندەن و لەوێ لە سەددام حوسێنی هەڵگەڕاوە. شەوێک بەکرێگیراوێکی دەزگای ئێراقی بە دزی چووە نێو ماڵی عەللاوی و ویستی بە تەورداسێک بیکوژێ، زۆری نەمابوو قاچێکی عەللاوی هەڵپاچێ.

لە ۱۹۹۰ عەللاوی یارمەتی پێکهێنانی بزووتنەوەی ویفاقی نیشتمانی ئێراقی کرد. ئەویش لەگەڵ کۆنگرەی نیشتمانی ئێراقی کە أحمد چەلەبی خزمی خۆی سەرۆکایەتی دەکرد، نەیار بوو. لە ۱۹۹۰کان، عەللاوی قەناعەتی بە سی ئای ئێی هێنا کە گرووپەکەی تۆڕێکی پشتیوانانی لە ناو سوپایەکەی سەددامو دەزگا ئاسایشەکەیدا هەیەو کودەتایێک بەرپا دەکا. لە ڕاستیدا موخابەراتی ئێراقی هەر لەسەرەتاوە، کەوتبوونە ناو تۆڕەکەی عەللاوییەوە. لە ۱۹۹۶، موخابەراتی ئێراقێ پتر لە سەد ئەفسەرو ئەوکەسانەی گرت کە پەیوەندییان بە پیلانەکەوە هەبوو، زۆربەیانی بە ئەندامانی خێزانەکانیانەوە ئیعدام کردن. گەورە کاربەدەستێکی وڵاتە یەکگرتووەکان بە ڕۆوین ڕایتی لۆس ئانجلز تایمز گوت کە ئەو ئاشکرابوونە: "یەکێک لە گەورەترین ئەو هەرەسانە بوو کە هەواڵگری وڵاتە یەکگرتووەکان تا ئێستا تووشی هاتووە." ئەو کوردانەی کە لەگەڵ عەللاویدا کاریان کرد، خۆشیانویست، بەڵام بە کابرایێکی خۆهەڵکێشیان دانا.

بەپێی یاسای بەڕێوەبردنی کاتی سەرۆک کۆمار دەسەڵاتێکی کەمی دەبێ، بەڵام پۆستی سەرۆکی وڵات هێمایێکی گرینگە. کوردەکان پشتی جەلال تاڵەبانییان گرت تا پۆوتەکە وەربگرێ. ئێستا تەمەنی حەفتا ساڵەو نیو سەدەیە پتر لە دژی یەکەیەکەی دکتاتۆرەکانی ئێراقێ خەباتی کردووە. لە سەرتاسەری دونیا باش ناسراوەو زۆر زیرەکیشە (بڕوانامەی لە یاسا هەیەو خۆی خۆی فێری ئینگلیسی کردووە.) تاڵەبانی یەکێک لە عیملاقەکانی بزووتنەوەی کوردو ئۆپۆزیسیۆنی ئێراقێ بوو. دوای هەشتا ساڵ لە پەراوێزکردنیان لە ئێراقێ، ئێستا کورد هەست دەکەن کە نۆرەیان هاتووە یەکێک لە پۆستە سەرەکییەکانی ئێراقێ وەربگرن. پێشمەرگەی کورد یارمەتی ئازادکردنی ئێراقێی داو بەتەنیا کوردەکانیش لە ناو هەموو گەلەکانی

ئێراقێ بەهاکانی ئەمێریکایان پەسند کردو ویستیان لە ئێراقێ دایانبمەزرێنن. لە دوای شیعەکان، ژمارەی دانیشتوانی کوردو عارەبە سوننەکان لە ئێراقێ ئەوەندەی یەکترینە.

برێمەر بڕیاری دا کە سەرۆک کۆمار دەبێ لە عارەبە سوننەکان بێ و لە ناوەڕاستی ئایارێ بوو بە تاڵەبانی ڕاگەیاندو پێی گوت: "مستەر تاڵەبانی، [ئەم عارەبە شیعانە] لەمێژە هەستیان کردووە کە لە ئێراقی نوێدا بە ڕاستی نوێنەرایەتییان نەکراوە." تاڵەبانی و بارزانی، هەردووکیان تووڕە بوون. ساڵێک زێتر بوو ئەمێریکییەکان هەر دەیانگوت و بۆیان دووبارە دەکردنەوە کە گرینگە ئێراقی بن. ئێستا وا پێیان گوترا کە ڕەگەزەکەیان شایستەی ئەوەیان ناکا کە لووتکە پۆستی کارگێڕی ئێراقێ وەربگرن. کەمکردنەوە خرایە بان ئەو برینەیان، کاتێک کە ئەمێریکییەکان و براهیمیش شێخ غازی یاوەریان بە یەکەم سەرکۆماری کاتی ئێراقێ دانا. غازی یاوەر بزنسمانێکی عسرەبی سوننەیەو سەر بە گەورەترین خێڵی وڵاتە کە پێشتریش شارەزاییان لە سیاسەتدا هەبووە. غازی هەموو ئەو تایبەتمەندییانەی تێدا هەبوو کە بوش بۆ سەرکردە تازەکانی ئێراقیی دانابوو. بە قسەی برێمەری: "سەرۆک زۆر شادمان بوو بەو سوپاسگوزارییەی کە غازی، سەبارەت بە ڕووخانی سەددامی بە ئاشکرا ئاراستەی هاوپەیمانانی کردبوو."

لە ٣١ی ئایار بوو، براهیمی دامەزراندنی عەللاوی و یاوەری لە کۆنگرەیێکی ڕۆژنامەوانی لە بەغدا ڕاگەیاند. نیگەرانی لەو ئەنجامەی هاتبووە دەستی، لە ڕوخساری دیار بوو. چونکە دیاربوو بەرگری لە دەستکەوتەکەی دەکرد، کە گوتی: "ئەمێریکییەکان حوکمی ئەم وڵاتەیان دەکرد، بۆیێ بێگومان بایەخ بە بیرو بۆچوونیان دراوە...ئایا دکتۆر عەللاوی هەڵبژاردەی ئەوان بووە، یان ئەوان بەم لا یان بەولا هێناویانە تا دایبمەزرێنن، خۆتان دەزانن، باشتر وایە لە خۆیان بپرسن."

لە پاداشتی ئەوەی کە پشتیوانی یاسای بەڕێوەبردنی کاتییان کرد، کوردەکان مکوڕ بوون لەسەر ئەوەی کە پرۆسەکانی دانان بە دەستووری هەمیشەیی، ئێراقێ دەبێ کوردستان لەو دەستوورە ئێراقییە بپارێزێ کە بەبێ قایلمەندی گەلی کوردستان دادەندرێ. پێشنیازەکەی کورد کردیان لەسەرەتا ڕێی دەدا کە

دەستووریکی ئێراقی بکەوێتە کار کە زۆرینەی ئێراقییان دەنگی بۆ دەدەن، بەڵام ئەو دەستووره لە کوردستانێ کاری پێ ناکرێ ئەگەر دەنگدەرانی کورد نەیسەلمێنن. بریمەر ئەم ڕێبازەی پەسند نەکرد چونکە پتر لای ڕەگەزێک دەگرێ. لەبری ئەوە، بریمەرو سەرۆکی حکومەتی سلێمانی کوردستان، بەرهەم سالح، پێشنیارێکیان کرد کە مافی بە دانیشتوانی سێ پارێزگایان دا بۆ ئەوەی بە ڕێژەی دوو لە سێی دەنگدەران بتوانن دەستوورەکە ماندەڵ بکەن[٦١]. ڕاستە شیعەکان بەرهەڵستی مەرجە بنەڕەتییەکەی کوردستانیان سەبارەت بە پشکدارنەکردنی، نەکرد، بەڵام لە بەرانبەری برگەی سێ پارێزگا ڕاوەستان؛ چونکە ئەگەری ئەوە هەبوو کە عارەبە سوننەکانیش بتوانن بە سێ پارێزگا دەستوورەکە ماندەل بکەن[٦٢]. سیستانی برگەی ڤێتۆکردنی بە نادیمۆکراتی ناساندو گوتی کە ئەنجومەنی نیشتمانی نابێ پەیرەوی یاسای بەڕێوەبردنی کاتی بکات.

به پێی یاسای نێودەوڵەتی، ئەو یاسایانەی هێزێکی داگیرکەر دایاندەنێ، لەدوای کە داگیرکردنەکە نەما ئیتر یاسایەکەش ڕەوا نامێنێ. بۆ ئەوەش کە یاسای بەڕێوەبردنی کاتی سیاسییە ئێراقییەکان ناچار بکا کە لە دوای گەڕاندنەوەی سەروەریش هەر پابەندی بن، پێویستی دەکرد کە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیارێکی تایبەتی بۆ دەربکا. بەڵام نە بریمەر بە خۆی نە هیچ کام لە تیمەکەی ئاگایان لەمە نەبوو.

هەڵەیێکی کوشندە بوو. لە میانی نووسینەوەی یاسای بەڕێوەبردنی کاتی، بریمەر پشتی بە دوو لاوی زیرەکی یاریدەدەری خۆی بەست. یەکێکیان سوارێکی کاروباری

---

(٦١) سێ پارێزگای دهۆک و هەولێرو سلێمانی، هەر یەکێکیان پتر لە ٩٥ لەسەدای دانیشتوانەکەی کوردن و بەمەش ڕێگا لەبەر پارتە سیاسییە کوردییەکان ئاسان دەکا بۆ ئەوەی لەکاتی پێویست دەنگ پەیدا بکەن.

(٦٢) لە ڕیفراندۆمی ٢٠٠٥ بوو، عارەبە سوننەکان دوو لە سێی دەنگی (نا)یان لە دوو پارێزگادا کۆ کردەوەو لە نەینەواش (میسل) پێیان کرا تەنیا ٥٨ لە سەدای دەنگی نا پەیدا بکەن. یەک لە هۆیەکانی ئەو سەرنەکەوتنەیان ئەوە بوو کە سەددام سنوورەکانی پارێزگای نەینەوای بۆ بەرژەوەندی گۆڕیبوو و هەندێ ناوچەی گرینگی کوردی دابڕیبوو و هاوێشتبوویە سەریەوە. کوردەکانیش بە زۆرینەی زۆری دەنگەکان پشتیوانی ئەو دەستوورەیان کرد کە مەیلەو سەربەخۆی کردن (سەیری بەشی ٩ بکە).

دەرەوەی وەک هی چەرخەکانی ناڤین و ئەوی تریشیان بیست و چوارساڵییەکی پارێزگار بوو، لە کۆشکی سپی کاری کردبوو. کارمەندی کاروباری دەرەوە پارێزەر نەبووو کارمەندەکەی لە کۆشکی سپیش کاری کردبوو، خەریک بوو بۆ کۆڵێژی یاسا ئەپلای (تەقدیمی) دەکرد.

کوردەکان ڕەچاوی ئەوەیان دەکرد کە یاسای بەڕێوەبردنی کاتی ببێتە بەشێکی بڕیارێکی ئەنجومەنی ئاسایش کە جەخت لە کۆتاییهاتنی داگیرکردن و گەڕانەوەی سەروەری ئێراقیّ بکاتەوە. سیستانی هەڕەشەی دەرکردنی فەتوایێکی کرد ئەگەر لە بڕیارەکەدا باسی یاسای بەڕێوەبردنی کاتی بکرێ. بەڕێوەبەرایەتی بوش کەوتە بەر چەکوچی ئایەتوڵڵاو سنداني پشتیوانی کردنی پرۆسە دەستووره دێمۆکراتیيەکەی خۆی و سیستانی هەڵبژارد. بڕیاری ١٥٤٦ی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان لە ٨ی حوزەیرانی ٢٠٠٤ دەرچوو. بڕیارەکە باسی "ئێراقێکی فێدراڵی دێمۆکراتی، فرەلایەنی یەکگرتووی کرد بەڵام باسی یاسای بەڕێوەبردنی کاتی هەر نەکرد.

بۆ کوردەکان، ئەم ڕووداوانە تەنیا وەرچەرخانێکی کاتی بوون. لەدوای هەڵبژاردنەکانی یەنایر، شیعەکان بۆ ئەوەی حکومەت پێکبێنن، پێویستیان بە کورد هەبوو. تاڵەبانی بووە یەکەم سەرۆکی ئێراق کە بە شێوەیێکی دێمۆکراتی هەڵبژێردرابێ و شیعەکان پەیمانیان دا کە پابەندی پرۆسەکانی یاسای بەڕێوەبردنی کاتی بن. بەڵام سەرجەم پرۆسەکە یارمەتی ئەوەی دا کە لە بەرانبەر بیرۆکەی ئێراقێکی یەکگرتوودا، کوردەکان هەڵوێستی ڕەقتر وەربگرن.

لە ٢٨ی حوزەیرانی ٢٠٠٤ بوو کە جێگری ئەوسای سەرۆک وەزیرانی ئێراقی، بەرهەم ساڵح، لەگەڵ برێمەر چوو تا گەیاندییە کن فڕۆکەیی C-130 زێرەڤانی ئاسمانی نیشتمانی وێست ڤێرجینیا، کە لەسەر قیرتاوی غارەڕێی فرگەی بەغدای نێونەتەوەیی چاوەڕێی دەکرد[٦٣]. وێنەگران ئەو وێنەیەی برێمەریان گرت کە ڕۆژی

---

(٦٣) کە حکومەتی کاتی دامەزرا، بەرهەم ساڵح وازی لە پۆستەکەی کوردستانی هێناو بووە جێگری سەرۆکی وەزیرانی ئێراقیّ. لەو حکومەتەش کە لە دوای هەڵبژاردنەکانی یەنایری ٢٠٠٥دا پێک هات، بووە وەزیری پلاندانان.

پاشتر لە ڕۆژنامەکان بڵاو کرابووەوە و تێیدا لە بەر دەرگەی فڕۆکەکە ڕاوەستابوو و دەستی هەڵدەشەقاندو بایبای دەکرد. دەرگاکە داخراو ئاهەنگی خاترخاستن بە کۆتا هات و هیچ ڕووی نەدا. کە شوێنەکە چۆڵ بوو، برێمەرو پاسەوانەکانی لە فڕۆکە C-130 دابەزین و بەغار خۆیان گەیاندە ئەو هێلیکۆپتەرەی کە لە نزیکیان نیشتبوو، پاشان سواری فڕۆکەیێکی تەکاندەر بوون و بەرەو ئوردن فڕین. ئەگەر یاخییەکان پلانیان بۆ پێکاندنی C-130 هەبا، ئەوا هەموویانی گێل کردبوو.

بڕیار وابوو لە ٣٠ حوزەیران دەسەڵات دەستاودەست بکرێ، بەڵام بەڕێوەبەرایەتی بڕیاری دا کە دوو ڕۆژ بە پێشی بخا، بۆ ئەوەی بەسەر پیلانی تێرۆریستاندا زاڵ ببێ. لە ١٠ پ.ن. ٢٨ی حوزەیران بوو کە سی پی ئێی کۆنگرەێکی ڕۆژنامەگەری هاوبەشی بۆ برێمەرو ئەیاد عەللاوی سەرۆک وەزیرانی تازەی ئێراقێ ساز کرد. کە گەیشتنە جێ، ڕۆژنامەنووسان هەموو بردرانە ژوورەکەی عەللاوی تا ببینن چۆن برێمەر نامەیێکی تەسلیمتی دەستی وەرۆکی دادگای باڵای ئێراقێ کرد، واتا بەفەرمی سەروەری بۆیان گواستەوە. برێمەر دەنووسێ: "من دانم بە نەکاریم دادەنێم کە نەمانتوانی ئارامی دابین بکەین." بە عەللاویشی گوت: "ئەم یاخییانە سەلماندیان کە لەوەی ئێمە مەزەندەمان لێ دەکردن، باشتر ڕێکخراون و ئەستەمتریشە کە ئێمە پێشبینیمان لێ دەکردن بۆ ئەوەی بەناو ڕیزەکانیان بگەین." هێڵێکی کراوە لە نێوان سەرۆک بوش و تیمەکەیدا هەبوو، کاتێک کە لە ئەنکارا بوو، ئامادەی کۆنگرەی سەرانی نەیتۆ دەبوو. بەڵام بەم شێوەیە برێمەر، کە لە هەموو کەسێک باشتر پاس دەکرا، نووسیویەتی دەڵێ: "کە پەیامنێرەکان هاتن، مۆبایلفۆنی هەموویانمان لێیان سەند، نەکا هیچ ڕاپۆرتێک سەبارەت بە دەم و کاتی چالاکییەکە بدەن، یان پاشتر یەکسەر باسی بکەن. ئەمەش بۆ ئەوە بوو ڕێگەم ببێ تا لە ئێراقێ دەرچم."

ئەو فەنتازیایەی کە پارێزگارە تازەکان باسیان دەکرد، کە چۆن ئەمێریکییەکان بە گوڵ پێشوازییان لێ دەکرا، وای لێ هات بووە ئەوە کە بەنهێنی ئاهەنگ بگێڕن و فڕۆکە گۆڕی لێ بکەن.

# بەشی ٨

## کوردستان

کردەوەیێک کە بەنهێنی ئەنجام بدرێ، نابێ لەگەڵ راپەڕاندنی ئەرک، تێکەڵ و پێکەڵی یەکتری بکرێن. "هێنری کیسنگەر بەم چەند وشەیە پەردەی لەسەر دەرئەنجامەکانی کتوپڕ وەستاندنی ئەو ئۆپەراسیۆنە نهێنییە هەڵداوە کە بۆ یارمەتیدانی کورد بەڕێوە دەچوو. لە ١١ی ئاداری ١٩٧٠بوو، سەرکردەی کورد مەلا مستەفا بارزانی(٦٤).

بریکاری سەرۆک کۆماری ئێراقێ سەددام حوسێن چوارچێوەی رێککەوتنێکیان سەبارەت بە کوردستانێکی مەیلەو خودموختار مۆر کرد. شای ئێران کە پێشتر خۆی پشتیوانی هەموو شۆڕشەکانی کوردی لە دژی بەغدا کردبوو، رێکەوتنەکەی پێناخۆش بوو؛ چونکە رژێمی بەعسی بەهێز دەکرد و ئێراقیش بەهێز دەبوو. لە ماوەی چەند ساڵی پاشتر، شا هەوڵی زۆری لەگەڵ بارزانی دا بۆ ئەوەی لە رێکەوتنەکەی ئۆتۆنۆمی پاشگەز بێتەوە و دەست بەشۆڕشی چەکداری بکاتەوە. بەڵام بارزانی متمانەی بەشا نەکرد و شاش بەخۆی بەچاکی لەو راستییە گەیشتبوو.

جا شا ئەمێریکییەکانی لێ هێنا وەڵام. لە٣٠ی ئایاری ١٩٧٢، سەرۆک ریچەرد نیکسن و کیسینگەر سەردانێکی بیست و چوار کاتی تارانییان کرد. جگە لەوەی کە نیکسن و کیسینگەر دەرگای نزیکەی هەموو جۆرە چەکەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانیان بۆ شا کردەوە، دەربارەی ئەوەش رێککەوتن کە پشتیوانی پرۆگرامێکی نهێنی بۆ یارمەتیدانی کوردە ئێراقییەکان بکەن. پرۆگرامەکە هێندە بەنهێنی ئەنجام درابوو، تەنانەت باڵیۆزی وڵاتە یەکگرتووەکانیش لە تارانێ، لێی ئاگادار نەکرابوو. چونکە بارزانی باوەڕی وابوو کە ئەمێریکییەکان پابەندی کێشەکەی دەبن، بۆیێ لە میانی

(٤٦) مەلا مستەفای بارزانی باوکی سەرۆکی کوردستان مەسعود بارزانی بوو.

دانوستانەکەی لەگەڵ حکومەتی ئێراقیّ، هەڵوێستی خۆی توندتر کرد و لە ۱۹۷٤ دوا پێشنیازی سەددامی ڕەتکردەوە. شۆڕشی کورد هەڵگیرساوە.

لە دوای ساڵێک و لە ۷ی ئاداری ۱۹۷٥کە شای ئێران و سەددام لە کۆنگرەیێکی ئۆپیک لە جەزائیر، بەیەکتری گەیشتن و سەددام قایل بوو هەموو ئەو داواکارییانەی شا جیّ بەجیّ بکا و سنووری نێوان هەردوو وڵات لەشەتولعەرەب بکاتە هێڵی تالوێگ، یان ناوەندی قووڵترین شوێنی ناو ڕووبارەکە سنوور بیّ. لە بەرانبەر ئەمەشدا، شا ۲۱۰ مایلی چوارگۆشەی لە ناوچەی ناوەڕاستی سنووری نێوان هەردوو وڵات بۆ ئێراقیّ بگەڕێنێتەوە و ئەو پشتیوانییەش چیتر نەکا کە ئێران لە بارزانی و شۆڕشگێڕە کوردەکانی دەکردد.

لەو کاتەی نیکسن نەمابوو، بەڵام کیسینگەر وەزیری دەرەوەی سەرۆک فۆرد بوو. بیّ ئەوەی تەنها بەیەک قسەش پرۆتستۆی کارەکە بکا، کیسنگەر یەکسەر پشتێکردنەکەی شای پەسند کرد و یارمەتی سی ئای ئێی لە کورد بڕی. بارزانی هاوڕیّ لەگەڵ ۳۰ پێشمەرگە و ئەندامانی خێزانەانیان بوونە پەناهەند[٦٥].

لە میانی یەکەم سەردانی کردنی بۆ کوردستان، لە ئاداری ۲۰۰۲، باڵیۆز ل. پۆوڵ بریمەری سێیەم سەیری یەک لە پۆرترێتەکانی مەلا مستەفای بارزانی کرد و لە مەسعودی کوڕی پرسی:

"ئەوە کێیە؟" کوردەکان زمانیان گیرا. بریمەر مریدێکی کیسینگەر بوو، بەڵام پێدەچوو کە هیچ دەربارەی ئەو کەڵەمێردە نەزانیّ کە کۆنەسەرەکەی خیانەتی لەگەڵدا کرد پاش ئەوەی ئەو متمانەی خۆی پێدابوو. مەلا مستەفای بارزانی چاک فێربوو کە کورد ناتوانن متمانە بەپشتیوانی ئەمێریکییان بکەن، ئەوەش دەرسێک نەبوو کە کوڕەکەی بتوانیّ لە بیری بکا. هەر کەسێک کە بای خوێندنی سەرەتایی زانیاری لە مێژووی کوردستان و ڕۆڵی خانەوادەی بارزانی هەبیّ؛ دەیزانیّ کە مەسعود نەدەچوو

---

(٦٥) مستەفا بارزانی بەنەخۆشی شێرپەنجەی سیپەلاکی لە ۱ی ئاداری ۱۹۷۹، لە نەخۆشخانەی جۆرج واشنتن، دوا ماڵئاوایی کرد، بەڵام هێندە ژیا کە با چاوی خۆی کیسینگەری بینی پۆستەکەی لە دەست چوو، چونکە فۆرد لە هەڵبژاردنەکانی ۱۹۷۷ دۆڕاندی و ئەمەشی دیت کە شا لە یەنایری ۱۹۷۹لە دەسەڵات دەرکرا.

بەوپێیە بڕوا کە بریمەر بانگەوازی بۆ دەکرد دەیگوت: "ڕێی ئێراقی نوێ... ئەوەیە کە نە سوننە و نە شیعە و نە عارەب و نە کورد و نە تورکمانیش، هیچیان زۆرینە نابن."

کوردەکان دەڵێن ئێمە سی ملیۆنی بەتواناین و گەورەترین گەلین لەم جیهانە کە وڵاتێکی خۆمان نییە[٦٦].

کورد زمانێکی هیندۆ-ئەورووپییان هەیە. بەڕەگەز و بەکەلتوور و نەریت و زمانەوانیشیان لە گەلی پارسی ئێرانی لە هەموو گەلانی نزیکترن. تاڕادەیەک زۆرترینیان لە تورکیادا دەژین و لەوێ چارەگی سەرکۆی دانیشتوان پێکدێنن ١٨ ملیۆن دەبن. دەوروبەری ٨ ملیۆن کوردیش لە ئێراندا هەن و ٦ ملیۆن لە ئێراقێ و ژمارەیێکی کەمتریشیان لە سوریا و لە قۆفاز و کازاخستاندا هەن. هەرچەندە نەریتی کوردەواری بەشاخانەوە بەندە و کورد پەندێکی خۆشیان هەیە دەڵێن: "لە چیاکان بترازێ، کورد هیچ دۆستێکی تری نییە، لەگەڵ ئەمەشدا زۆرینەی کوردە ئێراقییەکان لەو شار و شارۆچکانەدا دەژین کە لە دامێنی شاخەکان دانە. زۆرینەی کوردەکانی ئێراقێ سوننەنە،[٦٧] بەڵام بەگشتی لە عارەبان پتر پێڕەوی ڕێبازێکی ئیسلامی کراوە دەکەن. زۆربەی بۆنە و ئاهەنگگێڕانیان هێشتا هەر لەسەر ڕێنماییەکانی ئایینی زەردەشتی پێش ئیسلامەتییە. ئاهەنگی نەورۆزی ٢١ی ئاداریش یەکێک لەو نەریتانەیە.

---

(٦٦) کورد پێشان دەیانگوت ئێمە لەدوای یوکرانییەکان دووەم گەورەترین گەلین کە وڵاتێکی خۆمان نەبێ. لە سێپتێمبەری ١٩٩١، لەگەڵ کەریم خان، کە ئاغایێکی کوردە، لەناو چیا سەرکەشەکانی سەر سنووری نێوان تورکیا و ئێران و ئێراقێ بووین. من و پێشمەرگەیێک گوێمان لە ڕادیۆی بی بی سی ڕاگرتبوو، کاتێک پەخشی کرد کە یوکرانیا سەربەخۆیی خۆی ڕاگەیاند. ئاوڕم لە خانەخوێیەکەم داوە و پیرۆزباییم لێی کرد؛ چونکە کورد پلەیێک چووە پێش و بووە گەورەترین گەل کە نیشتیمانێکی خۆی نەبێ.

(٦٧) بەر لەوەی سەددام بێتە سەر حوکم، نزیکەی یەک ملیۆن کوردی فەیلی لە ئێراقێ هەبوون و بەدرێژایی سنووری ئێرانێ لەگەڵ باشووری کوردستان و لە بەغداش دەژیان. سەددام، ڕەگەزنامەی ئێراقی لە کوردە فەیلییەکانی سەندەوە و زۆریشی سنوور بەدەری ئێرانێ کردن. پێدەچێ زۆرینەی دانیشتوانە کوردەکەی بەغدا ئێستا فەیلی بن و لە هەڵبژاردنەکانی ٢٠٠٥ لە بری ئەوەی دەنگ بەهاوپەیمانی کوردستان بدەن، چوون دەنگی خۆیانییان بەپارتە ئایینییە شیعەکان دا

له هەموو ئەو وڵاتانەی کوردیان تێدا دەژی، سەرکوت دەکرێن، بەڵام هیچیان وەک ئەوەی ئێراقیّ ترسناک نەبووە. هەر لەبەر ئەم هۆیەشە ئێراق هەمیشە لانەی خەباتی نەتەوایەتی کورد بووە و کورد لەویّ لە هەموو شوێنەکانی دیکە نزیکترە خەونی سەربەخۆیی خۆیان تێدا بەدەست بێنن.

له دوای ڕووداوەکانی شەڕی یەکەمی جیهانی، کوردەکان وا تێگەیشتن کە پەیمانی دەوڵەتێکی سەربەخۆیان پێدرابوو. بەو مەبەستەی کە ببێتە بنەمایەک بۆ دووبارە ڕێکخستنەوەی جیهانی دوای شەڕ، لە ١٩١٨ سەرۆک وودرۆوڵسن لە ١٤ خاڵدا بەڕاشکاوی جاڕیدا کە هەر گەلێک مافی هەیە بڕیاری چارەنووسی خۆی بدا. گەلە بندەستەکانی ئیمپراتۆریەتەکان، بەکوردەوە، بەگەرمی پێشوازیان لەو پەیمانە کرد. کوردەکان بۆ ماوەیەکی کورت وایان زانی کە سەربەخۆیی خۆیانیان بەدەست هێنا. له ١٩٢٠ لە سیڤەری نزیک مارسیل، هاوپەیمانان پەیمانێکی خۆ بەدەستەوەدانیان بەسەر پاشماوەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا سەپاند. لە بڕگە ٦٤ی پەیماننامەی سیڤەردا هاتووە:

ئەگەر لە ماوەی یەک ساڵ لە دوای بەکار کەوتنی ئەم پەیمانەی ئێستا گەلەکانی کورد لەو شوێنانەی کە لە بڕگەی ٦٢ [بۆ نموونە: تورکیا] خۆیان بەئەنجومەنی کۆمەڵگەی نەتەوەکان league of nations بناسێنن و بەشێوەیێک بێنە پێش کە زۆرینەی دانیشتوانی ئەم ناوچانە دەیانەویّ سەربەخۆیی لە تورکیا بەدەست بێنن، و ئەگەر ئەنجومەنیش لەو دەم ڕەچاوی کرد کە ئەم گەلانە توانای ئەم سەربەخۆبوونەیان هەیە و ڕێنمایی ئەوەی کرد، دەبیّ ئەوکات بۆیان مسۆگەر بکریّ، هەر لێرە تورکیا قایل دەبیّ کە ئەم جۆرە ڕێنماییە جیّ بەجیّ بکات و واز لە هەموو ماف و دەسەڵاتێک لەم ناوچانە بێنیّ.

هەر هەمان پەیماننامە پارچە کوردییەکانی مێسۆپۆتامیای (ئێستا کوردستانی ئێراقە)دا بریتانیا، بەڵام ڕێگەی بەگەلەکەی دا کە پەیوەندی بە کوردستانەوە بکا، ئەگەر دروست ببا.

هێزە هاوپەیمانە سەرەکییەکان نکۆڵی لەوە ناکەن ئەگەر ئەو کوردانەی دانیشتووی ئەم پارچەی کوردستان کە خراوەتە سەر ویلایەتی میسلەوە، بەویستی خۆیان

بیانەوێ لەگەڵ ئەم دەوڵەتە کوردییە سەربەخۆیە یەکبگرنەوە.

پەیمانی سیڤەر بۆ کورد وەک ئاوی حەیات و خۆری ئازادی نێو نەتەوەیی وابوو. تەنانەت تا ئەمڕۆش، هەر دەمەتەقێیەکی لەگەڵ ئەکادیمیە کوردەکاندا بکرێ، لە کۆتاییدا هەر دەچێتەوە سەر کێشەی نەتەوەیی و ئاماژە بۆ پەیمانی سیڤەر دەکەن و جەخت لەسەر برگەکانی ٦٢ و ٦٤ی دەکەنەوە. لە تورکیاش بەندەکانی سیڤەر شۆڕشێکی بەرپا کرد. کۆماری تورکیا دامەزرا و مستەفا کەمال هاتە سەر حوکم. مستەفا کەمال ئەو ژەنراڵە بوو کە لە شەڕی گالیپۆلی بریتانییەکانی بەزاند و پاشتر بووە نوێخوازێکی گەورەی تورکیا و بەئەتاتورک، واتە باوکی تورکان، ناسرا. هاوپەیمانەکان لە ئەنجامی شەڕ هەموو گیرفان بەتاڵ مابوونەوە و ڕووداوەکانی ئەوروپاش سیوادی ئەوەی بۆ نەهێشتبوون کە بەندەکانی پەیمانی سیڤەر جێ بەجێ بکەن. لە ١٩٢٣، پەیمانێکی نوێیان لە لۆزان، لە سویسرا، لەگەڵ تورکیادا مۆرکرد. پەیمانەکە هیچ باسێکی کوردستانی سەربەخۆی نەکرد(٦٨).

ئێستاش چۆن کوردەکان هەمیشە باسی پەیمانی سیڤەر دەکەن، تورکەکانیش ناوە ناوە دەقی پەیمانی لۆزان لەگەڵ پۆرترێتی ئەتاتورک پێکەوە لە ئۆفیسەکانیان هەڵیان دەواسن. هەڵواسینی پۆرترێتی ئەتاتورک بەزۆری و تۆبزییە.

کە پەیمانی سیڤەر لە ١٩٢١ تەواو، بریتانیەکان دەبوو بڕیار بدەن چ لە ویلایەتی میسل بکەن کە زۆرینەی دانیشتوانەکەی کوردن. وەزیری وەزارەت بۆ کاروباری ڕۆژهەلاتی ناڤین، ونستن چێرچڵ، بەنیاز بوو دەوڵەتێکی کوردی سەربەخۆ لە ویلایەتی میسل دابمەزرێنێ. چێرچڵ پێشبینی کرد کە ناچارکردنی کوردان بۆ ئەوەی لەناو وڵاتێکی عەرەبیدا بژین هەزاران گرفتی لێدەکەوێتەوە:

پێشبینییەکەشی ڕاست دەرچوو. لەگەڵ ئەوەشدا کارمەندانی ئۆفیسی کۆلۆنیالی کە سێرپێرسی کۆکس (موفەوەزی سامی بریتانی لە میسۆپۆتامیا) بەڕێوەی دەبرد و ڕاوێژکارەکەشی گێرترود بێڵ موکوڕ بوون لەسەر ئەوەی کە کوردستان بناخننە ناو ئێراقی، هەر بۆ ئەوەشیان نەبوو کە پێوەری دەوڵەتە تازەکە فراوانتر بکەن، بەڵکو بۆ

(٦٨) گەورە دۆڕاوەکانی تریش یۆنان و ئەرمینیا بوون. یۆنان لە ئەنادۆڵ دەرکرا و ئەرمەنەکانیش نومێدی دەوڵەتێکی خۆیان نەما.

ئەوەش بوو کە کوردە سوننەکان سوننە عارەبەکان لە بەرانبەر ئەو عارەبە شیعانەی کە ژمارەیان زۆرترە پارسەنگ بدەن.

کورد هەرگیز نەهاتنە بەر ئەوەی کە بەشێک لە ئێراقێ بن و لە سەرتاپای مێژووی ئێراقی تازە، ناوەناوە کورد شۆڕشی کردووە و ئێراقیش سەرکوتی کردوونە. کە ئێراق لە ساڵی ۱۹۳۲، سەروەری تەواوی خۆی وەدەستهێنا، بریتانییەکان مەرجی ئەوەیان بۆی دانا کە دەبێ هەر هەمان ساڵ، ئۆتۆنۆمی بۆ کورد مسۆگەر بکا، ئینجا دەتوانێ ئەندامێتی لە کۆمەڵگەی نەتەوەکان وەربگرێ. بەڵام ئەم مەرجە جێ بەجێ نەکرا و کاتێکیش کە لە ۱۹٤٥، نەتەوە یەکگرتووەکان شوێنی کۆمەڵگەی نەتەوەکانی گرتەوە، داخوازییەکەی بریتانیا بەجارێک بزر بوو.

لە ۱۹٤٦یش، کوردەکان لە ئێرانی دراوسێ، کۆمارێکی سەربەخۆیان لە شاری مەهاباد ڕاگەیاند و پەرچەمێکیان بۆ کۆمارەکەیان هەڵبژارد کە لە سێ ڕەنگی سوور و سپی و سەوز پێکهاتبوو، لە ناوەڕاستی ئاڵاکەشیان ڕۆژێک هەبوو کە بیست و یەک تیشکی لێهەڵدەستا. مەلا مستەفای بارزانی سەرۆکی گرینگترین خێڵی کوردستانی ئێراقێ، چووە مەهاباد و لەوێ کرا بە سەرکردەی هێزە چەکدارەکان. لە کاتێکدا کە هێشتا هەر لە مەهاباد بوو، مەلا مستەفا بارزانی لە ١٦ی ئابی ۱۹٤٦، پارتی دیموکراتی کوردستانی دامەزراند. ڕێککەوتێکی خۆش بوو کە مەسعودی کوڕی هەر لە هەمان ڕۆژدا بوو.

کۆماری مەهاباد تەمەنێکی کورتی ژیا، چونکە کە سۆڤییەتییەکان-ئەوانەی باکووری ئێرانییان لە کۆتایی شەڕی دووەمی جیهانیدا، داگیرکردبوو-کشانەوە، کۆمارەکەش ڕووخا. بارزانی و هێزەکانی ڕووبەڕووی هەموو کێشە و گرفتەکانی ڕێ بوونەوە و ملیان پێوەنا و خۆیان گەیاندە یەکێتی سۆڤیەتی. سەرۆک وەزیران قازی محمد ماوە و شا لە سێدارەی دا.

لە دوای ئەو کودەتایەی ۱۹٥۸ کە ڕژێمی پاشایەتی لە ئێراقێ ڕووخاند، بارزانی گەڕاوە. کۆمارە تازەکە ڕایگەیاند کە کورد و عارەب لە ئێراقێ، دوو هاوڵاتی یەکسانن، بەڵام ئەمە هەر بۆ ماوەیەکی کورت بوو. چونکە بەغدا نەیتوانی پابەندی ئەو پەیمانانەی خۆی بێ و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان مسۆگەر بکا. بارزانی

شۆڕشێکی تری لە ١٩٦١ دەسپێکردەوە. لە یەنایری ١٩٧٠ بوو کە مەسعودی کوڕی مەلا مستەفای، پەیامێکی نائاسایی بەدەست گەیشت. شاندێکی حکوومەتی ئێراقیّ لە بازگەی نزیکی بارەگای بارزانی لە چۆمان هاتنە پێشەوە. مەسعود چوو چاوی بەمیوانەکان بکەویّ. شاندەکە چەند وەزیرێک و ئەو پیاوەشی لەگەڵ دابوو کە بەڕاستی کابرایێکی کاربەدەست بوو: سەددام حوسێن بوو.

مەسعود وەبیری دێتەوە کە سەددام کابرایێکی دۆستانەی کارامە بوو. لە دیوەخانێکی قوڕ لەگەڵ مەلا مستەفای بارزانی دانیشت، بۆ ئەوەی بزانن چۆن شەڕەکە کۆتا بێنن. بارزانی گەورە بەسەددامی گوت ئەگەر ئۆتۆنۆمی نەبیّ، ئاشتی نابیّ و هیچ کاتێکیش دەستبەرداری پێشمەرگەش نابیّ. سەددام هەردوو مەرجەکەی پەسەند کرد. کە بارزانی باسی دێمۆکراتی لە ئێراقیّ کرد، سەددام لێی پرسی: "ئێوە بۆ بایەخ بەوە دەدەن کە لە ئێراقێدا ڕوودەدا؟ ئێوە لە کوردستانیّ، ئۆتۆنۆمی خۆتان هەیە. ئەو سستەمەی کە ئێمەش لەو پارچەیەی ئێراقیّ دەمانبیّ پەیوەندی بەئێوەدا نییە

لە ١١ی ئاداری ١٩٧٠، حکوومەتی ئێراقی ئۆتۆنۆمییەکی سنووورداری بۆ کوردستانیّ ڕاگەیاند و مەلا مستەفا فەرمانی بە پێشمەرگەکانی دا شەڕ ڕابگرن. دانوستانەکە بەردەوام بوو، بەڵام هیچ لایەنێکیان نەگەیشتنە ئەو ڕێککەوتنە کە کەرکووک بەشێکی ئۆتۆنۆمی کوردستان بیّ. ئەم خاڵە بوو وای لە بارزانی کرد لە ١٩٧٤ دەست بەشۆڕشەکەی بکاتەوە و بەو باوەڕەوە بوو کە ئەمێریکا پشتیوانی دەکا.

کە شا و سەددام لەسەر پەیمانەکەی جەزایریان ڕێککەوتن، شا پەیامێکی بۆ بارزانی نارد و پێی گوت کە تەنیا یەک ڕێی لەبەردا هەبوو: دەتوانیّ یان خۆی تەسلیمی ئێراقیّ یان ئێرانیّ بکا. لە ٢٣ی ئاداری ١٩٧٥، بارزانی کۆتایی شۆڕشی کوردی ڕاگەیاند. هەموو کوردێک بەو بڕیارە قایل نەبوو. جەلال تاڵەبانی کە یاریدەدەرێکی چالاکی بارزانی بوو و هزری مارکسی پەیڕەو کرد، لە بارزانی جودا بووەوە و لە ١٩٧٥ یەکێتی نیشتیمانی کوردستانی دامەزراند. لە کۆتایی ١٩٧٠کاندا، پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان پەلاماری ڕژێمی ئێراقێیان دەدا، بەڵام چونکە شا ڕێگەی نەدەدا کوردەکان لەناو

خاکی ئێراقەوەڕا هێرشەکانیان بکەن، بۆیە هەر چالاکییەکی کوردی لەم شێوەیە لەسەر ئاستێکی سووک ئەنجام دەدرا. لە ١٩٧٩ ئایەتوڵڵا خومەینی شای لەسەر حوکم لادا و ویستی ڕژێمی بەعسی ئێراقیش بڕووخێنێ. بۆیێ دەستی بەیارمەتی کوردەکانی ئێراقی کردەوە. گەلێ جاران پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتیمانی کوردستان، چەند بەپەرۆشەوە بوون بۆ ئەوەی شەڕی ڕژێمی ئێراقێ بکەن، هێندەش بەپەرۆشی شەڕی دژی یەکترییەوە بوون.

هەرکە شەڕی دژی ئێران و ئێراقێ دەستی پێکرد، پارتی دیموکراتی کوردستان بووە هاوپەیمانی ئێرانێ و هەرکە ئێرانیش لە ١٩٨٣ بەرەی شەڕی لە باکوور کردەوە،یەکێتی نیشتمانی کوردستان ڕایگەیاند کە بەرهەڵستی ئێرانییەکان دەکات و لەگەڵ بەغدا دەستی بەدانوستان کرد، دانوستانەکە چونکە بەهیچ نەگەیشت، لە ١٩٨٥ ڕاگیرا و شەڕی نێوان یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و ڕژێم دەستی پێکردەوە. لە ١٩٨٧ بوو کە ئێراق دەستی پێکرد بەچەکی کیمیایی لە ڕۆژهەلاتی کوردستانێ، پەلاماری دۆڵی بالیسانێی دا و ئەمەش دەستپێکی شالاوەکانی ئەنفال بوو. لە ١٦ی ئاداری ١٩٨٨، گاسی ژاراوی ئێراقێ ٥,٠٠٠ سیڤیلی لە هەڵەبجەدا کوشت. لە نێوان ٢٥ تا ٢٧ی ئابی ١٩٨٨، فڕۆکە شەڕیی و هێلیکۆپتەرەکانی ئێراقێ، چل و هەشت گوندی پارێزگای دهۆکیان گاسباران کرد. هەر لە میانی شالاوەکانی ئەنفال، حکوومەتی ئێراقێ پتر لە چوار هەزار گوندی کوردانی خاپوور کرد و دانیشتوانەکانی یان لە شوێنی دیکە نیشتەجێ کردەوە یانیش پتر لە یەک ملیۆن کەسی ڕاگوێزا و لە نێوان ١٠٠,٠٠٠ تا ١٨٠,٠٠٠ کوردی دیکەشی کوشتن. پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لە ١٩٨٨، ناکۆکییەکانی خۆیانیان بەلاوەنا و هاوڕێ لەگەڵ پێنج پارتی بچووکتر، بەرەی کوردستانییان پێکهێنا. لە دوای ٢٠ی ئابی ١٩٨٨، کە شەڕی ئێراق-ئێران ڕاوەستا، پێشمەرگە ڕووبەڕووی تەواوی سوپای ئێراقێ بووەوە و چونکە ژێر خانێکی گوندەکانی نەبوو، حەشارگەیەکی ناو دانیشتوانی نەمابوو، بۆیێ لە ١٩٨٩و ١٩٩٠، بەناچاری لە شوێنە هەرە شاخاوییەکانی کوردستان چالاکییان هەبوو. تاڵەبانی و بارزانی بوونە ئاوارە و تاڵەبانی کەوتە سوریا و بارزانیش لە ئێرانی جێگیر بوو.

داگیرکردنی کوەیت لەلایەنی ئێراقێ و ئەو شەڕەش کە بەدوایدا هات، بوارێکی تریان بۆ بەرگری کوردی ڕەخساند. کە هاوپەیمانان لە ١٦ی یەنایری ١٩٩١ دەستیان بەبۆردومانی ئیراقێ کرد، پێشمەرگەکان لە ناوەوە زانیارییان سەبارەت بەزیانی ڕاستەقینەی ئیراقێ کۆکردەوە و ڕەوانی دیمەشقیان کرد و لەوێشەوە ڕا بۆ دانسازێکی کورد لە دیترۆید دەناردرا و لەوێش وەردەگێڕدرا بۆ زمانی ئینگلیزی و بۆ من لە کۆمیتەی پەیوەندییەکانی دەرەوەی سێنەت فاکس دەکرا. منیش بۆ هەواڵگری سەربازی ولاتە یەکگرتووەکانم دەنارد. هەرچەندە دەرکەوت زۆربەی ئەو ڕاپۆرتانەی کە کوردەکان دەیانناردا لە دەربارەی ئەو زیانانەی لە بۆردوومانەکان دەکەوتەوە، لەو زانیارییانە ڕاستتر بوون کە بەهۆی سەتەلایت و وێنە ئاسمانییەکانەوە بەدەست دەهات؛ بەڵام هەر سەرنجیان پێنەدرا و هێزی ئاسمانیش کەمتر بایەخی پێدا.

هەرکە سەددام لە شەڕەکەدا دۆڕاندی و شیعەکان لە ئاداری دەستیان بە ڕاپەرینەکەیان کرد، کوردەکانیش هەڵەکەیان هەڵقۆستەوە و هەوری ڕەشی سەرکوتکاری ئێراقییان ڕەواندەوە. لە ناوەڕاستی ئاداری بوو سەرکردەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتیمانی کوردستان بۆ کوردستانی ئێراقێ هاتنەوە و کۆنترۆڵی هەرێمە تازە ئازاد کراوەکانیان کرد. هەروەکوو لە پێشدا باسکرا، ڕاپەرینەکە لە کۆتایی ئاداری کۆتایی هات و سوپای ئێراقێ بەرەو باکوور هەڵکشا و پێشمەرگەش بەهاناوە هات و یارمەتی بەتاڵکردنی ڕێژەیەکی زۆری دانیشتوانی دا و چونکە پێشمەرگە کتوپڕ ئەرکی پاراستنی ئەو خەڵکەی کەوتە ئەستۆ. لە سەرەتای نیسانێ، هێزی پێشمەرگە لە کۆڕێی باکووری هەولێرێ و لە کێوی ئەزمەڕی ڕۆژهەلاتی سلێمانی ڕێی لە تانکەکانی ئێراقێ گرت. بەم جۆرە ڕوویەرێکی زۆری خاک کە ڕەنگە ٧,٠٠٠ میلی دووجا ببێ لە ژێر دەسەلاتی کورد ماوە. کە ولاتە یەکگرتووەکانیش سەتی خۆی گەیاندە باکووری خۆرئاوا و ناوچەی ئارامی ڕاگەیاند، ٣ میلی دووجای تری خستە سەر ئەو خاکەی پێشتر لەبەر دەستی کوردان بوو. زۆربەی هەموو ئەو خاکەی بندەستی کوردەکان، بەتاڵبوو، چونکە لە قۆمەتە بەردی پاشماوەی گوندە خاپوور کراوەکان بترازێ، هیچی تری لێنەبوو.

که سەرۆک جۆرج هـ. و. بۆش بڕیاری دامەزراندنی ئاسمانی هێمنی دا، گوتی که ئەمە تەنیا کردارێکی کاتییە. بۆیێ که سەددام لە نیسانی، بانگی تاڵەبانی و بارزانی کرد بۆ ئەوەی دەست بە دانوستانەکەی ئۆتۆنۆمی بکەنەوە، دەستیان پێکردەوە. مەسعود بارزانی لەو باوەڕەدابوو، ئەو دیکتاتۆرەی ئێستا جیاوازی لەگەڵ ئەو کابرا کارێزمایە هەبوو که بیست ساڵ بەر لە ئێستا لەناو چیا چاوی پێکەوتبوو. پاشتر بارزانی پێیگوتم:"تەنانەت نزیکترین یاوەرەکانی، کاتێک کە ئەو ئامادەبایە، نەدەوێران قسە بکەن" سەددام لە چارەسەری دەگەڕا، بەڵام ئامادە نەبوو هیچ لە ڕێککەوتنەی ئۆتۆنۆمی ئاداری ١٩٧٠ ڕەت بدا. بارزانی بەنەرمی لە سۆراغی ئەو دەیان هەزار کوردەی پرسی کە لە دە ساڵی ڕابردوودا بێسەروشوێن ببوون، هەرچەندە پێنج هەزاری مرۆی خێلی بارزانی بوون، بەڵام بارزانی بەتایبەتی باسی نەکردن. بارزانی لەبیری بوو کە گوتی: "نەیتوانی تەماشام بکا. گوتی زۆر شتی خراپ کراوە. ئەگەر بگەینە ڕێککەوتنێک، ئەوا ئەوانەی کە ماون هەموویان ئازاد دەکەم. شتێکیش بۆ ئەوانە دەکەین کە نەماون. بارزانی دەڵێ لەوەدەم:" زانیم کە هەموویان مردبوون.

یەکسەر لە دوای کارەساتی دوای ڕاپەڕینەکانی ١٩٩١ بوو، پێدەچوو سەددام توانای بەسەر دەسەڵاتدا وەک جاران توند نەمابێ، بۆیێ دانوستانی لەگەڵ کوردەکان کرد. کە هاوینی ١٩٩١ هات، متمانەی پتری بەخۆی هاتەوە و مەیلی چارەسەری مامناوەندی دیسان لەکن نەما. کە بەدیاریش کەوت لەشکری وڵاتە یەکگرتووەکان لەوێ دەمێنێتەوە، هەڵوێستی کوردەکانیش وەک جاران نەرم نەما. لە سێپتێمبەر بوو سەددام ویستی کوردەکان تووشی چارەنووسێکی خراپ بکا. سوپای ئێراقی بۆ ئەو هێڵە کشاندەوە کە خۆی بە سنووری کوردستانی دادەناو دەسەڵاتی هەردوو شارە گەورەکەی هەولێر و سلێمانی لەو هەرێمەدا بۆ کۆنترۆڵی پارتە سیاسییە کوردییەکان بەجێهێشت.(٦٩)

---

(٦٩) باشتر سنوورەکە بە هێلی کەسک ناوی دەرکردو ئێستاش هەر ئەو هێڵە بووەتە سنووری فەرمی هەرێمی کوردستان و لە دەقی یاسای بەڕێوەبردنی کاتی دانی پێدانا و لە هەمیشەیی ئێراقیش دووپات کراوەتەوە. ئەو ناوچانەی کە کورد بەڕێوەیان دەبەن زۆرینەی دانیشتوانەکانیان کوردن و ئێستاش داوای ئەو پارێزگا تێکەڵ و شاری کەرکووکیش دەکەن.

هەروەها مووچەی مانگانەی کارمەندە سیڤیلە کوردەکانیشی، بە مامۆستاو پۆلیسەوەش، هەمووی ڕاگرت. ئەمەش دەسەلاتدارە کوردە تازەکان ئەرکی ئەو هەموو خەڵکەیان کەوتە ئەستۆ؛ بێ ئەوەی هیچ دەرامەتێکیان لەبەردەستدا هەبێ.

سەددام پێشبینی ئەوەی دەکرد کە دەسەلاتدارە کوردەکان بە پێی چەند مەرجێک خۆیان بەدەستەوە دەدەن. بەلام لەبری ئەوە، مامۆستایان لە وانە گوتنەوە بەردەوامبوون و پۆلیسیش دەستبەرداری پارێزگاری نەبوو. هەموو بێ مووچە کاریان کرد. کە بارودۆخەکەش ئاسایی بووەوە، هاولاتییە کوردە ئاساییەکە چێژیان لە ئازادییەکەیان وەرگرت و بە دڵخۆشێ و ئاسوودەییەوە دەچوون لە سەیرانگاکانیان کاتی خۆیان بەسەر دەبرد.

لە ١٩٩٢، بەرەی کوردستانی بڕیاری دا حکومەتی هەرێمی کوردستان پێکبێنێ و پارلەمانی کوردستان و سەرۆکی کوردستان هەڵبژێرێ. هەڵبژاردنەکان تاکە هەڵبژاردنی دێمۆکراتی بوون بە درێژایی مێژوو لە ئێراقیدا بکرێن و هەنگاوێکی گەورەی بەرەو دێمۆکراتی بوون. کاربەدەستە کوردەکان بۆ ئەوەی لە ساختەکاری دوور بن و کاری چاودێرانی نێونەتەوەیی ئاسان بکەن، هەستا تەنیا چەند سەد بنکەیێکی هەڵبژاردنیان لەو خاکەدا کردەوە کە ڕووبەرەکەی هێندەی خاکی سویسرایە. کوردەکان سەفەری دووریان کرد تا بگەنە ناوەندەکانی دەنگدان و هەندێکیان هەشت سعات ڕاوەستان تا دەنگیان دا. پتر لە ٨٠ لە سەدا بەشداری هەڵبژاردنەکەیان کرد.

دەنگدانەکە چەند کارێکی نائاسایی بوو دەرئەنجامەکەشی هێندە جێی نیگەرانی بوو. پارتی دێموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە هەڵبژاردنەکەی ئەنجومەنی نیشتمانی بە شێوەیێکی کاریگەر کەوتنە قەیمە. نە مەسعود بارزانی و نە جەلال تاڵەبانیش زۆرینەی دەنگەکانی هەڵبژاردنەکەی سەرۆکایەتی بەدەست نەهێنا. پارتەکان لەبری ئەوەی بکەونە ململانێ، لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە سەرۆکیان نەبێ، بەلام ئەنجومەنێکی وەزیرانی هاوبەیمانی پێکبێنن کە هەردوولا هەندەی یەکتری وەزیریان ببێ. لەسەر زەویش، یەکێتی نیشتمانی کوردستان بنکەی بەهێزی لە شاری سلێمانیی ڕۆژهەلاتی کوردستاندا هەبوو، کەچی پارتی دێمۆکراتی

کوردستان بنکەیێکی چڕوپڕی لە ناوچە سنوورییەکانی نزیک تورکیا هەبوو کە بە شێوەزاری کرمانجی دەئاخێڤن. هەولێری پایتەختیش مەیدانی پێشبڕکێیان بوو.

دابەشکردنی دەسەڵات بە نەرمی بەڕێوە نەچوو؛ لەسەر دابەشکردنی داهاتی گومرگی پردی خابور لە ١٩٩٤ لێکترازان. پارتی دیمۆکراتی کوردستان کۆنترۆڵی داهاتەکەی دەکرد و لەوێ "پارەی گومرگ"یان لە بازرگانی یاسایی و قاچاغ لەگەڵ تورکیا وەردەگرت و ئەمەش تەنیا سەرچاوەی دەرامەتی کاربەدەستانی هەرێم بوو. شەڕ و لێکدانی نێوان ئەو پێشمەرگانەی سەر بە هەردوو پارتە نەیارەکان پەرەی سەند و شەڕێکی سیڤیلی نێوان کوردەکانی لێکەوتەوە.

لە ئابی ١٩٩٦، ئەو پەلامارەی کە یەکێتی بە دەست لە پشدانی ئێرانییەکان کردی، مەسعود بارزانی بێ ئومێد کردو وایلێکرد کە داوای یارمەتی لە سەددام حوسێنی بکا. لە ٣١ ئاب، هێزە ئێراقییەکان هاتنە ناو هەولێر و یەکێتی نیشتمانی کوردستانیان وەدەرنا و پارتی دیمۆکراتی کوردستانیان سەپاند و گەڕانەوە. بەڕێوەبەرایەتی کلنتن هەنگاوی نا بۆ ئەوەی واز لە ناوچەی ئارام بێنێ؛ چونکە سەددام دووبارە خاکەکەی داگیرکردووەوە. وڵاتە یەکگرتووەکان پێنج هەزار کوردی لە ئێراقێ گواستەوە، چونکە بە هۆی هاریکاریکردنیان لەگەڵ نەتەوە یەکگرتووەکان و گروپە فریاگوزاری و سوپای وڵاتە یەکگرتووەکان، ژیانیان کەوتبووە مەترسییەوە.

لە باڵوێزخانەی لە زەگریبەوەڕا، پەیوەندیم بە هاوڕێیەکانم لە بەڕێوەبەرایەتی کرد بۆ ئەوەی تێیان بگەینم کە کردەوەکەی بارزانی کردی، هەرچەندە جێی داخ بوو، بەڵام حوکمڕانییە خۆییەکەی کوردستانی لەناو برد(٧٠).

جەختم کردەوە کە تەنیا ئەو پێنج هەزار کوردەی ڕاگێزرانەوە لە مەترسیدا نەبوون بەڵکو چوار ملیۆن کورد لە مەترسیدا بوون، بۆیێ پێویستە وڵاتە یەکگرتووەکان ناوچەی ئارام هەر بهێڵێتەوە. هەمیشە وای بۆ چوویمە کە ڕووداوەکەی ١٩٩٦ هەلێکی بۆ سەددام ڕەخساند تا کوردستانە جیاوازە نەهێڵێ کە ببووە بنکەیێکی ئەوانەی لەناوەوەی ئێراقێ بەرهەڵستی ڕژێمەکەیان دەکرد. سەددام بە بارزانی گوتبوو کە سوپای ئێراقی لەناو هەولێردا نامێنێ و لەبەر هەر هۆیێکیش بووبێ

---

(٧٠) وەک پێشتر تێبینیم دا من لە ١٩٩٣ بوومە باڵوێز لە کرواتیا.

ڕێزی پەیمانەکەی خۆی گرت. لە کۆتایی ١٩٩٦، وڵاتە یەکگرتووەکان گەڕاوە و ئەمجارە بۆ ئەوەبوو کە بەتەواوەتی کوردستان بپارێزێ.

لە ١٩٩٨، دوای دوو ساڵ لە هەوڵی دیپلۆماسی چڕوپڕ وەزارەتی دەرەوە لە ناوبژیوانی کردن بۆ کۆتایی پێهێنانی شەڕەکەی نێوان پارتی دیمۆکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستانی سەرکەوت. هەریەک لە پارتەکان ناوچەی تایبەتی خۆی هەبوو؛ یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە سلێمانی و پارتی دیمۆکراتی کوردستانیش لە هەولێرو لە دهۆکێ بوو. هێزە ئاشتی پارێزە تورکەکانیش چاودێری هێلی ئاگربەستی نێوان هەردوو لایان دەکرد. هەرچەندە هەردوولا خۆیانیان بە حکومەتی هەرێمی کوردستان دەناساند، بەڵام هەر ناوچەیێک سەرۆک وەزیران و حکومەتی تایبەتی خۆی هەبوو. ساڵ لە دوای ساڵ هەردوو ناوچەکە هاریکاری نێوان خۆیانیان چڕتر کردو لەکۆتاییدا داوایان لە تورکە ئاشتیپارێزەکان کرد تا بڕۆن. لە کۆتایی ٢٠٠٢، ئەندامانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان قایلبوون بێنەوە ناو پەرلەمان و بەمەش دەسەڵاتیان پێی داوە بۆ ئەوەی وەک دەزگایێکی یاسادانانی بۆ هەموو هەرێمەکە کاربکا. لە ٢٠٠٥، پارتی دیمۆکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان پێکرا پشتیوانی مەسعود بارزانیان کرد بۆ ئەوەی ببێتە سەرۆکی کوردستان و لە ٢٠٠٦ش ئەنجومەنێکی وەزیرانی یەکگرتوویان بە سەرۆکایەتی نێچیرڤان بارزانی پێکهێنا.

سەرەڕای ئەوەی کە کورد ناکۆکی ناوخۆییان هەبوو، بەڵام هێشتا توانییان لە ماوەی دوازدە ساڵی ئەو ئازادییەی کە بە هۆی پاراستنی وڵاتە یەکگرتووەکان و بەریتانیا، بۆیان بەدەست هاتبوو، سوودێکی زۆر وەربگرن. لە ماوەی ئەو حەفتا ساڵەی کە ئێراق حوکمی کوردستانی دەکرد تا ١٩٩١، دەسەڵاتدارانی بەغدا تەنیا هەزار قوتابخانەیان لێ دروست کردبوو. هەردوو حکومەتەکەی کوردستان لە ١٩٩٢ تا ٢٠٠٢ دوو هەزار قوتابخانەی دیکەیان دروست کرد و مامۆستای پێویستیشیان بۆ مەشق تەیار دان. کە سەددام لە ١٩٩١ لە کوردستانێ دەرکەوت، تەنیا یەک زانکۆ لەو هەرێمەدا هەبوو. حکومەتەکانی کوردستان دوو زانکۆی دیکەیان لە دهۆک و سلێمانی کردەوە. هەرسێ زانکۆیەکە توانای بەرزیان تێدا هەیە. وانەی پزیشکی بە

زمانی ئینگلیسی دەگوترێتەوە بۆردی نۆژداری بریتانیش British Medical Board دان بە پزیشکە نوێیەکانی کوردستان دادەنێ.

لە هەمووشیان گرینگتر ئەوەیە کە کوردەکان ئەو چوار هەزار گوندەیان ئاوەدان کردەوە کە سوپایەکەی سەددام حوسێنی لە ١٩٧٠کان و١٩٨٠ خاپووری کردبوون. جوتیارەکان جۆوجۆیارەکانی خۆیانیان چاک کردەوە. کێڵگە پشتگوێ خراوەکان دووبارە بەرهەمی گەنم و جۆیان دەدەنەوە. بەو پارەیەی کە نەتەوە یەککگرتووەکان لە بەرنامەی نەوت بە خۆراک بۆ کوردستانی دەهێنا، حکومەتەکانی کوردستان پرۆگرامێکی گەورەیان جێبەجێ کرد و ئەو هەموو گردۆڵکانەی کە سەدان ساڵ بوو بە رووتی مابوونەوە ملیۆنەها بنەداری سەروویان لێ چاندن. بەرهەمی ئەوەش ئەمەیە کە کورد دەستیان بە گۆڕینی ژینگەی هەرێمەکەی خۆیان کردووە. کە لە هاوینی ١٩٨٦ و لە میانی ئەو هەوڵانەی کە سەددام بۆ خاپوور کردنی دەشتی کوردستان دەیدا، ئەو کات کوردستان کرابووە دەشتێک لە تۆز و خۆڵدا دەخنکا. دوای پازدە ساڵ، لە هاوین هاتمەوە و دیتم ئەو خاکە بۆر ژەنگاوییەی پێشان ئێستا زەرد دەچووەوە و کێڵگەکانی پڕ گەنم بوو؛ چاوەڕێی دروێنەیان دەکرد.

کە تارمایی شەڕی دووەمی ئێراقی لە ٢٠٠٢ بەدەرکەوت، زۆر لە کوردەکان لەوە ترسان کە ڕەنگە ڕوخانی سەددام ببێتە هۆی ئەوەی کە ئەمێریکا چیتر ئازادییەکەیان نەپارێزێ و ئەمێریکییەکان ڕێگا بە حکومەتێکی دیمۆکراتی تری ئێراقی بدا بۆ ئەوەی سەربەخۆییەکەیان لە پێشان کەمتر بکاتەوە. دوکاندارێکی سلێمانی لە تەموزی ٢٠٠٢، پێی گوتم: "کە سەددام مرد، ئومێد دەکەم تاهەتایێ هەر لە دۆزەخ بمێنێتەوە سو ئەشکەنجە بدرێ. بەڵام ئێستا، ئومێدی تەمەن درێژی بۆ دەخوازم.

بارزانی و تاڵەبانی ستراتیژییەتێکی سادەیان هەڵبژارد. زانییان ناتوانن کار لە بڕیارەکەی سەرۆک بۆش سەبارەت بە کردن و نەکردنی شەڕ، بکەن. بەڵام بڕیاریان دا، ئەگەر ئەمریکا بچێتە شەڕ، ئەوان بەتوندی بێ پێچ و پەنا لای ئەمریکا بگرن. لە میانی خۆ ئامادەکردن و لە کاتی شەڕەکەش، کەسێک نەبوو هێندەی کورد هاریکاری وڵاتە یەککگرتووەکان بێ. پێشمەرگەی کورد لە هەموو هاوپەیمانانی ئەمێریکا پتر

قوربانییان دا. یەکێک لەوانەی بەسەختی بریندار بوون، برای مەسعود بارزانی بوو کە لەمیانی ڕووداوێکی "دۆستاگر friendly fire" زامێکی ئاوای لە سەری بوو کە هەر ئەوەتا نەیکوشت.

ئەمێریکییەکان لێرە، بە هەڵە لە پشتیوانی کردنەکەی کوردستان لە هاوپەیمانان گەیشتن و وایانزانی کە کورد دەیویست ڕۆڵی دیارکراویان لە دروستکردنی ئێراقێکی دیموکراتی و فرە ئیتنی و یەکگرتوودا بگێڕن. بە سەردانێکی خێرا بۆ کوردستان یان بە چاوپێداخشانێکی بەپەلەی مێژووی کوردستان ڕوون دەبێتەوە کە ئەمە تەنیا خەیاڵە پڵاو بوو.

شەڕی ئێراقێ باشترین دەستکەوتی گونجاوی بۆ کورد وەبەرهەمهێنا. وڵاتە یەکگرتووەکان نەک تەنیا سەددامی لادا، بەڵکو ئەو ڕێکخراوانەی وەک سوپا و حیزبی بەعس و دەزگا سیخورییەکان کە عارەبە سوننەکان حوکمیان پێدەکرد، هەموویانی لەبن هێنا. کە بڕێمەر مشتەکۆڵەی خۆی وەشاند و بە فەرمی دامودەزگاکانی هەڵوەشاندەوە، کوردەکان دەستخۆشییان لێی کرد. بڕێمەر بنەماکانی سەربەخۆیی کوردستانی پتەوتر و بەهێزتر کرد.

شەڕەکە هەڵوێستی نێونەتەوەییشی بەرانبەر بە کوردستان گۆڕی. لە شوباتی ٢٠٠٣ بوو، پارلەمانی تورکی ڕێی نەوا سوپای زرێپۆشی چوارەمی ئەمێریکی - کە ئەو کات لە ڕۆژهەڵاتی دەریای ناوەڕاست لەسەر پشتی کەشتییەکانی شەڕی سووریان دەخواردەوە - تا بەناو خاکی تورکیا بێن و بەرەیێکی شەڕی لە باکووری ئێراقدا بکەنەوە. ئەم نکۆڵی لێکردنە پەیوەندییەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی لەگەڵ تورکیا پشتەوشار کردەوە و پارێزگارە تازەکانی پێنتاگۆنی تووڕە کرد؛ چونکە لەمێژ بوو ئەوانە پشتیوانی پەیوەندی توندی نێوان وڵاتە یەکگرتووەکان و تورکیایان دەکرد[٧١].

(٧١) حکومەتی تورکیا هێشتا تووڕەییەکەی ئەمریکای توند کرد کاتێک کە گوتی پەرلەمان هەڵوێستی خۆی دەگۆڕێ و نەیگۆڕی. سوپای چوارەمی زرێپۆش بە ناچاری لە ڕۆژهەڵاتی دەریای سپی سووری دەخوارد پێش ئەوەی بەرەوکوێت بچێ. هێشتا هەر لە ڕێ بوو کاتێ کە شەڕەکە لە ئێراقێ دەستی پێکرا

کوردەکان دۆستایەتییەکی زۆری ئەمێریکییانیان کرد کاتێک کە بەرەی باکووریان دروست کرد. لە بنەڕەتدا بڕیار وابوو سوپای چوارەمی زرێپۆش ئەو بەرەیە لە ئەستۆ بگرێ. هەرکە هێزەکانی ئەمێریکا لە کویتەوەڕا بەرەو باکوور هەڵکشان، هێزی پێشمەرگە بە یارمەتی هێزە تایبەتییەکانی ئەمێریکا فرقە سەربازییە ئێراقییەکانیان لێک هەڵوەشاندەوە و لەگەڵ داڕمانی هێزەکانی سەددامی بۆ ناو میسل و کەرکووکێ چوون.

بە بۆچوونی کوردان، ئەو خۆنیشاندانەی هێزی ئەمێریکی کە سەددامی گسک دا، بەرانبەر بە دوژمنی هەمیشەیی کە ئێرا ن و سوریا بوون، هەواڵێکی دڵخۆشکەر بوو. سەرکردەیێکی کورد بەم شێوەیە بۆی باس کردم و گوتی:

ئێراق و ئێران و سوریا و تورکیا هەمیشە وەک چوار سەگ چاڵەوانەیان لە ئێمەی کورد کردووە. سەگەکەی ئێراقی تۆپی. سەگەکەی تورک وا لە کولانەدایە. سەگەکانی سوریا و ئێرانیش لە ترسان گۆشەگیر بووینە.

دوو حەفتە بوو سەددام ڕوخابوو کە لەگەڵ سەرکردەکانی کورد، دەربارەی ئایندەی کوردستان و دەبێ چ لە دەستووری ئێراقدا بەدەست بێنن، دەستم بە وتووێژ کرد. لەگەڵ مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانیدا قسەم کرد، بەڵام ئەوان مێشکیان بە پێکهێنانی حکومەتێکی کاتی ئێراقی[72] و هەزاران کێشەی کتوپڕی دوای شەڕەوە خەریک بوو، ئەمەش کارێکی ڕەوا بوو. هەندێ لە باشترین ئەو وتووێژانەم لەگەڵ هەردوو سەرۆک وەزیرە گەنجەکەی کوردستان بوو. بەرهەم ساڵح لە سلێمانی و نێچیرڤان بارزانی لە هەولێرێ بوو. نێچیرڤان برازای مەسعودە و لە دیسێمبەری ١٩٩٩وە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانە. پیاوێکی ڕاست و کارامە و وتووێژکارێکی توندە. لەگەڵ ئەنجامدانی دانوستانی پتر و تەتڵەکردنی بابەتی تایبەت بە ئایندەی کوردستان لەگەڵیدا، تێیگەیشتم کە هزرڤانێکی ستراتیژی بێهاوتایە و ئامانجێکی زۆر ڕووناکیشی هەیە - ئەویش پاراستنی ئەو سەربەخۆییە دیفاکتۆیەی کوردستانە.

بەرهەم ساڵحیش دیپلۆماتێکی کارامەیە. پەیوەندییەکی هێندە باشی بە واشنتنەوە

---

(٧٢) برتمەر تا ١٦ی ئایار بیری لێنەکردەوە.

هەیە کە هەر سیاسەتوانێکی ئەمەریکی ئیرەیی پێدەبا و دەشێ بە شێوەیێکی نائاسایی قەناعەت بە بەرانبەرەکی بێنێ. بەرهەم کە لەسالانی ۱۹۹۰ەکان لە ولاتە یەکگرتووەکان نوێنەری یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوو، پەیوەندی باشی لەگەڵ دیمۆکراتەکان لە کۆشکی سپی و کۆنگرێس پەیدا کرد و پاشانیش بەهەمان شێوە دۆستایەتی لەگەڵ ئەو پارێزگارە تازانەش دروست کرد کە پاشتر پێنتاگۆن و ئۆفیسی جێگری سەرۆک و ستافی کۆمیتەی ئاسایشی نەتەوەییان بەڕێوەبرد. بەرهەمیش[٧٣] وەک ئەحمەد چەلەبی داوای گۆڕینی ڕژێمی لە ئێراقیدا کرد، بەلام کەس ئەوی وەک چەلەبی بەفریودان تۆمەتبار نەکرد. نە لە ئێراقێ و نە لە ئەمەریکییەکانیش لەوانەی کە پەیوەندیان بە ئێراقێوە هەیە، کەسێک نییە هێندەی ئەو نە لە میدیا دۆستی هەبێ و نە هێندەی ئەویش بەردەوام دیمانەی ڕۆژنامەگەری لەگەڵدا بکرێ. چونکە سەرۆکی وەزیرانی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوو، بەرهەم سەرۆکایەتی گەشەکردنێکی نائاسایی بنیاتنانەوە و فرەوان کردنی ڕاژەکوزاری گشتی کرد کە هەمیشە شانازی پێیانەوە دەکا.

لە کاتێکدا کوردەکان توانییان پشتیوانی ئۆپۆزسیۆنی ئێراقێ لە فیدڕالیزم مسۆگەر بکەن، هێشتا پێویستە لەسەریان بیر لە هەندێ کێشەی پراکتیکی بکەنەوە. دەبێ کوردستان چ دەسەلاتێکی هەبێ و حکومەتی ناوەندیش لە بەغدا چی هەبێ؟ دەبێ دەرامەتی حکومەتی کوردستان لە کوێوەرا بێ؟ دەبێ کێ کۆنترۆڵی پۆلیس و هێزەکانی ئاسایش بکا؟ پرسیارێکی لە هەمووان گرینگتر هەبوو؛ دەبێ کێ خودانی نەفتی کوردستان بێ؟

نموونەی فیدڕاڵەکانی ترم بۆ نێچیرڤان و بەرهەمی شی کردەوە و جەختم لەسەر نموونەی کانەدا کردەوە، چونکە لەوێ هەر هەرێمێک خاوەنی سەرچاوەی سرووشتییەکانی خۆیەتی، بەلام حکومەتی فیدڕاڵی باجی خۆی لە دەرامەتی سالانەی هەر هەرێمێک دەستێنێ. لە ولاتە یەکگرتووەکانیش، ویلایەت و

(٧٣) بەڕێوەبەرایەتی بوش بەچڕی پشتیوانی بەرهەم ساڵحی کرد بۆ ئەوەی پۆستێکی کاریگەر لە بەغدا وەربگرێ. بەرهەم وەک ئەحمەد چەلەبی نەبوو، هەرچی وەزارەت و ئاژانسەکانی سەرۆک بۆش هەبوو هەموویان پشتیوانی بەرهەمیان کرد.

شارەوانییەکان پۆلیس کۆنترۆڵ دەکەن. لە بۆزنیاش، ئەمێریکا دەستووری دایتۆنی بۆیان نووسییەوە و بە پێی دەستوورەکە هەر هەرێمێک سوپای تایبەتی خۆی هەیە. هەردوو سەرۆک وەزیران لێیان خواستم ئەگەر بتوانم لەمیانی بەڕێوەبردنی پرۆسەی نووسینەوەی دەستوور ئامۆژگارییان بکەم و منیش قایل بووم. لە بەیانی ٣٠ نیسان، لە بارەگای فەرمی لە هەولێر لەگەڵ نێچیرڤانی کۆبوومەوە و هانم دا بۆ ئەوەی ئەجێندەی کورد پێشبخا. کە تا بەردەرگای لەگەڵم هات بۆ ئەوەی بەڕێم بکا گوتی: " ئەوپەڕمان دەوێ."

دوای ئەوەی لە ئایاریێ ئێراقم بەجێهێشت، زانیم کە سەرکردەکانی کورد گرفتێکی تێگەیشتنیان لە بواری پلاندانان بۆ ئێراقێکی فیدراڵیدا، هەبوو. ئەوان بیریان لە مەرجەکانی دابەشکردنی دەسەلات لە حکومەتی ناوەندییەوە بۆ دەسەلاتە ناوخۆییەکان دەکردەوە - واتا بەغدا مافەکانیان مسۆگەر دەکا. لە ئاب یادداشتنامەیێکم بۆ بەرهەم و نێچیرڤانم نارد؛ لەوێ جیاوزییەکی نێوان پێشنیارەکانی ئۆتۆنۆمیی پێشتر فێدراڵیزم دەستنیشان کرد:

فیدرالیزم سستمێکی "بنچینەییە bottom up" یەکەی ڕێکخستنی بنەڕەتی وڵات هەرێمە یان ویلایەتە. ویلایەت یان هەرێم جاری یەکەم پێک دێ، ئینجا ئەو هەندێ لە دەسەلاتەکانی خۆی (بەدڵی خۆیشی) بۆ حکومەتی ناوەندی بەجێدێڵێ. فێدراڵیزم جیاوازی لەگەڵ ئۆتۆنۆمیدا هەیە، لە سیستمی ئۆتۆنۆمی حکومەتی ناوەندی هەندێ دەسەلاتی دیاری کراو(کە ئەمیش بە دڵی حکومەت خۆی دەبێ) بۆ هەرێمە لۆکاڵەکان مسۆگەر دەکا. لە سستمی فێدراڵی، بنچینەی دەسەلات لەبەر دەستی یەکەی فێدراڵیدا دەبێ (جا چ ویلایەت بێ یان هەرێم)؛ کەچی لە سستمی ئۆتۆنۆمی هەموو تەواوی دەسەلات لەبەر دەستی حکومەتی ناوەندی کەڵەکە دەبێ. حکومەتی ناوەندی دەسەلاتی ئەوەی نابێ نە باری یاسایی فێدراڵی و نە دەسەلاتەکەشی پووچەڵ بکاتەوە: کەچی دەتوانێ هەموو ڕێکخراوەکانی ئۆتۆنۆمی هەڵوەشێنێتەوە.

نووسیم پێویستە کوردستان لە نووسینەوەی دەستووری خۆی دەستپێشخەری بکا و بەر لە نووسینەوەی دەستووری ئێراقێ ئەو دەستووری خۆی بنووسێتەوە. مکوڕیم لەوە کرد کە دەبێ دەستوورەکە بریتی بێ لە دۆکیومێنتێکی کورت و بە توندیش

سەرجەم مافەکانی مرۆڤی تێدا پارێزراو بێ (چونکە هەم ڕاستییەکە وایە و هەم پەیوەندییەکانی نێوان خەڵکی خۆشتر دەکا) و داواشم کرد کە دەبێ دەستوورەکە دەسەڵاتەکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان بەرانبەر بە حکومەتەکەی بەغدا بە ڕاشکاوی دەستنیشان بکا. سێ بابەتی پۆلیس و نەوت و سوپا بوونە سێ تەوەری سەرەکی ناو دەستوورەکە. کوردستان نابێتە حکوومەتێکی خۆیی تا کۆنترۆڵی دەرامەتی خۆی نەکا، ئەو دەرامەتەش لە ئێراقێ نەوت دەگرێتەوە. بینەوبەردەی ئەوەشم کرد کە دەشێ کوردستان لە کاتێکدا داهاتی نەوتی خۆی لەگەڵ بەشەکانی دیکەی ئێراقێ دابەش بکا، لەو کاتەشدا پێویستە خاوەنی سەرچاوەکانی خۆی بێت و بەخۆیشی بەڕێوەیان ببا. ئەوەی کە پەیوەندیشی بەپۆلیسەوە هەیە، تەنیا ئەوە بەس نییە کە پۆلیسی ناوخۆ کورد بن-خۆ سەددام لە ۱۹۸۰کاندا کوردی باچاکی بۆ بەرژەوەندی خۆی بەکارهێنا-بۆیێ دەبێ حکوومەتی کوردستان پەروەردەیان بکا و بەڕێوەشیان ببا. نووسیم: "پێویستە کۆنترۆڵی تەواو و تەنیاتان لەسەر گشت چالاکییەکانی پۆلیس لە باکووردا هەبێ (واتا نابێ هیچ پۆلیسێک یان هێزێکی ئاسایشی ناوخۆی هیچ هەرێمێکی تری ئێراق لەوێ کار بکا)"

جەختم لەوە کردەوە کە دەبێ دەستووری کوردستان بەڕاشکاوی "دەسەڵاتی دامەزراندن و پاراستن و ڕێکخستن و کۆنترۆڵکردنی هێزێکی بەرگریکردن لە کوردستان" بۆ کوردستان مسۆگەر بکا. زانیم ئەمەیان بەپێچەوانەی نیازەکەی پێنتاگۆن بوو کە دەیویست هێزێکی یەکگرتووی ئێراقی دابمەزرێنێ، بەڵام زانیم کە ئەو بیرۆکەیەی پێنتاگۆن نە ڕاستەقینەیە نە پەسەندیشە. چونکە سوپای ئێراقێ تاکە دوژمنی هەمیشەی کورد بووە و هەرگیز بەرژەوەندی سوپایێکی ئێراقی کە زۆرینەی عارەب بێ و وڵاتە یەکگرتووەکان دروستی بکا، کورد دەستبەرداری پێشمەرگە نابن. لە کۆتاییشدا نووسیم پێویستە دەستووری کوردستان بەڕاشکاوی ئەوەش چارەسەر بکا ئایا لە میانی ناکۆکییەکی دوو لایەنە، کام یاسا-یاسای ئێراقێ یان یاسای کوردستانێ-سەروەر دەبێ: "پێویستە دەستوور بڵێ کە دەستووری کوردستان و ئەو یاسایانەی کە لە دەستوورەوە هەڵدەچنرێن، یاسای باڵای کوردستانن. هەر ناکۆکییەکیش لە نێوان دەستووری کوردستان و دەستووری

ئێراقدا سەرهەڵبدا، دەبێ بەرژەوەندی دەستووری کوردستان بپرێتەوە. "ئەم بیرۆکانە لە کۆتاییدا بوونە بنچینەی ئەو پێشنیارانەی کە کوردستان بۆ دانانی دەستووری ئێراقێ کردی.

هەر کوردێکی ئێراقی کە من دەیناسم، کوردستانێکی سەربەخۆی دەوێ و منیش هاوسۆزی ئەو هەزرەیانم، هەر لەبەر ئەوەشە نامەوێ بەشێک لەو وڵاتە بم، نەکا بەو شێوەیە هەڵسوکەوتم لەگەڵدا بکا کە ئێراق لەگەڵ کوردانی کرد. لەگەڵ ئەمەشدا، بۆچوونی من سەبارەت بەپاشەڕۆژی ئێراقێ بەهۆی هاوسۆزێ و بنەمای ستایەتی نییە. حیکمەت واباوە ئەگەر ئێراق تێکبشکێ، دەبێتە هۆی ناسەقامگیری؛ بۆیێ پێویستە بەهەر نرخێک بێ خۆمان لە لێکترازانی ئێراقێ دوور بخەینەوە ئەگەر تەماشایێکی مێژووی تاریکی هەشتا ساڵەی ئێراقێ بکەین، دەبێ بۆمان ڕوون بێتەوە، ئەو هەوڵانەی کە بۆ بەیەکگرتوویی مانەوەی ئێراقێ دەدرێن هەمیشە ناسەقامگیرییان لێکەوتۆتەوە. هێشتنەوەی ئەو یەکگرتنە بەتۆبزییە تا ئێستا هەر توندوتیژی و سەرکوتکردنێکی بێ کۆتایی و جینۆسایدی پەیدا کردووە. من لەو باوەڕەدانیمە کە تاماوەیێکی دووروودرێژ بتوانی گەلێک کە لە شوێنێکی جیۆگرافی جیاوازدا دەژی، ناچار بکەی بۆ ئەوەی دوور لە ویستی خۆی لە چوارچێوەی وڵاتێکدا بمێنێتەوە. کوردەکانی ئێراقێ هەرگیز بەوە ناڵێن ڕاستە کە بەبەشێکی ئێراقیدا بمێننەوە. لەم باوەڕەدام کە لەم جۆرە بارودۆخەدا، لە بەرژەوەندی هەموو گەلانی ئێراقیدایە ئەگەر بکرێ بەشێنەییەوە جودابکرێنەوە و جودابوونەوەکەشیان دەبێتە هاندەرێکی گەورە بۆسەقامگیربوونی هەموو ناوچەکە. تا هاوینی ۲۰۰۳، بوومە دەنگێکی ڕەخنەگری توند و بەڕاشکاوی ڕەخنەم لەو شێوە خراپە گرت کە بەڕێوەبەرایەتی بارودۆخەکەی لە دوای شەڕی پێ بەڕێوە دەبرد. بیر و بۆچوونم سەبارەت بەئایندەی ئێراقێ، بەتەواوەتی لەگەڵ سیاسەتی وڵاتە یەکگرتووەکان جودا بوو. من وەکو زۆربەی چاودێرە ئەمەریکاییەکان کاروباری ئێراقێ نەبووم؛ بەڕاشکاوی دەربارەی ئەم کێشانە لەگەڵ دۆستە ئێراقییەکانم، بە کوردەکانیشەوە، قسەم دەکرد. هەرچەندە بەهۆی مەرکەزەکەم وەک پرۆفیسۆرێک لە کۆلێژی شەڕی نەتەوەیی National War College، ئازادی ئەکادیمیم مسۆگەر بوو، بەڵام لەو دەمەی

مووچەم لە وەزارەتی بەرگری وەرگرت، نەمویست واتێبگەن کە بەنیاز بووم سیاسەتی وڵاتە یەکگرتووەکان بنکۆڵ دەکەم. جا لە ئۆکتۆبەری ٢٠٠٣، پیشە بیست و چوار ساڵییەکەی خۆمم بۆ حکومەتی وڵاتە یەکگرتووەکان براندەوە و چیتر کارم بۆ حکومەت نەکرد و وەک کەسایەتییەکی گەورە دبلۆمات، پەیوەندیم بەسەنتەری کۆنترۆڵکردنی چەک و پەرت نەبوونییەوە، کرد.

کوردەکان بەچاوی برێمەری تەماشای نووسینەوەی دەستووری کاتی ئێراقیان نەکرد. لەکن برێمەر هەڵێک بوو تا دووبارە ئێراقی پێ دروست بکاتەوە، لەلای کوردەکانیش جۆرە بەرگرییەک بوو لە خۆیانیان دەکرد. ئامانجەکەیان سادە بوو: بەڵگەنامەیێک بێ کەمترین دەسەڵاتیان لێ بسێنێتەوە کوردەکان زانیان تا چەند هێزیان هەبوو: کۆنترۆڵی خاکی خۆیانیان دەکرد و سوپای تایبەتی خۆیانیان هەبوو لەلایەنی سیاسییەوەش، هەموو یەکگرتوو بوون.

سەرکردە کوردەکان لەوە نیگەران نەبوون کە نەتوانن لەگەڵ عارەبە ئێراقییەکان ڕێک نەکەون، بەڵکو لەو فشارە زۆرە نیگەران بوون کە ئەمریکا بۆ سەری دەبردن. کە لە دێسێمبەری ٢٠٠٣ گەڕامەوە کوردستانێ، هەوڵم دا دڵنیایان بکەمەوە. بۆم روون کردنەوە کە کورد چەند پێویستی بەوڵاتە یەکگرتووەکان هەیە، ئەمریکییەکانیش، بەلای کەمیەوە هێندەی ئەوان پێویستیان بەکورد هەیە. داگیرکردنەکە بەخراپی بەڕێوە دەچوو دواترین شتیش ئەگەر بەڕێوەبەرایەتی بوش گەرەکی با، ئەوەبوو ئاژاوە بکەوێتە ئەو ناوچە سەقامگیرەی کە پشتیوانی ئەمریکا بوو، ئەزموونی عالیا ئیزەتبەگۆڤیچی سەرکردەی بۆزنیای سەردەمی شەڕ، وەبیر بارزانی و تاڵەبانی هێناوە و پێمگوتن کە ئەو کابرایە، زۆر لەو پێشنیارانەی ئاشتی ماندەل کرد کە رەنگبوو وڵاتەکەی کەرت بکەن و بەوەش ئەورووپی و ئەمریکییەکانی هەراسان کرد. بەڵام چونکە کۆڵی نەدا، بۆزنیای رزگار کرد و ئیزەتبەگوڤیچیش هیچی لە دەست نەدا چونکە پێی لەسەر ئەوە داگرت کە بەڕاستی دەزانی. پێشم گوتن؛ رەنگە بەڕێوەبەرایەتی بوش پێی خۆش نەبێ کە کورد لەسەر مسۆگەر کردنی مافەکانیان مکوڕ بن، بەڵام ئەگەر وابکەن ڕێزیان لێدەنێ.

سەرکردە کوردەکان داویان لێکردم کە بەکوون و قوژبنەکانی چۆنییەتی

بەڕێوەبردنی دانوستانی دەستووری کاتیدا بچمەوە. منیش ئەوەم شیکردەوە کە؛ ئەگەر من دانوستانم بۆ دەسەڵاتی کاتی هاوپەیمانان بکردایە، دەمویست دەسەڵاتم بەسەر دەقی دەستوورەکەدا هەبێ. لەو دانوستانانەی کە پەیمانی دایتۆنیان لێهاتە کایەوە (من خۆشم بەشداریم تێدا کرد) گەورە دانوستانکاری وڵاتە یەکگرتووەکان، ڕیچەرد س. هۆڵبروک بەوە دەستی پێکرد کە هەموو لایەنەکان بەبنەما گشتییەکان قایل بن. ئینجا هەستا شارەزا ئەمریکییەکانی هێنا بۆ ئەوەی درێژەی بابەتەکان بەو شێوەی کە خۆمان ویستمان، بنووسنەوە. ئێمە بەخۆشمان دەقێکی زمانی ئینگلیسمان نووسییەوە کە قسەی ئێمەی بەسەر قسەی لایەنەکانی سربی و کرواتی و بۆزنی دەخست.

ڕشتیم لە بارزانی و تاڵەبانی کرد کە وتوێژکار بۆ تێکەوڵێکەکەی دەستوور بنێرن و بەخۆیان پشکداری دانوستانەکە نەکەن. بەدەگمەن سەرکردە لە وردەکارییەکانی هەر دەقێک دەگەن و کاتێکیش کە بەخۆیان دادەنیشن، فشاری زۆریان دەکەوێتە سەر، بۆ ئەوەی دەمودەست وەڵام بدەنەوە. هەمیشە لە بەرژەوەندی ئەو لایەنە بووە کە دانوستانکارەکەی بەرانبەرەکەی خۆی دەڵێ:

پێویستیم بەوە هەیە لەو پێشنیازە بچم پرس بەسەرکردەیەکی بڕیاردەر بکەم. ئەم کارە بەلای کەم کاتی ئەوەت پێدەبەخشێ تا بزانی تا بزانی کاردانەوەی بەرانبەرت چ دەبێ و واش دەبێ دەستکەوتێکیشی لێ پەیدا دەبێ. بەپێی ئەو ئەزموونەی کە بەخۆشم هەمە کەم وادەبێ سەرکردە دانوستانکارێکی باش بێ. چونکە هەموو توانای سیاسی خۆیان بۆ ئەوە تەرخان کردووە کە گەلەکانیان شادمان بکەن: ئەمەش بەزۆری مانای ئەوەیە کە دەبێ بڵێ "بەڵێ". دانوستانکاری کارامە دەبێ شانازی بەوەی کە کاتێک دەڵێ "نا"

لە ٢٧ی یەنایری ٢٠٠٤، بارزانی و تاڵەبانی بەتەنیا لەگەڵ برێمەری کۆبوونەوە. برێمەر لاپەڕەیێکی بنەماکانی گشتی فیدراڵیزمی تێدا نووسیبووەوە و پێشکەشی کرد: کوردستان وەک یەکەیێکی فیدراڵی دەناسرێ، بەڵام دەسەڵاتی کەمی دەبێ. حکومەتی ناوەندی بەرپرسی پاراستنی ئاسایش و سەرچاوە سرووشتییەکان و ئابووری و سنوورەکان دەبێ. پێشمەرگە یان هەڵدەوەشێتەوە یانیش دەبێتە بەشێک

له سوپای ئێراقی و دەسەڵاتە یاساییە سەربەخۆییەکەی کوردستانیش نامێنێ. کە برێمەر لە کۆبوونەوەکە دەرکەوت وایزانی کە کورد پێشنیازەکانیان پەسند فەرموو، کە لە دوای چەند رۆژێک لەگەڵ بارزانی بەلاپەرەکەی برێمەر داچوومەوە، بارزانی سەری لەو قسانەی کە کرابوو سوڕما و بەتوندی نکوڵی لەوە کرد کە، رێککەوتنێکی لەم جۆرە کرابێ. پاشان بیستمەوە کە ستافەکەی برێمەری زۆر شادمان بوون و واقیشیان لەوە وڕما بوو کە چۆن سەرەکەیان توانیبووی ئاوا بەئاسانی وا لە کوردەکان بکا کە دەستبەرداری زۆربەی ئۆتۆنۆمییەکەی خۆیان بێن. دەبوو لەمەوە بزانن کە لە یەکتری نەگەیشتبوون.

مەسعود بارزانی داوای لێکردم کە ئەمە لەگەڵ سامی عبدالرحمانی گەورە دانوستانکاری پارتی دیمۆکراتی کوردستان، بەدرێژدادرتر تاوتوێ بکەم. ئەویش بۆ چارەسەری نەخۆشی چووبووە ئەمریکا و تازە هاتبووەوە، لە بەیانی ٣١ یەنایری، کۆپییەکی ئەو بەرواڵەت رێککەوتنەم دا دەستی سامی و مەغزایەکەم بۆی شیکردەوە. سامی پێشنیاری کرد ئەو ئێوارەیە لەسەر نانخواردن بابەتەکە تەتڵە بکەینەوە. ٦ پ. ن. تێبینییەکی بۆ ناردم کە میوانێکی لە دوورەوەرا هاتووە و خواردنەکەشی بۆ رۆژی پاشتر دواخست.

یەکی شوبات جەژنی قوربانێ بوو. لەم رۆژە موسڵمانان کوشتی بۆ ئیبراهیم سەر دەبڕن. سامی عبدالرحمان کە بریکاری سەرەک وەزیرانی حکومەتی هەرێمی کوردستان بوو، چووە بارەگای پارتی دیموکراتی کوردستان تا بۆ جەژنانە پێشوازی لە هاوڵاتیانی بکا. چونکە بۆ جەژنانە دەچوون، ئاسایشی کورد لەو رۆژە خەڵکەکەی نەپشکنی. خۆکوژێک خۆی خزاندە ناو ریزی خەڵکەکەوە و لە پێش ئەو خۆی تەقاندەوە. نزیکەی هەر هەمان دەم، خۆکوژێکی تریش لە بارەگای یەکێتی نیشتیمانی کوردستان لە هەولێر، خۆی تەقاندەوە.

رۆژی دوای تەقینەوەکان سەردانی بارەگای یەکێتی نیشتیمانی کوردستانم کرد. ئەو شوێنەی خۆکوژەکە خۆی لێ تەقاندبووەوە، هەموو رەشداگەرا و سووتا بوو.

دیوارێکی زوورەکەش بەلای دەرەوە بەسەر ئۆتۆمبێلێکدا رووخابوو. ناو ماڵەکە هەموو گۆمە خوێنی سوور و پاک بوو، بریقەیان دەداوە، ئەستەم بوو بەخەیاڵیش

باوەڕ بکەم کە پیاوێک بە تەنیا بتوانێ هێندە تەقەمەنییە لە خۆی باربکا کە ئەم کارەساتە بنێتەوە.

سەرکۆی ۱۰۱ کەس مردن لەوانە سێ وەزیری حکومەتی هەرێمی کوردستان و پارێزگاری هەولێر و بریکاری پارێزگار و سەرۆکی شارەوانی هەولێریان لەگەڵدا شەهیدبوون. ئەو سامیەی کە لە ۱۹۸۰کانەوەڕا دەمناسی، بەخۆو بەو میوانەی کە لە دوورەوەڕا هاتبوو، هەردووکیان کوژران: میوانەکەی کوڕەگەورەکەی بوو کە بزنسمانێکی لەندەنییە لەگەڵ دوو کچی گەنجتری هەموو گیانیان لە دەستدا[٧٤].

لەو خزم خزمانێی و ژنهێنانی نێوان سەرکرایەتی سیاسی کورد، کەسێک نەبوو یان خزمێکی یان دۆستێکی دێرینی لە دەست نەچووبێ. هەڵوێستی توند لە بەرانبەر بەئێراق پەیدابوو. واپێدەچوو ئەگەر لەوە پتر لە بەغدا نزیک ببنەوە، مەترسی ئەو گێرەشێوێنییەی لە ئێراقیدا هەبوو بەو کوردستانە ئارامەی ئێستا بگا. لە ٥ی شوبات بوو لەگەڵ نێچیرڤانی بارزانی چوومە دهۆک و لەوێ بەتێلەفۆن سەرەخۆشیمان لە خانەوادەی سامی کرد و چووین سەرێکیشمان لە گڵکۆیە تازەکەی دا.

لە ڕێگا لەگەڵ نێچیرڤان باسمان کرد دەبێ ئینجا چ بکەین. گوتم: ئەگەر هیچ ڕێککەوتنێک نەبووە واچاکە کورد برێمەری لێ ئاگادار بکاتەوە، چونکە لە بەرژەوەندی هیچ لایەکدا نییە برێمەر سەرچیغ بڕوا، نێچیرڤان قسەکەی پەسند کردم، بەڵام دەیزانی کەسانێک هەبوون لە تووڕەکردنی ئەمریکییان نیگەران بوون، نێچیرڤان پێی گوتم کە کۆبوونەوەیەک بەگرووپی سەرکردایەتی کوردستان دەکا بۆ ئەوەی پێشنیازی خۆیان بۆ برێمەر ئامادە بکەن و داوای لێکردم ئەگەر بتوانم چەند بیرۆکەیێکیان پێببێژم.

خۆشبەختانە برێمەر خۆی پشتی لە پێشنیارەکانی ۲۷ی یەنایر کرد. دوای

(٧٤) هەموو سەرکردە کوردەکان خانەوادەکانی خۆیانیان لە پێناوی کێشەی کوردستان کردۆتە قوربانی، لەو کاتانەی کە سامی پێشمەرگە بوو، جاری وادەبوو بەمانگ و ساڵ لە خێزانەکەی جودا دەبووەوە. تۆزێک دڵدەرەوەیە کە ئێوارەی پێشتری لەگەڵ کوڕەکەی بەسەر برد نەک لە تێکەولێکەی دەستووری لەگەڵ من بەسەری بیا.

سەرخۆشی کردنی لە سەرکردایەتی کورد لە ٦ی شوبات، بریمەر مەسعود بارزانی تیکردەوە و پێی گوت کە ناچار بوو "ڕێککەوتنەکەمان" ڕەوانی کۆشکی سپی بکەم و لەوێ هەندێ گۆڕانکاری لێکراوە.

بۆی ڕاڤە کرد کە کۆشکی سپی دەیەوێ دەستووری کاتی هیچ ئاماژەیێک بۆ حکومەتی هەرێمی کوردستان نەکا، ئەمەش ئەوەی دەگەیاند کە ئێراق هەر ئەو هەژدە پارێزگایە دەماوە کە سەددام حوسێن دیاری کردبوون. ئەمە لەلایەن کوردەوە پەسند نەبوو، هەر لەبەر ئەوەش نەبوو کورد (هەرچەندە دوو حکومەتیشیان هەبوو) کوردستانیان هەر بەیەک قەوارەی یەکگرتوو دەزانی، بەڵکو لەبەر ئەوەش بوو کە سنووری پارێزگایەکانی سەددام حوسێنی لەگەڵ سنووری ئەو پارێزگایانەی کە حکومەتی کوردستان بەڕێوەی دەبردن، یەکیان نەدەگرتەوە. هەروەها کۆشکی سپی دەیویست ئەو بڕگەیەش لە ڕێککەوتنەکەی یەنایر نەهێڵێ کە زمانی کوردی هاوشان لەگەڵ زمانی عارەبی دەکردە زمانێکی فەرمی ئێراقی.

ئەم گۆڕینانەش نموونەیێکی تری ئایدۆلۆژیای دژی ڕاستی و پێچەوانەی ئەقڵ بوون. وایت هاوس خەونی بە ئێراقێکی نائیتنییەوە دەدیت. ویستیان یەکە فیدراڵییەکان لەسەر بنچینەی "جیۆگرافی" بێ – وەک ئەوەی دەبوو پارێزگایە ئێراقییەکان وەک ویلایەتەکانی وڵاتە یەکگرتوەکان بێ هێڵەکانی سەر نەخشەی کۆمەڵگە جیاوازەکان بەدیار بخا. کوردەکان بەر لە هەموو شتێک خۆیان بەکورد دەزانی و هەرگیز وا بیریان نەکردۆتەوە کە دانیشتوانی سێ پارێزگای جیاوازن و سەددام حوسێن سنووری بۆیان کێشاوە. دەستیان لەو کوردستانە خۆشەویستەیان بەر نەدەبوو. کە کۆشکی سپی دەیویست کورد بئاخنتە نێو ئێراقییە نائیتنییەکانەوە، زمانی عارەبیشی بەسەردا دەسەپاندن. پێناچوو هیچ کەس لە کۆشکی سپی بزانێ کە زمانی عارەبیش دەمزاری گروپێکی ئیتنی جیاواز بوو.

ئەو گۆڕانکارییانەی کۆشکی سپی کردبوونی، کوردەکانی ڕاهەژاند. کاتی ئەوەیان بۆ هات کە پێشنیازەکانی خۆیانیان پێشکەش بکەن.

لە ١٠ی شوبات بوو، نێچیرڤان کۆبوونەوەیێکی لە ئەنجومەنی نیشتیمانی کوردستان بەگەورە گەورە سەرکردەکانی یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و پارتی

دیمۆکراتی کوردستان کرد. من درافتێکی "بەشی کوردستان Kurdistan Chapter"م پێشکەش کردن بۆ ئەوەی بیخەنە نێو دەستووری کاتیەوە[٧٥].

ئەو بەشەی من پێشکەشم کرد حکومەتی هەرێمی کوردستانی بەحوکمەتێکی فەرمی ئەو خاکە دەناساند کە تا ١٨ی ئاداری ٢٠٠٣، کورد بەڕێوەیان دەبرد – ڕۆژێک پێش دەسپێکی شەڕەکە بوو، لە چەند بابەتێکی کەمی وەک کاروباری دەرەوە بترازێ، ئەو قانوونەی کە لە ئەنجوومەنی نیشتیمانی کوردستان دەرباز دەبن، یاسای بالای ئەم هەرێمەن و بەسەر یاساکانی حکومەتی هەرێمی فیدڕاڵیدا زاڵن. حکومەتی هەرێمی کوردستان دەتوانێ هێزی چەکداری خۆی پێکبێنێ و ناویشی زێرەڤانی نیشتیمانی کوردستانی ئێراق دەبێ و بەفەرمانی حکومەتی کوردستانیش دەبێ. ئەنجومەنی نیشتیمانی کوردستان دەبێ قایل بێ، پاشان هەر هێزێکی سەربازی ئێراقی دەتوانێ لە کوردستاندا جێگیر بێ و دەشبێ قایل بێ ئەنجا هەر هێزێکی زێرەڤانی نیشتیمانی کوردستانی ئێراقێ دەتوانێ بۆ دەرەوەی هەرێم بچێ.

دەبێ هەرێمی کوردستان خاک و ئاو و کانزای تایبەتی و ئۆیلی خۆی هەبێ. کوردستان کێڵگە نەفتییەکانی خۆی لە ئایندە بەڕێوە دەبا و (دەرامەتەکەشی بۆ خۆی هەڵدەگرێ)، بەلام حکومەتی فیدڕاڵی بەغدا ئەو کێڵگە نەفتیانە بەڕێوە دەبا کە ئێستا لە باری بەرهەمن، چونکە تا ١٨ی ئاداری ٢٠٠٣ هیچ کێڵگەیێکی ئۆیل لەناو کوردستاندا نەبوو، بۆیێ بەگوێرەی ئەو پێشنیارەی کوردستان تەواوی نەوتی خۆی کۆنترۆڵ دەکا، لەگەڵ ئەوەشدا، ئەگەر کەرکووک بووە بەشێکی کوردستان، بەغدا هەر کێڵگە زەبەلاحەکانی نەوتی کەرکووک بەڕێوە دەبا کە ئێستا لە باری بەرهەم هێنان دانە، کوردەکان لەمێژ بوو هەر دەیانگوت ئەوان کە کەرکووکیان گەرەکە، لەبەر نەفتەکەی نییە و پێشنیازەکەشیان بەچاکی ئەمە ڕوون دەکاتەوە.

---

(٧٥) تیمێکی پرۆفیسۆری دەستووری یارمەتی هەرێمی کوردستانیان دا لەوانە: پرۆفیسەر خالید ساڵح لە زانکۆی باشووری دانیمارک؛ پرۆفیسەر برێندەن ئۆلەری لە زانکۆی پێنسنڤێنیا؛ پاشتر پرۆفیسەر کارۆلی. سوڵتان لە زانکۆی مێریلەند هاتە ڕیزێ. کارەکەیان فۆکەسی لەسەر ئەو کێشە دەستوورییانە کرد کە کاری لە کوردستان و لە ئێراقیدا دەکرد و لە چوارچێوەیێکی تیۆری ڕازاوەدا ڕێکخرابوو. من زۆر کەمتر تێکەڵێکەی ئەو کێشانەم کرد کە لێرەدا باس کراوە.

کوردستان پارەی کاش لە حکومەتی فیدراڵی وەردەگرێ. حکومەتی فیدراڵی تەنیا دەتوانێ باج لە کوردستان بستێنێ و ئەمەش بەپێی ڕێککەوتنێک دەبێ کە پاشتر دانوستانی لەگەڵ حکومەتی کوردستان لەسەر دەکرێ. دەستووری هەمیشەیی ئێراقێ ئەوکات لە هەرێمی کوردستانێ پەیڕەو دەکرێ کە زۆرینە دەنگدەرانی کوردستان دەنگیان بۆی دا(٧٦).

کۆسرەت ڕەسووڵ، کە پێشمەرگەیەکی دێرینی یەکێتی نیشتیمانی کوردستانە و لە ١٩٩٤دا دووەم سەرۆک وەزیران بووە، ویستی ئەوە ڕوون بکاتەوە کە بڵاوە پێکردنی زێرەڤانی نیشتیمانی کوردستانی ئێراق، لە دەرەوەی هەرێم، نابێ تەنیا بەسەلماندنی ئەنجومەنی نیشتیمانی کوردستانەوە بەندبێ؛ بەڵکو دەبێ پاش داواکردنی حکومەتی فیدراڵی لە بەغدا ئینجا بڵاوەی پێکردبێ. ئەو هەموارەی کردی ئەوەی ڕوون کردەوە کە کورد تا چ ڕادەیەک دڵەڕاوکێی ئەوەیانە نەکا لەو شەڕانەی کە لەناو ئێراقدا هەیە تێکەڵ ببن. دوای ئەو گۆڕانەی کە کۆسرەت کردی پێشنیازەکە پەسند کرا. سەرۆکی ئەنجوومەنی نیشتیمانی کوردستان، ڕۆژی پاشتر ١١ی شوبات بوو کە ڕۆژ شاوێس وەک خواستێکی ئەنجومەنی نیشتیمانی کوردستان، پێشکەشی دەسەڵاتی کاتی هاوپەیمانانی کرد.

کاردانەی برێمەر زۆر خێرابوو. داوای کرد دەمودەست مەسعود بارزانی ببینێ، بەڵام بەهۆی تۆز و بای بەغداوە سەفەرەکە بیست و چوار سعات دواکەوت و لە کوردستانیش کرێوە بوو. (بارزانی پێی گوت: "بەڕێز برێمەر، ئاخر تەنانەت کەش و هەواشمان لە هی ئەوان جیاوازە") کە گەیشتە کوردستان برێمەر قایل نەبوو تێکەولێکەی پێشنیازەکانی کوردستان بکا و موکوڕ بوو لەسەر ئەوەی کە دەبێ هەموو بچنەوە سەر پێشنیازەکەی ٢٧ی یەنایر. پاش ئەوەی لەگەڵ نێچرڤان بارزانی لە یەکتریان توند کرد، ئینجا برێمەر هاتە بنباری و سەلماندی کە ئەم جۆرە ڕێککەوتنە هەر نەبووە.

لەگەڵ ئەمەشدا، برێمەر زۆربەی ئەوانەی کە خۆی دەیویست، لە یاسای بەڕێوەبردنی کاتیدا بەدەستیهێنان. کوردەکان پێیان لەسەر ئەوە دانەگرت کە

---

(٧٦) تەواوی دەقەکەی لە پاشکۆی ئەم کتێبەدا هەیە.

پێشمەرگە بەفەرمی بناسرێ و ئەو زمانە سادەیەشیان قەبوڵ کرد کە تەواوی کۆنترۆڵی ئاو و نەوتی دەخستە بەردەستی حکومەتی فیدراڵییەوە[77] کوردستان لە قەوارەی ئەو سنوورەی خۆیدا ماوە کە لە ١٩ی ئاداری ٢٠٠٣ هەیبوو و زمانی کوردیش شانبەشانی زمانی عەرەبی بووە زمانێکی فەرمی. یاسای بەڕێوەبردنی کاتیش قانوونێکی کارامەی بۆ چارەسەرکردنی باری کەرکووک دانا: کوردە ڕاگوێزراوەکان دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ زێدی خۆیان و ئەو عارەبانەش کە سەددام حوسێن لە میانی پرۆسەی بەعارەبکردن هاوردیانییە ئەوێ، دەتوانن بگەڕێنەوە بۆ ئەو شوێنە ڕەسەنانەی خۆیان کە لێیەوە هاتوون. سەرژمێرێک دەکرێ، بەڵام دوا بارەکەی بۆ دەستووری هەمیشەیی دواخرا.

کورد هەرگیز ئەو مەرجانەی یاسای بەڕێوەبردنی کاتییان پیادە نەکرد کە خۆیان پێیان خۆش نەبوو. هەرگیز دەستبەرداری سنوورەکانیان لەگەڵ تورکیا و ئێراندا نەبوون و بێ پرسی بەغداش، بەردەوام سەرچاوەکانی نەوتی خۆیان بەرەپێ دا. بێگومان پێشمەرگەشیان هەر هێشتەوە.

دەستی بەنووسینەوەی دەستووری هەمیشەیی خۆی کرد. مەسعود بارزانی[78] دەستپێشخەری کرد و شاندێکی کوردی پێکهێنا بۆ ئەوەی هەڵوێستی ڕەوانیان لە دانوستانەکاندا هەبێ تا هەریەک لەو ئامانجانە بەدی بێن کە لە پێشنیارەکانی ١١ی شوبات و ئەوانی پاشتریشدا باسکرابوون. ئەنجومەنی نیشتیمانی کوردستان، دوای هەڵبژاردنی، لە حوزەیرانی ٢٠٠٥دا کۆبووەوە و یاسایەکی دەرباز کرد؛ بەپێی

---

(٧٧) زمانەکە بەڕاشکاوی بەخودانکردنی سەرچاوەکانی نەوت و ئاوی لێک نەکردبووەوە بواری بەهەردوو حکومەتی کوردستان و ناوەندی دەدا کە بڵێن خاوەنی سەرچاوەکانن. لە دانیشتنێکی درەنگی شەودا، ئەنجومەنی حوکم ملی بۆ ئەو زمانە دانەواند کە کۆنترۆڵی تەواوی سەرچاوە سروشتییەکانی بەکوردستان دەدا. هەرچەندە برێمەر ئامادە بوو بەڵام نە بەخۆیی و نە بەستافەکەشی لە گرنگی زمانەکە نەگەیشتن. ڕۆژی پاشتر برێمەر داوای لە بارزانی و تاڵەبانی کرد کە زمانەکە بگۆڕن و سەیر ئەوە بوو ئەوانیش بەگۆڕینەکە قایل بوون.

(٧٨) تاڵەبانی ببووە سەرۆک کۆماری ئێراق و ئێستا لە پرۆسەی دانانی دەستوورەکەدا، ڕۆڵی بەیەکگەیاندنی هەمووانی لە ئەستۆدا بوو. بێگومان دەستکەوتێکی گەورە بوو بۆ تیمە کوردییەکە، کە کەسایەتییەکی خۆیان لەم پۆستە باڵایەدا هەبێ.

ئەو یاسایە سوپای ئێراقی قەدەغەیە بێتە ناو خاکی کوردستان ئەگەر ئەنجومەن هاتنی ئەو سوپایە نەسەلمێنێ(٧٩)

دەستووری هەمیشەیی ئێراقیش کە لە ڕیفراندۆمی ئۆکتۆبەری ٢٠٠٥دا سەپا، هەرێمی کوردستان بەیەکەم هەرێمی فیدراڵی دەناسێ. دەستوورەکە ڕێگە بەکوردستان و بەهەر هەرێمێکی تریش دەدا لە ئایندە ببێتە فیدراڵی، تا لەشکری خۆی هەبێ و ناوەکەشی زێرەڤانی هەرێم دەبێ. جگە لە چەند شتێکی بچووک کە خراونەتە بن تاکە دەسەڵاتی یاسای حکومەتی فیدراڵەوە، دەستووری کوردستان لە ناوەوەی هەرێم، سالاری دەستووری فیدراڵی ئێراقییەو هەر کاتێکیش ململانێ دەکەوێتە نێوان یاسای فیدراڵی و یاسای هەرێم، ئەوکات یاسای کوردستان بالادەست دەبێ. ئەمە ئەوە دەگەیەنێ لەو کاتەی کە بەشەکانی تری ئێراقی بەرەو حوکمێکی تیۆکراتی ئایینی دەچێ، سیستمی یاسای سێکۆلار و ئەو دەستووری کوردستان کە بەشێوەی ڕۆژئاوایی مافەکانی مرۆڤ دەپارێزێ، هەر بەردەوام دەبێ.

لە سایەی دەستووری هەمیشەییدا، کوردستان خاوەنی خاک و ئاوی خۆیەتی و بەخۆیشی بەڕێوەیان دەبا. هەروەک چۆن کورد لە شوباتی ٢٠٠٤ پێشنیاریان کرد، حکومەتی هەرێمەکان کۆنتڕۆڵی تەواویان بەسەر ئەو کێڵگە نەفتیانەی ناو هەرێمدا دەبێ کە لە ئایندەدا وەبەرهەم دێن و پێشتر هەرگیز بەرهەمی بازرگانییان نەبووە، حکومەتی هەرێمی کوردستان، نەک بەغدا شێوەی یاسایی بۆ چۆنیەتی پەرەپێدانی کێڵگە تازەکانی نەوت دیار دەکا و بڕیاری لێدانی چاڵە تازەکانی نەوت و ڤێستەکردنیشیان دەدا، حکومەتی فیدراڵی هاودەم لەگەڵ حکومەتی ئەو هەرێمانەی کە نەوتیان هەیە، کۆنترۆڵی ئەو کێڵگە نەوتییانە دەکەن کە ئێستا نەوتیان لێ دەردەهێندرێ؛ واتا، کە لە ئایندە کەرکووک گەڕاوە سەر هەرێمی کوردستان، ئەوکات کورد دەنگیان لە بەڕێوەبردنی کێڵگەکانی نەوتی کەرکووکدا دەبێت. سەرباری پێشنیارەکانی شوباتی ٢٠٠٤، ئەم هاوبەشییە بۆ کورد پێشکەوتنێکی بەرچاو بوو،

---

(٧٩) ئەمە وەک بەشێک لە یاسای دامەزراندنی ئۆفیسی سەرۆکی کوردستان بوو؛ بۆ ئەوەش بوو کە دەسەڵاتی سەرۆک سنووردار بکا تا نەتوانێ یەکلایەنە ڕێگەی سوپای ئێراقی بدا داخڵی کوردستانێ ببێ.

چونكە تەنیا ئەو چاڵە نەوتیانەی كە ئێستا بازرگانییان بەنەوتەكانیانەوە دەكرێ، هەر ئەوانی لەژێر دەسەڵاتی حكومەتی فیدراڵی دانا.

لیستی دەسەڵاتەكانی فیدراڵی زۆرە لەوە كورتتر بۆتەوە كە لە یاسای بەڕێوەبردنی كاتیدا هەبوو[٨٠] حكومەتی فیدراڵی دەسەڵاتی تەواوی بەسەر كاروباری دەرەوەدا هەیە، بەڵام هەرێمەكان ئۆفیسی خۆیانیان لەناو باڵیۆزخانەكاندا دەبێ بۆ ئەوەی كاروباری خۆیان بەڕێوە ببەن، حكومەتی فیدراڵی تەنیا بەرپرسە لە سیاسەتی بەرگری، بەڵام هیچ دەسەڵاتێكی بەسەر زێرەڤانی هەرێمەكاندا نابێ و ناشتوانێ سوپا لە هەرێمێك بڵاوە پێبكا ئەگەر هەرێمەكە خۆی ڕەزامەندی لەسەر نەبێ.

حكومەتی فیدراڵی دراو دەردەكا، بەڵام بێ ڕەزامەندی هەرێم دیسان ناتوانێ باجی بەسەردا بسەپێنێ. حكومەتی فیدراڵی كێش و پێوەرەكان ڕێك دەخا، بەم جۆرە دەسەلمێنێ كە درێژی مەترێك لە بەسرە دەبێ وەك درێژی ئەو مەترە بێ كە لە هەولێر هەیە.

ئەگەر بڕیمەر لە ئێراقییەكان بگەڕابا، دەستوورێكی كاتی وایان دەنووسیەوە كە بەتەواوەتی لە یاسای بەڕێوەبردنی كاتی جیاواز دەبوو. زۆر لەگێن بوو كە لە شێوەی دەستووره هەمیشەییەكە با؛ چونكە هەمان ئەو شیعە و كوردانەی كە لە ئەنجومەنی حوكم دانیشتبوون، هەر ئەوان بەخۆشیان یاریزانە سەرەكییەكانی دانوستانی دەستووری دایمیش بوون[٨١] ئەگەر ڕێگە بەخودی ئێراقییەكان خۆیان بدرابا تا لە ٢٠٠٤ تێكەولێكەی دەستوورەكەیان بە خۆیان بكردبا، هێندە دەسەڵاتیان بەحكومەتی ناوەندی نەدەدا كە یاسای بەڕێوەبردنی كاتی پێیدا، بەڵام ڕەنگبوو هەندێك لە ڕێككەوتنەكان بۆ دەستووری هەمیشەیی دوا بخرابا. لە میانی پێشنیارەكانی بۆ بەشی كوردستان، لە یاسای بەڕێوەبەرایەتی كاتی كردنیان، كوردەكان هێزی بەرگری خۆیانیان بەتەواوەتی خستە بنباری وەزارەتی بەرگری

(٨٠) ئەمانە تەنیا ئەوانەن كە یاسای فیدراڵی سەروەری یاسای هەرێمە.

(٨١) عارەبە سوننەكان یان بۆ ئەنجومەنی نیشتیمانی كاتی هەڵنەبژاردرا بوون، یانیش لەلایەنی ئەو پارتانەوە هەڵبژاردرا بوون كە ژمارەی كورسیەكانیان زۆر كەم بوو چونكە عارەبە سوننەكان بۆیكۆتی ئەو هەڵبژاردنانەیان كرد كە بۆ ئەنجومەنی نووسینەوەی دەستوور كرا، بۆیێ نەیانتوانی لە كاتی نووسینەوەی دەستووره هەمیشەییەكە ڕۆڵی خۆیان ببینن.

بەغدا (جێی مەترسییە) و هەندێ دەسەڵاتی باج وەرگرتنیشیان بۆ حکومەتی فیدراڵی لێگەڕا. برێمەر یەکسەر نکۆڵی بیرۆکەی زێرەڤانی کوردستانی ئێراقیێ کرد و هیچ چارەسەرێکی مامناوەندیشی بۆ باجی کوردی پەسند نەکرد. چونکە پێشنیارەکانیان لە کاتی دانانی یاسای بەڕێوەبردنی کاتی هیچی جێبەجێ نەکرا، بۆیە کورد لە کاتی دانوستانی دانانی دەستووری هەمیشەیی ئێراقی هەڵوێستێکی توندتریان وەرگرت و لە هەموو خاڵەکانیشیاندا سەرکەوتن یاوەریان بوو. زێرەڤانی هەرێمیان هەیە کە لەبەر سەرپەرشتی کردنی بەغدا دانییە و حکومەتی ناوەندی ناتوانێ باج لە کوردستان وەربگرێ. لە کۆتاییدا دەستووری هەمیشەیی کوردستانی سەربەخۆیی کوردستانی کردە بابەتێکی موئەسسەساتی، برێمەر بەهەموو توانای خۆی ویستی خۆی لەم بابەتە دوور بخاتەوە. ئەو هەڵسوکەوتەی کە برێمەر لەگەڵ کێشەی کوردا کردی، وای لە بزووتنەوەی سەربەخۆی کوردستان کرد زۆر ڕشتتر لە پێشان قۆڵی خۆی بۆ گەیشتنی بەئامانجەکانی هەڵبکا، لە یەنایری ٢٠٠٤، هاوپەیمانییەتێکی ڕێکخراوە نامیرییەکانی کوردستان بزووتنەوەی ڕیفراندۆمیان داهێنا و ئامانجیان ئەوە بوو کە ڕێگە بەکوردستان بدەن دەنگ بۆ ئایندە خۆی بدا. لە ماوەی سێ هەفتەدا، بزووتنەوەکە ١,٧٠٠,٠٠٠ واژووی کۆکردەوە کە داوایان دەکرد دەنگ لەسەر سەربەخۆبوون بدرێ، ئەو ژمارە زۆرەی واژووەکان ئەوە دەگەیەنێ کە ژمارەی دانیشتوانە ئادەڵتەکانی کوردستان لە دەورووبەری

٢,٣٠٠ کەس بوون. لە شوباتی ٢٠٠٤، ڕێکخەرانی هەڵمەتە هاتنە بەغدا تا خواستەکەیان پێشکەشی برێمەر بکەن؛ چونکە گەورەترین دەسەڵاتی ئێراقیێ بوو. نە بەخۆی نە بەهیچ کام لە گەورە بەرپرسانی دەسەڵاتی کاتی هاوپەیمانان ویستیان داخوازییەکەیان لێ وەربگرن، یان لەگەڵ سەرانی بزووتنەوەکە کۆببنەوە. پاش ئەوەی سندووقە پڕ لە داخوازییەکانی خۆیان بەمیدیا نیشان دا، ڕێکخەرانی بزووتنەوەکە، چونکە کەس گوێی لێ ڕانەگرتبوون، بەتووڕەییەوە بۆ کوردستان هاتنەوە، کە بینیشیان یاسای بەڕێوەبردنی کاتی چەند دەسەڵاتی لە کوردستان سەندبووەوە، هێشتا تووڕەتریش بوون.

لە سێپتێمبەری ٢٠٠٤ بوو کە ڕێکخەرانی بزووتنەوەی ڕیفراندۆم داوایان لێکردم لە هۆتێلە تازەکەی شیراتۆن لەگەڵیاندا کۆببمەوە[٨٢]، لەگەڵ فڕکردنی قاوەی تورکی،

باسی ئەوەمان تاوتوێ کرد چۆن بزووتنەوەکانی دیکەی سەربەخۆیی کێشەکانی خۆیانیان پێشخستووە. بەبیرم هاتەوە کە بەلایەنی کەم یەک بزووتنەوەی سەربەخۆیی ڕیفراندۆمێکی نافەرمی لە هەمان ڕۆژی هەڵبژاردنەکان، ناوەندی دەنگدانی نافەرمییان لە نزیکی ناوەندە فەرمییەکان ڕێکخست. سەرکردەکانی ڕیفراندۆم ئەو قسەیان بەدڵ بوو، بەلام گومانی ئەوەیان هەبوو کە دەسەلاتدارانی کوردستان ڕێگەیان پێ بدەن ئەوانیش وابکەن. بۆم ڕاڤەکردن کە لە سستەمی دیمۆکراسیدا، دەسەلات ناتوانێ ئەم شێوە ڕادەربڕینە یاساغ بکا، ئەگەر ڕێکخەرانی چالاکییەکە دەست لە دەنگدانە فەرمییەکەدا نەکەن.

قسەکانی خۆمانمان بۆ نێچیرڤان بارزانی و کەریم سنجاریی وەزیری ناوخۆی هەرێم و بەرپرسی پاراستنی ئاسایشی هەڵبژاردنەکە، گێڕاوە. هەردووکیان یەک هەڵوێستیان هەبوو؛ کە ئەمە مافێکی دیمۆکراتی بزووتنەوەی ڕیفراندۆم بوو کە هەڵبژاردنەکەی ٢٠٠٥ کرا، سندووقەکانی ڕیفراندۆم لە دەرەوەی ناوەندەکانی دەنگدان هەبوون، یان هەندێکیان هەر لە ناوەوەی ناوەندەکان بوون، دوو ملیۆن کورد لەو ڕیفراندۆمە دەنگیان دا و ٩٨ لە سەدای سەربەخۆیی هەڵبژارد[٨٣].

دەرئەنجامەکەی سەرکردەکانی کورد عارەبەکانی ئێراقی هۆشیار کردەوە کە دەنگدەرانی کوردستان هەر دەستوورێک ڕەت دەکەنەوە ئەگەر جەخت لە دووبارە ئاخنینەوەی هەرێمەکە بۆ ئێراقێ بکا.

ئارەزووی سەربەخۆبوونی کوردستان بەبەردەوامی سێبەر لەسەر هەموو لایەنەکانی پەیوەندییان لەگەڵ ئێراقدا دەکا. لە ڕیفراندۆمەکە، کورد بەدەنگێکی بەرزەوە داوای جودابوونەوەیان لە ئێراقێ کرد و دەستووری هەمیشەیی ئێراقیش لە گەیشتن بەو ئامانجەی نزیکتر کردنەوە.

---

(٨٢) هۆتێلەکە لەگەڵ زنجیری هۆتێلەکانی شیراتۆن نەبەستراوەتەوە، بەلام شیراتۆن لە ئێراقێ واتای پایەداری دەبەخشێ. لێرە زۆر جاران بەهۆتێلە باشەکان دەڵێن شیراتۆن.

(٨٣) پەڕی دەنگدانەکە دەیپرسی: ئایا پێویستە کوردستان بەشێک بێ لە ئێراق، یان پێویستە سەربەخۆ بێ؟ ئالایێکی ئێراقێ لە تەک هەڵبژاردنی ئێراقێ و پەرچەمی کوردستانیش لە تەنیشت بژاردەی سەربەخۆییدا بوو.

# بەشی ٩

## شەڕی ناوخۆ

لە ١٨ی نیسانی ٢٠٠٣ بوو، لەبەغداوەڕا بۆ کەربەلا بەئۆتۆمۆبیل سەفەرێکم کرد، کەربەلا و نەجەف دوو پیرۆزترین شاری موسوڵمانە شیعەکانن. لە٦٨٠ بوو کە خەلیفەی بەنی ئومەییە چوار هەزار پیاوی نارد بۆ ئەوەی حوسێنی کوڕی عەلی، نەوەی پێغەمبەری بگرن. بەخۆو بەژمارەیێکی کەمی هەواڵانی لەکەربەلا کەوتنە نێو داوەوە، بەڵام حوسێن خۆی بەدەستەوە نەدا هێزەکانی لەگەڵیدا بوون، بەزین و کەللەی حوسێنیش بۆ خەلیفە یەزید بۆ دیمەشق ڕەوان کرا

هەزارو سێسەد ساڵە شیعەکان بۆ شەهیدکردنی حوسێنی دەگرین. لەو ڕۆژەی نیسانێ، زایران لە هەموو لایێکەوەڕا ڕوویان لەو شارە کردبوو، شانۆی شەقامەکانیان پڕ کردبوو، هەندێکیان بەپێی خاوسی هاتبوون، بەیداخو پۆرترێتی حوسێنیان بەرز کردبووەوە. ناوەناوەپێرۆیەکەڕادەگیراو پیاوەکان بازنەیان پێک دێناو سرووتیان دەخوێند. حوسێن، حوسێن؛ ئێمە هەرگیز حوسێن لەبیر ناکەین.˚ لەدڵسۆزی خۆیان بەزنجیران لەپشتی خۆیانیان دەدا.

سەددام حوسێن لەو هاوسۆزییە ئاینییەی زایرە شیعەکان دەترساو بیست و نۆ ساڵ بوو لێی قەدەغە کردبوون. چەند مایلێک پێش کەربەلا، کەمێک لەگەڵ زایرەکان بەڕێدا ڕۆیشتم. هەرچەندە داگیرکردنەکەی ئەمەریکا ڕێی زیارەتەکەی بۆ ئازاد کردبوون، بەڵام هەستم کرد کە کەس سوپاسگوزار نەبوو. بەڵکو هەستم کرد کە لەناو ئەو کڵپەو سۆزە ئاینییەدا بەتوندی هەستیان بەوە دەکرد وەک ئەوەی کە مافێک بووبێو بەدەست و بازووی خۆیان بەدەستیان هێنابێ. دونیا گۆڕاو پاش سێ سەد ساڵ ئێستا بۆ یەکەم جارە شیعە لە ئێراقێ دەسەڵات وەردەگرن. یەک لە زایرەکان گوتارێکی بۆ خوێندمەوە کە چەند جار گوێم لێ ببوو: کابرایەکە پێی گوتم:

"ئینجا ئەمێریکییەکان دەزانن ئێمە زۆرینەی دانیشتوانین.

عارەبە سوننەکان ئەگەر هەمووشیان نەبن، بەشێکی دیاریان بەو تەرتیبە تازەیەی ئێراقێ وایل نەبوون. هەر چەندە ژمارەیێکی زۆری عارەبی سوننەڕقیان لەڕژیمە کۆنەکە دەبووەوەو بەلادانی سەددامی گوشاد بوون، بەڵام هێشتا هەر نەیاندەویست ئێراق تەسلیمی دەستی شیعەکان بکرێ، بەتایبەتیش نەیاندەویست پارتە شیعییە ئایینی و هاوپەیمانە ئێرانییەکانیان باڵادەست بن. یاخیبوونی عارەبە سوننە ئێراقییەکان لەدژی داگیرکاری ئەمێریکییەکان دەستی پێ کرد، بەڵام پاشان بووە شەڕێک لەدژی شیعەکان.

کە ئێراقییەکان پتر لەیەکتری ترازان، شیعەکان ناسنامەی خۆیان ئاشکراتر کردو پتریش پابەندی یاسا دینییەکانیان بوون. لە هەڵبژاردنەکانی ٢٠٠٥ ئیئتیلافی یەکگرتووی ئێراقیی شیعەکان لەنێوان ٧٥ تا ٨٠ لەسەدای سەرجەم دەنگی شیعەکانی بردەوە. لە هەڵبژاردنەکانی یەنایری ٢٠٠٥یش، موریدەکانی موقتەدا سەدر پەیوەندییان بەئیئتیلافی یەکگرتووی ئێراقییەوە کردو ئەحمەد چەلەبیشی لێ دەرچوو بۆ ئەوەی لیستی کۆنگرەی نیشتمانی ئێراقی بەتەنیا دابەزێنێ و بەمەش لیستی ئیئتیلاف فرەتر بەرەو ئایینی داگرت. ئەم لستە دینییەی ئیئتیلافی یەکگرتووی ئێراقی پتر لە٨٠ لە سەدای سەرجەم دەنگی شیعەکانی بەدەستهێنا.

لەو کاتەی کە شیعەکان لایەنی سیاسی خۆیانیان بەئایینەوە بەستاوە، سوننەکانیشیان لەخۆیان دوور کردەوە. ڕادیۆو تەلەفزیۆنی دەوڵەت پتر بەرنامە ئایینییەکانی شیعەکان پەخش دەکا. مەلا شیعەکان زۆرتر دەردەکەون و ئەو بانگەی شیعەکان دەدرێ و کە نەختێک لەبانگی سوننەکان جیاوازی هەیە. پشووە دینییەکانی شیعەکان بوونەتە پشووی فەرمی لە وڵات. لەو کاتەی کە ئێراق لە یاسای شارستانییەوە بەرەو حکومی یاسای تیۆکراتی دەچێ، فیقەی شیعەی تایبەت بەمیرات و فرەژنی و زیغە (ژنهێنانی کاتی) پیادە دەکرێن، یان بەلای کەمی تێکەولێکە دەکرێن. تەنانەت ئەو عارەبە سوننانەی کە خۆیان لە لەدەستدانی دەسەڵاتەکەیان ڕاهێنابوو، چاویان بەرایی نەدا کە ئێراق ببێتە دەوڵەتێکی شیعە مەزەب. ئەگەر ڕژیمی تازەی ئێراقێ سێکۆلار بایە، یان هەموو سیمایەکانی وڵاتێکی

عارەبی با، ڕەنگبوو زۆر لەعارەبە سوننەکان بەوە قایل بن کە وەک کەمینەیێکی ئایینی لەو وڵاتەدا بژین. ئەگەر ئەو سستمە تازە بیەوێ عارەبە سوننەکان بکاتە هاوڵاتی پلە دوو، هیچیان بەو سستمە ناڵێن باشە.

لەخۆشکردنی ئاگری نێوان سوننەو شیعەکان، ئێران ڕۆڵی سەرەکی گێڕاوە. شیعە ئێراقییەکان کۆماری ئیسلامی بەدۆست و ناوەندی دینداری و نموونەی دەوڵەتێکی بە هێزی شیعە دادەنێن. دوو دەیە بوو ئێران سەرکردە شیعەکانی دەپاراست و سازی دەدان. لە١٩٨٢و لە تارانێ، ڕژێمی خومەینی پشتیوانی لە دامەزراندنی گەورەترین پارتی شیعەکانی ئێراقێ کرد، کە ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی لەئێراقێ بوو. تاران ڕێکخراوی بەدری دامەزراندو مەشقی پێ کردو وا پێدەچێ کە تا ئێستاش هەر پارەی پێ دەدا. سەرانی حیزبی دەعوەش لەئێرانێ داڵدە دران و پشتیوانیشیان کراو هەندێ لە بەرپرسانی ئێرانی پەیوەندی نزیکیان لەگەڵ مەلای شۆڕشگێڕ موقتەدا سەدر هەیە. لەماوەی زۆربەی ئەو ساڵانەدا، واشنتن گاڵتەی بەشیعەکان دەکردو وەزارەتی دەرەوەش کۆنترین پارتی سیاسییانی کە حزبی دەعوەیە، لەناو لیستی ناوی تێرۆریزم دانابوو. ئێران پەیوەندی باشی لەگەڵ شیعە سێکولارەکانیش هەیە، ئەحمەد چەلەبیش یەکێکە لەو عیلمانییانە. کاریگەرترین کەسایەتی سیاسی شیعەی ئێراقێ کابرایێکی ئێرانییە. ئایەتوڵڵا عەلی سیستانی نکوڵی لە وەرگرتنی ڕەگەزنامەی ئێراقی کرد و گوتی: "من بەئێرانی هاتوومەتە دونیاو هەر بەئێرانیش دەمرم[٨٤]"

---

(٨٤) بەو ئاواتەی کە شیعە ئێراقییەکان بەرهەڵستی ئێرانێ بکەن، پلانسازانی شەڕ لە بەڕێوەبەرایەتی هەموو ئەو پەیوەندییانەیان پشتگوێ خست. لە بری ئەوە مشتومڕی ئەوەیان بوو کە شیعەکانی ئێراقێ عارەبن. وەک ئەوەی ئەم ڕاستییە بە زگماک پرۆگرامیان بکا بۆ ئەوەی لە دژی ئێرانێ بن، ئاوا تێیگەیشتبوون. ئاماژەشیان بەوەدا کە چۆن عارەبە شیعەکان لە میانی شەڕە هەشت ساڵییەکەدا زۆر بە دڵسۆزی بۆ ئێراقێ، لە دژی ئێرانێ شەڕێکی بێ وچانیان کرد. ئەوەشیان بەبایەخەوە هەڵنەگرت کە زۆرینەی شیعەکان لە پلە نزمەکانی ڕیزەکانی لەشکرو زۆرینەی عارەبە سوننەکانیش گەورە ئەفسەرەکانی سوپا بوون. هەر سەربازێکیش هاریکاری ئێرانیی بکردایە بە خۆی و بە خاووخێزانییەوە لەبن دەهێندرا سەربازەکان دەیانویست بژین. لەگەڵ ئەم هەموو توندی و تیژییەی کە لە دژیان دەکرا، هێشتا ناوە ناوە سەربازە شیعەکان یاخی دەبوون و خۆیان دەگەیاندە ئێرانێ.

عارەبە سوننە ئێراقییەکان بەشێوەیێکی تەواو جیاواز تەماشای ئێرانێ دەکەن، ئێران دوژمنی دیرۆکی ئێراقەو ئێستا هەڕەشەی لەناوبردنی ناسنامەی عارەبی ئێراقێ دەکا. زۆر لە عارەبە سوننەکان شیعەکانی ئێراقێ بەکۆڵەمی (تابووری) پێنجەم دادەنێن و دەڵێن ئەوان سیاسییانە ئێرانیان سەرخست و ئێراقیان ناچار کرد ئەو شەڕە دژوارە هەشت ساڵییە بکا تا سەرکەوتنەکەی مسۆگەر نەبێ. کە عارەبە سوننەکان چاویان بەشیعەکان کەوت پەیکەری ئەفسەرەکانی شەڕی ئێران و ئێراقێ دەشکێنن و لەکۆڕو کۆبوونەوەکانیان وێنەی خومەینی بەرز دەکەنەوە، بەجارێک گەیشتنە ئەو باوڕە کە شیعەکانی ئێراقێ دڵسۆز نینەو دڵەلایان بۆ ئێراقێ نییە.

هیچ جۆرە متمانەیێک لەنێوان عارەبە شیعەو عارەبە سوننەکانی ئێراقێدا نەماوە. لە۱۹۲۰کان، شیعەکان بینییان چۆن عارەبە سوننەکان دڵسۆزی داگیرکەرە بریتانییەکان بوون. کە عارەبە شیعەکان بۆیکۆتی بەڕێوەبەرایەتی داگیرکەریان کرد، عارەبە سوننەکان هەلەکەیان هەڵقۆستەوەو کورسی حوکمڕانی خۆیانیان جێگیر کردو دەستیان بەسەر هەموو ئێراقێ داگرت و دەسەڵاتدارییەکەیان تا ۲۰۰۳ی خایاند. لە۱۹۹۱ بوو، شیعەکان دیتیان چۆن عارەبە سوننەکان هەموو کەوتنە دوای سەددام حوسێن و یاخییە شیعەکانیش ژیانی خۆیانیان بۆ ڕووخاندنی دکتاتۆر لەسەر دەستی خۆیان دانا.

***

هەموو بنەماکانی شەڕی ناوخۆ لە ئێراقێ، لە۲۰۰۳دا هەبوو: عارەبە شیعەکان لە دەرکردنیان لەو پۆستە گرینگانەی کە بەدەستیانەوە بوو، نیگەران بوون و ترسی ئایندەشیان گەیشتێ؛ شیعەکانیش مکوڕ بوون لەسەر ئەوەی کە ئێراق بەپێی یاسای خۆیان حوکم بکەن؛ سوننەکان لەو باوەڕەدانە کە شیعەکان خاینن و تەنیا بڕیاری ئەوەشیان نەداوە ئەو ئێراقە بڕووخێنن عارەبەسوننەکان دروستیان کردووە بەڵکو دەیانەوێ وڵاتەکەتە سلیمی دەستی دڕترین دوژمنیان بکەن؛ شیعە لەو باوەڕەدانە کە عارەبە سوننەکان خۆیان کردبووەداردەستی سەددام حوسێن و دیسان بێڕەحمانە، دەست بەکوشتنی شیعەکان دەکەنەوە ئەگەر هەڵیان بۆ بڕەخسێ و دووبارە دەسەڵات وەربگرنەوە.

وەک هەموو شەڕێکی ناوخۆ، ناکرێ ڕۆژی دەستپێکی شەڕەکە بەچاکی دیار بکرێ. ٢٩ی ئابی ٢٠٠٣، یەکێک لەو ئەگەرانە بوو. لەو ڕۆژە فۆربایفۆرێک بەپێچەوانەی شەقامە یەک ڕێیەکەی شاری نەجەف لێی خوڕی و چوو تا گەیشتە بەر دەرگەی مزگەوتی ئیمامی عەلی و لەوەدەمی کەئایەتوڵڵا محمد باقر الحکیم لەمزگەوت دەردەچوو، جیبەکەتەقییەوە. الحکیمی سەرۆکی گەورەترین پارتی سیاسی شیعی کە ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی لە ئێراقییە، هەپروون بەهەپروون بوو. نۆهەت و چوار کەسی تریش لەگەڵیدا مردن. ٢ی ئاداری ٢٠٠٤یش، ئەگەرێکی تری دەسپێکی شەڕەکەیە. شیعەکان لە یەکەم عاشوورای پاش ڕووخانی سەددامی گەلەکۆی چوونە کەربەلایان کردبوو. لەعاشوورا بوو ئیمام کوژرا. لەنزیک گڵکۆی ئیمام حوسێنی خۆکوژێک خۆی تەقاندەوە. یەکسەر لەدوای ئەویشەوەچەند تەقینەوەیێکی تریش ڕوویان دا لە هەمان کات و لە نزیک مزگەوتی کازیمییەش یەکێکی دیکە خۆی تەقاندەوە. ئەمیشیان پیرۆزترین مزگەوتی شیعەکانە لە بەغدا. لەئەنجامی ئەم تەقینەوانەدا بەلای کەم ١٨٠ کەس کوژران.

تا ناوەڕاستی ٢٠٠٤، گومان لەوەدا نەما کەئەو هەموو ئۆتۆمۆبیل تەقاندنەوەو کوشتنی ئەو هەموو شیعانە شەڕێکی ناوەخۆ بوو: لەحوزەیران ٣٧ کەس لەمزگەوتێکی نزیکی حیللە کوژران و لە تەممووزیش ٧٠ی دیکە لە بەغدا لەڕیزوەستابوون بۆ ئەوەی کارێکیان دەست بکەوێ، گیانیان لەدەست دا، لەئابیش ٤٥ زایر لە کوفە بوونە قوربانی و لەئۆکتۆبەریش ٥٢ سەرباز لەکاتی پشوودانیان لەناو چوون. لە٢٠٠٥، پەلامارەکان پترو کوشندەتر بوون. ئامبیولانسێکی بەمینچێندراو یازدە شیعەی لە ئاهەنگێکی ژن گواستنەوەدا کوشتن. لەحیللەش ئۆتۆمۆبیلێکی پڕ تەقەمەنی لەنزیکی ئەو خەڵکانەدا تەقییەوە کە بۆ وەرگرتنی پسوولەی تەندروستی گرد ببوونەوەو ١٢٥ کەسی لێ کوشتن. لە نەینەواش، خۆکوژێک لەناو پرسەیێکدا خۆی تەقاندەوەو ٥٠ی کوشتن. لەبازاڕی ناوەندی موسەیەبیش تانکەرێکی بەنزینی تەقییەوەو ٩٨ شیعەی کوشت. لە بەلەد ئۆتۆمۆبیلێک تەقییەوەو ٩٩ی لەناودا. لە نزیک مزگەوتی کازمییەش ڤانێک تەقییەوەو ١١١ کرێکاری ڕۆژانەی کوشت، زۆر بەیان شیعە بوون. لە١٧ی ئاب، لەماڵی بریکاری سەرۆک وەزیران لە قەراخی ڕووباری دەجلە لەگرین زۆون، بیستم کە لەماوەی بیست

خولەکدا سێ بۆمب لەوبەری ڕووباری دجلە تەقینەوە. یەک لەبۆمبەکان لەنزیکی تیرمناڵی ئۆتۆمۆبیلەکانی بۆ ناوچەی شیعەکانی باشوور دەچن، تەقییەوە، دووەم لەو دەمەدا تەقییەوە کەتیمە فریاگوزارییەکان گەیشتنە ئەوێ و سێیەمەکەش لەنزیکی ئەو نەخۆشخانەیەدا تەقییەوە کە بریندارەکانی بۆ چوو. چل و سێ کەس کوژران.

بکوژترین تاقە تەقینەوەی ئەو شەڕە ناوخۆییە، لە٣١ی ئابی ٢٠٠٥دا ڕووی دا، کە ساڵیادی مردنی ئیمامی حەوتەم، مووسای کازم، بوو. عارەبە سوننە یاخییەکان مووشەکیان لەنزیکی گڵکۆی کازم لەبەغدا، گرت و گەڕەلاوژەیێکی لەناو موسوڵمانان پەیدا کرد کە هەموو بۆ قورتارکردنی ڕۆحی خۆیان ڕوویان لەپردی ئەئیمە کرد. لەسەر پردەکە گەیشتنە ئاپۆڕەی ئەو هەموو شیعەیەی کە بۆ زیارەتی گۆڕەکە دەهاتن. پاگێندەی ئەوەش کرا کە خۆکوژێک وا لەناو خەڵکەکەو لەسەر پردەکەدایە. لەوانەی لەترسان خۆیان فجووڕی نێو ڕووبارەکە کردو ئەوانەی بەبن دەست و پێیان کەوتن سەرکۆی ٩٦٥ کەس گیانیان لەدەست دا

لەوەڵامی ئەو هەموو پەلامارانەدا، مەلا شیعەکان داوایان لە خەڵکەکەی خۆیان کرد کە دان بەخۆیاندا بگرن. بەڵام کاربەدەستە شیعەو میلیشیایەکان بەئاشکرا وەڵامیان دانەوە. پۆلیس، یان ئەو میلیشیایانەی کە بەرگی پۆلیسیان دەپۆشی نازاندرێ کامە کامەیە- هەزاران عارەبی سوننەیان هەڵبژاردو زۆربەیان تەرمەکانیان شێوێندرابوو ئینجا لەسەر گوفەک و لە شوێنی چۆل و لەلێواری ڕێگاکاندا فڕێدرابوون. تیمەکانی مردن پەلاماری گومانلێکراوەیاخییەکان و یاریدەدەرەکانیان دا و دەستیان لە مەلایە عارەبە سوننەکانیش نەپاراست. تۆڵە کردنەو میەکێک لە هۆیەکانی کوشتن بوو. ئەوانەی دەکوژران ئەندامەکانی حیزبی بەعس و کۆنە کارمەندانی ئەمن و موخابەرات و ئەفسەرانی سوپا بوون، لەوانەی کە گومانیان لێ دەکرا لە١٩٩١ هاوبەشیان لە سەرکوتکردنی ڕاپەڕین کردبێ. لە٢٠٠٥، گۆتەی ئەوە دەکرا کەئیجنتە ئێرانییەکان لەگەڵ میلیشیا شیعەکان کاریان دەکرد بۆ ئەوەی هەموو ئەو فڕۆکەوانە ئێراقییانە بکوژن کە لەکاتی شەڕی ئێران ئێراقێ ئێرانیان بۆردومان کردبوو. جەلال تاڵەبانی ئەو ڕاپۆرتانەی بەڕاپۆرتی متمانەدار ناساندو پێشنیاری ئەوەی کرد کە فڕۆکەوانەکان، بەوانەی کەکوردیان بەبۆمبی کیمیاویش بۆردومان کردبوو، لەکوردستان جێ بکاتەوە. لەدوای تەقاندنەوەی گڵکۆی عەسکەری لە سامەڕا لە

شوباتی ٢٠٠٦، تیمە بکوژەکانی شیعە توندتر پەلاماری ئەو عارەبەسوننانە دەدەن کە یان لەگەڕەکەکانی شیعەنشین یان لەگەڕەکەهاوبەشەکاندا دەژین و ئەو عارەبە سوننە ئاساییانەش کە بەبازگەکانی پۆلیس و میلیشیا شیعەکاندا تێدەپەڕن لەدەستیان ڕزگار نابن.

لە١٣ نۆڤیمبەری ٢٠٠٥ بوو کاتێک کە سەربازە ئەمێریکییەکان بەدوای کوڕێکی سێزدە ساڵیدا دەگەڕان کە بزر ببوو، لە نەکاو زیندانێکی نهێنییان دۆزیەوە کە وەزارەتی ناوخۆی ئێراقێ بەڕێوەی دەبرد. ١٦٩ عارەبی سوننەیان لەو زیندانەدا دۆزیەوە کە خەریک بوون لەبرسان دەمردن و هەندێکیان جێی ئەشکەنجەدانیان بەجەستەکانیانەوە دیار بوو. عارەبە سوننەکان ئەو زیندانە نهێنییەیان کردە بابەتێک و لەمیانی پاگێندەی هەڵبژاردن بۆ بەرژەوەندی خۆیان بەکاریان بردو وەزیری ناوخۆ بەیان جەبریشیان بەپینەکاری ئەشکەنجەدان لەکەدار کرد. بەر لەوەی ببێتە وەزیر بەیان جەبر سەرۆکی فەیلەقی بەدر بوو. کە بووە وەزیریش بەهەموو توانای خۆی هەوڵی ئەوەی دا کە پیاوانی بەدر بکاتەپۆلیس و دەزگایەکانی تری ئاسایشیان لەبەر دەست دابنێ. کەم عارەبی سوننە هەیە کە پۆلیس بەدەزگایێکی نیشتمانی بناسن. گۆڕینی کەسەکانی هەرە گەورەی دەسەڵاتی وەزارەتی ناوخۆ، وەک ئەوەی باڵیۆزی وڵاتە یەککگرتووەکان لە ئێراقێ، زاڵمای خەلیلزاد خواستی، هیچ لە بابەتەکە ناگۆڕێ و ئەو ڕاستییەش ئاوەژوو ناکات کە وەزارەتەکە بەپۆلیسی نیشتمانیشیەوە وەزارەتێکە پەیڕەوی مەزهەبگەری دەکا لەکاتێکدا کە عارەبە سوننەکان وا هەست دەکەن کە کاربەدەستەکانیان تێرۆریستن، ناچنە ڕیزی دەسەڵاتدارانی حکومەتی ناوەندی بۆ ئەوەی لەدژی یاخییەکان و تێرۆریستان، شەڕ بکەن.

شەڕی ناوخۆ لەو شوێنانەی ئێراقیدا هەیە کە هەر سێ ڕەگەزەکانی تێدا بەتێکەڵاوی دەژین: پارێزگای بابلی باشووری بەغدا، لەوێ عارەبە سوننەکان ڕێ لەو عارەبە شیعانە دەگرن کە بۆ سەردانی شارە پیرۆزەکانیان دەچن؛ لە پارێزگای دیالا لە ڕۆژهەڵاتی بەغداش، دانیشتوانەکەی عارەبی شیعە و عارەبی سوننەو کوردن؛ نەینەواش کە پێشتر شەڕ و پێکدادان لەنێوان عارەبی سوننە و عارەبی شیعە و هەروەها لەنێوان عارەبی سوننە لە دژی کوردان لە شاری میسل، ڕووی دا؛ لە کەرکووکیش تێکەڵەیێکی ئاوێتەی عارەبی سوننەو عارەبی شیعەو تورکمان و کوردو

دیانی فەڵەی تێدایە؛ دوا شاریش، بەغدای پایتەختەو پێنج ملیۆن هاوڵاتی لە هەموو ڕەگەزەکانی تێدا دەژی و بۆتە قزگەی شەڕی ناوخۆ. ژمارەی کوژراوان بەشێوەیێکی ڕوون و ئاشکرا جیاوازی نێوان ئەو شوێنانەی کە دانیشتوانەکانیان تەنیا یەک ڕەگەزن لەگەڵ ئەو شوێنانەی کە فرەڕەگەزن لێک دەکاتەوە. پارێزگای دهۆک لە باکوور، کوردستانێکی خاوێنە. لە۲۰۰۳ڕا تا کۆتایی ۲۰۰۵، بەپێی ئەو نمرانەی کەڕێکخراوی ژماردنی تەرمە ئێراقییەکان ڕای گەیاندووە، تەنیا سێ هاوڵاتی و یەک پۆلیس لەتوندی و تیژی پەیوەست بەشەڕەوە مردوونە[٨٥].

لە بەغدا ژماردنی تەرمە ئێراقییەکان ۱٤,٨٢٩ سەڤیل و ٤٥٣ پۆلیسی کوژراوی ژماردووە. بێگومان نمرەی ڕاستەقینەی کوژراوەکان لەوە پترە. تەنیا لە تەمموزی ۲۰۰۵، مردووخانەکانی بەغدا پتر لە هەزار تەرمیان وەرگرتووە کە زۆربەیان لە ئەنجامی ململانێی ڕێبازگەری کوژرابوون. ژمارەی ئەو تەرمانە قوربانیانی ئۆتۆمۆبیلە مێنڕێژکراو و خۆکوژەکانی تێدا نییە. چونکە ئەوانە هۆی کوژرانیان دیارەو خزم و کەسیان یەکسەر دەیانبەنەوەو دەیانشارنەوە.

بەشێوەیێکی ئاسایی، شەڕی سیڤیل گورزی گەورەتر لە کەمینەکان دەداو لە ئێراقیش ئەو ڕاستییە بەرجەستە بووە. میلیشیا شیعەکان ملیان لەبەر ملی

---

(٨٥) ئەو نمرانەی کە ڕێکخراوی سەرژمێری تەرمە ئیراقییەکان ئاشکرای دەکا، هەموو ئەو مردووانە دەگرێتەوە کە لە یەکەم ڕۆژی داگیرکردنەوە لە ۱۹ ئاداری ۲۰۰۳ تا ۱۹ نیسانی ۲۰۰۳دا کوژراون و هەموو ئەوانەش دەگرێتەوە کە لە ئەنجامی کردەوە سەربازییەکان و ململانێی سیڤیلی گیانیان لەدەست داوە. زۆرینەی زۆری ژمارەی کوژراوەکان لە دوای ڕۆژی ۱ی ئایاری ۲۰۰۳وە کوژراون، کە سەرۆک بوش کۆتایی شەڕی ڕاگەیاند. کوژراوەکان بە زۆری لە ئەنجامی کردەوەی ئێراقییەکان لە دژی یەکتری دەیکەن و لەو پەلامارانەشدا کوژراون کە تیرۆریستە بیانییەکان دەیکەن. نمرەکانی لەبەر دەستی ڕێکخراوەکەیە ئەوە ڕوون دەکەنەوە کە ژمارەی کوژراوەکانی باشوور زۆر لە هی کوردستان زۆرترە. بەڵام ڕەنگە ئەوە بەزۆری ئەو نمرانە نیشان بدا کە لە شەڕەکانی ئادارو نیسانی ۲۰۰٤ کوژراون. بە زۆریشیان لە نزیکی بەسرەو ناسرییە لەناو چوون. پاشان زۆربەی کوژراوەکانی باشوور لە ئەنجامی ئەو هێرشانە مردن کە بۆسەر زایرەکانی نەجەف و کەربەلاو شەڕی نێوان هاوپەیمانان و سوپای مەهدی و لە نیسان و ئایاری ۲۰۰٤و هەندێ کوشتنی بە نیازەوەی عارەبە سوننەکان لە بەسرە، لەناو چوون. سەیری ماڵپەڕی ڕێکخراوەکە بکە: www.iraqbodycount.net

سوننەکانی بەسرە ناو هەندێ لە سەرکردەکانی کۆمەڵەکەیان کوشتن کە چەند پرۆفیسۆرێکی زانکۆشیان لەناودا بوو[٨٦].

لە بەغداش، ئەو شیعانەی لە گەڕەکە سوننییەکان دەژیان و ئەو سوننانەی لە گەڕەکە شیعەکان دەژیان، هەڕەشەیان لێدەکرێ و پەلامار دەدرێن و دەکوژرێن. لەو ترسە، زۆران ئەو گەڕەکانەیان بەجێ هێشتووەو چوونە لەو گەڕەکانەدا دەژین کە هی مەزهەبەکەی خۆیانە و یان هەر لە بەغدا باریان کردووە. بەتەنیا لەچوار مانگی یەکەمی ٢٠٠٦؛ ١٠٠ سوننەو شیعە لەو گەڕەکانە باریان کردووە کە گرووپەکەی بەرانبەریان زۆرینە پێکدێنن. ئەم پاکسازییەڕێبازگەرییە بۆ ئەوانەی بە ژن تێکەڵاویان لەگەڵ مەزهەبی بەرانبەر هەیە کارەساتی لێ کەوتۆتەوە، ئەو کارەساتەش بە زۆری خێزانە سێکۆلارە ئیلیتەکانی بەغدای گرتۆتەوە.

ڕاستە ئێراق لە هەردوو لایەنی ڕەگەزی و ئایینییەوە وڵاتێکی تێکەڵاوە، بەڵام هەرگیز هیچ لایەنێکی تێدا نەتواوەتەوە: کورد لە کوردستان دەژین[٨٧] و شیعەکانیش لە باشوور نیشتەجێن. تەنانەت لەشارە تێکەڵاوەکانی وەکو بەغدا، شیعە و سوننە و کورد، هەر گرووپێک پێی باش بووە لەگەڕەکی تایبەتی خۆیاندا بژین. ئێستاش بەهۆی شەڕی ناوخۆ، ئێراق لەجاران کەمتر تێکەڵاوە.

هەرگیز وڵاتە یەکگرتووەکان سیخوڕی باشی لە نێوان عارەبی سوننەدا نەبووەو ئەمەش شەڕەکەی ئاڵۆزتر کردووە. گەورە کاربەدەستان لە نەزانییان، بەردەوام لە مەترسی یاخیبووەکانیان کەم دەکردەوە. بەڕێوەبەرایەتی بوش دان بەوەدادەنێ کە ناتوانێ چارەسەری بکا. لەسەرەتادا کە یاخیبوون سەری هەڵدا، وەزیر ڕەمسفیلد

(٨٦) پێدەچوو هەندێ لەوانە لە تۆڵەی ئەوە کوژرابن کە زۆر لە ڕژێمی سەددامەوە نزیک بووبن.

(٨٧) هەندێ لە توێژەوانان دەڵێن کە ناکرێ کوردستان لە ئێراقێ جودا ببێتەوە، چونکە یەک ملیۆن کورد لە بەغدا دەژین. بەڵام هەڵبژاردنەکانی ٢٠٠٥، بە ڕاشکاوی بەدیاری خست کە ئێراقییەکان بە زەقی دەنگیان بە ناسنامەکانی خۆیان دا. هاوپەیمانی کوردستان تەنیا ١ لەسەدی دەنگەکانی بەغدای وەرگرت و ئەمەش ئەوە بەدیار دەخا کە ژمارەی دانیشتوانی کورد لە بەغدا تەنیا ٥٠,٠٠٠ کەسە. هەندێک مکوڕن لە سەر ئەوەی کە زۆرینەی کوردەکانی بەغدا فەیلی (شیعە) نە. ئەگەر واش بن، دەرچوو کە ئەوان ناسنامەی خۆیان بە کوردە نیشتمان پەروەرەکانەوە نابەستنەوە، بەڵکو خۆیان بە پارتە ئایینییە شیعەکانەوە هەڵپەساردووە.

چەتەکانی کەم کردەوەو گوتی چەند: "کەسێکی پاشماوەی ڕژێمی پێشوون؛ کە پەلەقاژەی مەرگیانە. سەرۆک بوش خۆیشی لە۲ی تەمموزی ۲۰۰۳، گرەوی لەگەڵ چەتەکان کردو پێی گوتن: "چەندانێک هەن وا هەست دەکەن کە دەتوانن پەلاماری ئێمە بدەن. پێیان دەڵێم ئەوە مەیدان لە پێشتانە.

لەشەڕدا، هەڵەیێکی کوشندەیە ئەگەر دوژمنت بەکەم بزانی. چونکە سەرۆک بوش بۆ بەرەنگاربوونەوەی یاخیبووان پلانێکی دەمودەستی نەبوو، بۆیێ هەرگیز فەرمانی نەدا کارێکی وا بکرێ نەهێڵن بەئاسانی چەک و تەقەمەنی بە بەردەستی یاخیبووان بکەوێ. پاشان بەدیار کەوت کە یاخیبووان هاتنە"مەیدان و لە پاش مل لەبەر ملنانی سەرۆک، دوو هەزار ئەمێریکییان کوشت. بەڕێوەبەرایەتیش لەوە پەندی وەرنەگرت کە لەسەرەتاوە بەربەستی یاخیبووانی نەدا. لە۳۱ی ئایاری ۲۰۰۵، جێگری سەرۆک دک چێنی لەCNN مزگێنی لیری کنگی داو پێی گوت: "بەبۆچوونی من، ڕادەی ئەو چالاکییەی ئێستا لەبەر چاوە تا ڕادەیێکی دیار کەم دەبێتەوە. وا بزانم یاخیبووان خەریکن هاوزینگ دەدەن.

یاخیبوون پاش ماوەیێکی کورت لەدوای ڕووخانی ڕژێمی سەددامی خۆی تەیار دا. کە سەرانی ڕژێمی پێشوو بەغدایان بەجێ هێشت، یانیش خۆیان لەناو دانیشتوانەکەی شاردەوە، سەدان ملیۆن دۆلاری وڵاتە یەکگرتووەکانیان لەگەڵ خۆیان برد. لەناوەڕاستی نیسانی ۲۰۰۳، سوپای ئەمێریکی ٦۰۰ملیۆن دۆلاریان لەناو کوڵانەیێک لەباخێکی نزیکی ماڵەکەی عودەی سەددام حوسێنی دۆزییەوە[۸۸].

کە سەددام حوسێنیش گیرا ۷٥۰,۰۰۰ دۆلاری کاشی لەکن بوو. بۆیێ ڕەوایە

---

(۸۸) ڕۆژی پێشتر تیمە تێلیڤزیۆنییەکەی ABC کە منی لەگەڵدا بوو، ماڵی عودەیان فیلم کرد. کامێرامان و دەنگمانەکە چوونە سەر بانی، بۆ ئەوەی بتوانن وێنەی باشتر بگرن. تێبینییان کرد کە دەرگەی کوڵانەکە بە کەرپووچ گیرا بوو، بەڵام هیچیان لە بارەیەوە بەخەیاڵدا نەهات. ڕۆژی پاشتر کابتنێکی سوپای وڵاتە یەکگرتووەکان فەرمانی بە سەربازەکانی دا تا هەندێ لە لق و پۆپە نەوییەکانی ئەو درەختانە ببڕن کە شۆڕ ببوونەوەو ڕێیەکەیان گرتبوو. هەر بۆ ئەوەی بزانن چ لەوێ هەبوو، هەستان دیوارەکەیان ڕوخاندو تالانەکەیان دۆزییەوە. دەستەی کاری ئێمە سەریان سوڕما کە گوێیان لە هەواڵەکە بوو، ڕەنگە هەر لەبەر ئەوەش بووبێ کە ئەو هەواڵە گرینگەمان لەدەست چوو.

ئەگەر هزر بکەین کە کاشێکی زۆرو ئەو هەموو زێڕەش کە بەر لەشەڕ، ڕژێم ڕەوانی هەندەرانی کرد، وڵاتە یەکگرتووەکان نەیدۆزییەوە.

ڕەنگە ئەو کردەوە سەربازییانەی کە وڵاتە یەکگرتووەکان کردی، سوننەکانی هێشتا پتر هان دا بۆ ئەوەی بەرهەڵستی بکەن. لە٢٣ی نیسانی ٢٠٠٢، بۆمبایەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان بەماڵی گەورەی هۆزی دلێم لە الرمادی کەوت و بیست و دوو لە ئەندامانی خێزانەکەی کوشت. ڕاپۆرتێکی هەواڵگری باسی ئەوەی کردبوو گەورە بەرپرسێکی ئێراقیّ، کە ڕەنگە سەددام بووبیّ، لەو ماڵەدا دابوو. ڕاپۆرتەکە درۆ بوو، بەڵام وڵاتە یەکگرتووەکان دوژمنێکی دەسەڵاتداری بۆ خۆی لەو ناوەدا پەیدا کرد. لە٢٨ی نیسانی ٢٠٠٣ش، سەربازانی ئەمێریکی لە فەللوجە، ئاپۆڕەی خۆپیشاندانێکی خەڵکیان گوللەباران کردو لەئەنجامدا سێزدە کەسیان کوشت، هەندێکیان هەر منداڵ بوون. ڕاپۆرتەکان ڕایانگەیاند کە ڕەنگە کەسێک لەناو خۆپیشاندەرەکانەوەڕا تەقەی لە ئەمێریکییەکان کردبیّ. ئەگەر وابووبیّ، کابرای کە تەقەی کردووە، ڕاستو دروست ویستوویەتی ئەمێریکییەکان بەتەقە وەڵامی بەرانبەر بدەنەوە. ئەم ڕووداوە بووە هۆی ئەوەی کە فەللوجە ببێتە خاکی یاخیبووەکان و لەویّ سەنگەر بگرن. ئەو ئاژاوەیەی لەناوچەی عارەبە سوننەکان رووی دا، هەلێکی زێرینی بۆ تێرۆریست و جیهادییە بیانییەکان ڕەخساند تا شەڕی وڵاتە یەکگرتووەکان بکەن. القاعدە خۆی گەیاندە ناو ئێراقیّ و جیّ پێیّ خۆی لیّ کردەوەو هاوپەیمانی پەیدا کردو کەسانێکیش دروست بوون کە هەڵسوکەوتی القاعدەیان دەست پێکرد. خوێنڕێژی ئوردنی ئەبو موسعەب زەرقاوی القاعدة في بلاد الرافدینی دامەزراندو بەرپرسیارێتی خۆی لە کوشندەترین بۆردومان و کوشتن ڕاگەیاندو یەک لە کاسێتەکانی ڤیدیۆی نیشانی دا چۆن سەری بارمتە ڕۆژئاواییەکانی پەل دا. تێرۆریستە بیانی و توندڕۆیە لۆکاڵەکان پێدەچیّ وەک بەعسییەکان دەرامەتی چاکیان لەبەر دەستدا هەبیّ.

چۆن بەڕێوەبەرایەتی بوش پلانێکی بۆ بەرینگاربوونەوەی چەتەکاری نەبوو، بەهەمان شێوەش پلانی بۆ پاراستنی کۆگای چەکەکانی ئێراقیّ نەبوو. زۆر لەو کۆگانە چەند مانگ لە دوای داگیرکردنی ئێراقیّ، هێشتا هەر بیّ پاسەوان

مابوونەوە. یاخییەکان هەرچەندی بۆیان کرا چەک و تەقەمەنی و تۆپ و گوللە تۆپیان بۆ خۆیان شاردەوە. کەرستەی تەقەمەنییە پەرمپێدراوەکانی improvised explosive devices کە بەزۆری بۆمبی ڕۆخی ڕێگانە، بوومتە کاریگەرترین چەک لە دژی ئەمێریکییەکان بەکار دێ. چەتەکان قەوانی تۆپی ئەوپەڕ بەتوانایان پەرە پێ داوەو کردوویانە بۆمبێکی پێشکەوتوو کەدەتوانێ گرانترین زرێپۆشی سەربازی ئەمێریکی کون بکا. تا کۆتایی ٢٠٠٥، ئەو سەربازانەی بەکەرستەی تەقەمەنییە پەرمپێدراوەکان کوژران، ژمارەیان لەوانە زۆرترە کە گوللەیان لەبەر هەر هۆیێکی تر گیانیان لەدەست دابێ.

بەعسە ئێراقی و عارەبە سوننە ئیسلامییەکان هەردووک یەک دوژمنیان هەیە- ئەوانیش ئەمێریکی و شیعەکانن بەڵام ئەو دوو لایەنە ئامانجەکانیان زۆر لە یەکتری جیاوازن. بەعسییەکان گەرمکیانە یان سستەمە کۆنەکە بگەڕێننەوە، یانیش تۆزێک جیاوازی تێدا بکەن ئینجا بیهێننەوە. ئەوەی ئیسلامییەکانیشن؛ دەیانەوێ دەوڵەتێکی ئیسلامی ڕادیکاڵی دروست بکەن تاڵەبانی ئەفغانستان یەک لە نموونەکانیانە- لەلایێکی تریشەوە ئێراقێ وەکو بەشێک لە خەباتێکی بەرفرەتری دواڕۆژ دەبینن کە بۆ دامەزراندنی جیهانێکی ئیسلامی بەڕێوەیە. حیزبی بەعس حیزبی نەتەوەپەرستی عارەبییەو لەڕەگ و ڕیشە هەر سێکولار بووە[٨٩]. ئیسلامییەکان بەعسییەکان بەئیلیتی گەندەڵ لە قەڵەم دەدەن. خێڵەکانی وەک عەشیرەتی دلێم، ڕەنگە بۆ ماوەیێکی کورت هەوڵ بدەن تۆڵە بکەنەوە، بەڵام لەماوەی دوورخایەن نەبەعسییەکانیان دەوێ و نەئیسلامییەکان داڵدە دەدەن. هەموو عارەبە سوننە چەتەکان دەیانەوێ ئەمێریکا بڕوا و هۆی خواستەکەشیان ڕوون و ئاشکرایە. چونکە ئەمێریکییەکان ئەو بیانییە داگیرکەرانەن ئەو سستەمەیان ڕووخاند کە دەستی نازی بەسەری عارەبی سوننەدا دەهێنا و ئەمانەش دیان و جوولەکەنە لەنێو خاکی موسوڵمانانن.

یاخییە بەعسییەکان و باڵەکانی القاعدەش، شیعەکان بەترسناکترین دوژمن

---

(٨٩) وەک پێشتر باس کرا، حیزبی بەعس کابرایێکی دیان دروستی کرد کە ناوەکەی میشێل عەفلەق بوو.

دەناسن. بەعسییەکان و سەرانی القاعدە دەزانن کەزوو بێ یان درەنگ ئەمریکییەکان هەر دەڕۆن. شیعەکانیش لەلای خۆیانەوە مکوڕن لەسەر ئەوەی کە حکوم بگێڕن. سەلەفییەکانیش کە قوتابخانەیێکی توندڕۆی سوننەیە و لەخراپەکاریدا جێدەستی زۆر دیارە، شیعەکان بە لە دین هەڵگەڕاو دادەنێن. سەلەفییەکان، شیعە بەڕافیزی ناو دەبەن و بە کافریان دەزانن. جا گەر وابن، ئەوا ئیسلام نینە و دەشێ ژیان و دارابیشیان بەپاتار ببردرێ[٩٠]. بەعسییەکانیش لەلای خۆیانەوەرا، شیعەکان بە دوژمنی بیری نەتەوەپەرستی عارەبی دەزانن (نەتەوەپەرستی ڕاستەقینەی عارەبی سوننە)و لەبەر پەیوەندییان لەگەڵ ئێرانێ و هاریکاری کردنیشیان لەگەڵ ئەمریکییەکان، بەخاینیشیان لەقەڵەم دەدەن. شەڕی سیڤیلی سوننەو شیعە لە بەرژەوەندی هەردوو باڵی چەتەکان دایە. لەلای ئەندامانی القاعدە، کوشتنی مورتەد ئەرکێکی ئایینییەو هەنگاوێکی پێویستیشە بۆ ئەوەی دەوڵەتێکی ئیسلامی پوخت و پاک دروست بکەن.

لەکن بەعسییەکان شەڕی سیڤیل ستراتیژێکە تا دەسەڵاتی پێ وەربگرنەوە. بۆیێش شەڕی سیڤیل تیرتر دەکەن تا ئەو حکومەتە برووخێنن کە شیعەکان بەڕێوەی دەبەن و هانی ئەمریکییەکانیش دەدەن تا لەوڵات پاشەکشە بکەن. ئەگەر ئێرانییەکانیش ئاشکراتر لایەنی شیعەکان بگرن، بەعسییەکان ئومێد دەکەن بتوانن یارمەتی لە وڵاتانی عارەبی لە سەرەتادا بەنهێنی بەدەست بێنن، چونکە ڕەنگە ئەو وڵاتەعارەبییانە گەڕاندنەوەی بەعسییەکان لەباڵادەستی ئێرانییان لەناو شیعەکان بەپەسندتر بزانن. گێرەشێوێنی هەلی بەگەڕخستنەوەی کۆنە سوپای ئێراقێ فرەتر دەکا، بۆ ئەوەی کودەتایێکی سەربازی بکا، یان تێکەوڵێکەی تەرتیبێکی دیکەی سیاسی بکا.

---

(٩٠) توندڕۆیەکان مافی ئەوەش بەخۆیان دەدەن کە هەر موسوڵمانێک کافر بکەن ئەگەر بادە بنۆشێ یان تەواوی ڕێنمایەکانی ئیسلام ڕانەپەڕێنێ. ئەمەش ئەو کردەوانەی وەک کوشتنی ئەو هەموو موسوڵمانە سوننانەی کە لە زەماوەندێک، لە ٩ی نۆڤێمبەری ٢٠٠٥، لە عەممانی پایتەختی ئوردندا کوژران، بە کارێکی شەرعی دەزانێ. زۆربەی زانا ئایینییەکانی سوننە ئەوە ڕەت دەکەنەوە کە هەر کەسێک هەستێ و بتوانێ فەتوای بەکافر کردنی موسوڵمانانی تر دەربکاو لەو باوەڕەدانە کە ئەمە کارێکە تەنیا خودا دەتوانێ بڕیاری لەسەر بدا.

کورد لەسەر لێواری شەڕی ناوخۆی شیعەو سوننەکانی ئێراقینە. بەمەبەستی ڕێگە لەتیرۆریستان بگرن، ئاسایش بەتوندی لەکوردستان پەیرەو دەکرێ. لە دەروازەی هەموو شارو شارۆچکەیێکی کوردستان و گەلێ جاریش لەسەر ڕێیەسەرەکییەکانی ناوەوەی هەرێم و لەسەر سنووری لەگەڵ عارەبەکانی ئێراقێ، پێشمەرگە بازگەی داناوە. ئەو ئۆتۆمۆبیلانەی ڕانەندەی عارەب لێیان دەخوڕن بەجۆرێک هێندەتوند دەپشکندرێن، کەوای لەعارەبەکان کردووە بڵێن ئێمە لە کوردستان بەخێر ناهێندرێین، لە ڕاستیشدا ئەو قسەیەڕاستە. ئەو پەیرەوەکردنەی ئاسایش پاراستن، کاری تیرۆریستی لە کوردستان ئەستەم کردووە بەڵام بەتەواوەتی نەیگەیاندۆتە ئەو ئاستەی کە مەحاڵ بێ چەتەکان بگەنە کوردستان و کردەی تیرۆریستی لێ ئەنجام بدەن. شایانە بگوترێ کە دانیشتوانی هەرێمەکە ئەوپەڕ دڵەلای حکومەتی هەرێمی کوردستان و پشتیوانی پارتەسیاسییەکان دەکەن. هەرکەسێک گومانی لێ بکرێ، هەموو چاودێری دەکەن. لە تەقینەوە خۆکوژەکانی ١ی شوباتی ٢٠٠٤ بترازێ کوردستان لەو جۆرە تەقینەوە تۆقێنەرانە دوورە کە ڕۆژانە لە ئێراقی عارەبیدا ڕوودەدا

میسل سێیەم گەورەترین شاری ئێراقییەو ئەو شارەیە کە زۆرترین ژمارە ئەفسەری بەسوپای پێشووی ئێراقێ داوە، یەکێکە لەو شارانەی کە کوردو عارەبی لێ بەشەڕ هاتوون. ڕووباری دەجلە شارەکەی کردۆتە دوو بەش، کەناری ڕۆژئاوای ڕووبارەکە هەموو عارەب و کەناری خۆرهەڵاتیشی زۆرینەی کوردی تێدا دەژی. لەکاتی دامەزراندنی ئەنجومەنی پارێزگاکەو شارەکەش، لەدوای شەڕی، مێجەر ژەنراڵی ئەمێریکی دێیڤد پێتراوس دانیشتووە عارەبەکانی بەپێش کورد خست. (ئەمێریکییەکان چونکە دەیانویست بەردەوام دڵی دوژمنەکانیان ڕابگرن، بۆیێ دۆستی زۆریان لەدەستە خۆیان دا.) لەنۆڤێمبەری ٢٠٠٤ بوو؛ لەگەڵ یەکەم هێرشە ڕێک و پێکەکەی چەتەکان کردیان زۆربەی ناوچەکانی شاری میسلیان داگیر کرد؛ ئەو بەڕێوەبەرەی پۆلیسەی کە ئەو دایمەزراندبوو، بەخۆی و بەزۆربەی پۆلیسەکانیشی، بنکەکانی خۆیانیان یان چۆڵ کرد، یانیش پەیوەندییان بەچەتەکانەوەکرد. ئەم ڕووداوەش گومان ناهێڵێ کە ئەمەی گوتم ڕاستە.

بەپێچەوانەی ئەمەشەوە، پۆلیسە کوردەکان بەرگرییان لە بنکەکانی پۆلیسی خۆیان کرد. کە ئەمێریکییەکان کۆنترۆڵیان لەسەر شارەکەدا نەما، بانگی پێشمەرگەیان کردو بەمەش باری ناو شارەکەیان گرژتر کرد.

لەباکووری میسل، پێشمەرگەکانی پارتی دیمۆکراتی کوردستان، بەردەوام یارمەتی ئەو کوردانە دەدەن کە حکومەتە عارەبییە ئێراقییەکان لە گوندەکانی خۆیانیان ڕاگوێزابوون، تا بتوانن بگەڕێنەوە زێدی خۆیان[٩١].

ئەمەش عارەبە سوننەکانی تەیار کردو هەندێ لەو کەمینە فەڵەو شیعەو تورکمانەکانیشی هەراسان کردووە؛ چونکەئەو کردەوەیەبەرفراوەنکردنی کوردستان دادەنێن. لەبەر ئەم هۆیانەیە کە بارودۆخی شاری میسل و دەوروبەری تا ئەویەڕ گرژە.

لەمێژە بەکەرکووک دەڵێن بۆمبێکی تەوقیتکراوی ڕەگەزە جیاوازەکانی ئێراقییەو لەماوەی ئەو سێ ساڵەی دوای سەددامیش، هەر ئەوە نییە کە بارودۆخی شارەکە توندە، بەڵکو هەر ئەوەتە نەتەقیتەوە. لەمێژە کورد دەڵێن کەرکووک بەشێکی کوردستانە. هەرچەندە کەرکووک لە١٩٩٢، لەبن دەستی ڕژێمی سەددامی بوو، بەڵام لەدەستوورەکەی ئەو ساڵی کوردستاندا هاتووە کە کەرکووک پایتەختی کوردستانە. مەسعود بارزانی و جەلال تاڵەبانی کەرکووکیان بە"دڵی کوردستان"و "قودسی کوردستان" پێناسە کردووە. ئەگەر کەرکووک بخرێتە سەر کوردستان، دەبێتە ناشیرینترین بەشی ئەو کوردستانە. ئەو هەموو ساڵانەی لەبن دەستی سەددامی بوو ئەو شارە هێندە پشتگوێ خرابوو کە وەک گوفەکی لێ هاتووە. ڕووباری خاسە کە بەناویدا تێدەپەڕێ وەک شێرەی ئاوی ناو ماڵانەو ژینگەی شارەکەش پیسە. لە١٩٩٠کاندا، سەددام ئەو خانووە سەدان ساڵ کۆنەکانی سەر قەڵاتی شارەکەی ڕووخاندن: پڕی ڕێچکۆڵەی جوان و خانووی ڕزی بوو. هەندێک لەخانووەکان کۆڵەگەی هاوشێوەی ئەوانی ڕۆمانەکان بوو کە سەدان ساڵ تەمەنیان بوو. کەهەندێ

---

(٩١) عارەب و تورکمان و ئاشوورییەکانیش ڕکابەری کورد لەوە دەکەن کە دەڵێن ئەو گوندانە هەمیشە هەر هی کوردان بووینە. زۆربەی دانیشتوانی ناوچەکە ڕۆژێک لە ڕۆژان ئاشووری و کلدانییە دیانەکان بووینەو هەندێ لەو گوندانەی کە ئێستا کورد داوایان دەکەنەوە زەمانێک بووە هەموو فەڵە بووینە.

لەپێشمەرگەکان دوای ئازادکردنی چاویان بەشارەکە کەوت، پرسیاریان کرد: "ئەو هەموو ساڵەیە بۆ ئەمە خەباتمان کردووە؟"

هەندی لەو هۆیانەی کە ژینگەی کەرکووکی پیس کردووە، ئەو دەرامەتەیە کە هەیتی. کەرکووک کەوتۆتەسەر یەکێک لەگەورەترین کێڵگەکانی ئۆیڵی هەموو دونیا. ئەو کێڵگەنەوتانەلە ۱۹۳۰یەکانەوەبەرهەمیان هەیەو ئێستاش بەلای کەم ۱۰ بلیۆن بەرمیل نەوتی دۆزراوەی تێدا هەیە[٩٢]. لەو دەمەی کە ڕژیمە یەک لەدوای یەکەکانی ئێراقێ، بەڕژیمی سەددامیشتەوە، دەیانویست

جۆرە دەسەڵاتێکی ئۆتۆنۆمی بەکورد بدەن، هیچ کام لە حکومەتە عارەبییە ئێراقییەکان نەیانویستووە کەرکووک بەکورد بدەن، چونکە لەوە دەترسان کە ئۆیل بنەمایێکی ئابووری بۆ دەوڵەتێکی سەربەخۆ دادەمەزرێنێ. تورکیاش بەهەمان شێوە پەیڕەوی لەگەڵ کورد کرد، تا لە۲۰۰۳دا، گەیشتە ئەو ڕادەیەی هەڕەشەی دەست تێوەردانی سەربازی کرد بۆ ئەوەی کەرکووک لەدەرەوەی کوردستان بهێڵێتەوە.

جگە لە کورد، کەرکووک تورکمان (ئەوانە بەڕەگەز تورکن و پاشماوەی دەوڵەتی عوسمانینەلەوێ ماونەتەوە)و عارەبی سوننەو کلدانی و ئاشوریشی تێدا دەژی. بەر لە ۱۹٤۸، جوولەکەشی تێدا دەژین. گوندەکانی لای ڕۆژهەڵات و باکووری شارەکە هەموو کوردن یان کورد بوون، عارەبەکانیش دەشتی حەویجەی ڕۆژئاوای کەرکووکیان گرتووە. لێرەو لەوێش گوندو شارۆچکەی تورکمانان بەپرت و بڵاوی هەنە. هەر لە۱۹۳۰یەوەرا، حکومەتی ئێراقێ لای عارەبەکانی گرتووەو جیاوازی لەدژی کورد کردووەو کاری داوەتەعارەب بۆ ئەوەی لەبواری نەوتدا کار بکەن و ڕێی لە ئیشکردنی کوردان گرتووە[٩٣].

---

(٩٢) مشتومڕێک دەربارەی قەوارەی ئەو نەوتەی کە هێشتا تێیدا ماوە لە گۆڕێ هەیە. هەندێ لە شارەزایان دەڵێن کە کۆگەکەی زیانی زۆری بەرکەوتووە لەبەر ئەوەی لە سەردەمی سەددامیدا زۆر بە خراپی بەکار هێندراوە. بەتایبەتی لە دوای سزاکانی لە ۱۹۹۰ سەپانە سەر ڕژێم هێشتا خراپتر بەکار هاتووە.

(٩٣) لە ۲۰۰۳، کۆمپانیای نەوتی باکوور کە کێڵگەی نەوتی کەرکوک بەڕێوەدەبا، لە سەکۆی شازدە هەزار کارهێزی تەنیا چل کرێکاری کوردی هەبووساڵی پاشتر ژمارەی کارمەندە کوردەکان بووە دوو سەد کرێکار.

ئۆیل عارەبی بۆ کەرکووک هێناو دوای چەند ساڵ دیمۆگرافیای شارەکەی گۆڕی. لە ۱۹۸۰کان و ۱۹۹۰کان، سەددام سیاسەتێکی دژواری "بەعارەبکردن"ی کەرکووکی پەیڕەو کـرد. کـورد ڕاگـوێزران و لەپاش ۱۹۹۱یش بەزۆری لەهێـڵـی سـەوزیان دەردەکردنەدەرەوەو بۆ ناوچەکانی بەر دەستی شۆڕشی دەناردن. تورکمـان و ئەو کـوردانەش کـە لەوێ مـابوونـەوە، ناچارکـران بۆ ئەوەی ڕەگـەزی خـۆیـان "ڕاست بکەنەوەو خۆیان بەعارەب بنووسن.

کە سـەددامیش ڕووخا، پارتە سیاسییە کوردەکان و هێزی پێشمەرگە، بەیارمەتی ئەمێریکییەکان، بۆشایی شارەکەیان پڕ کردەوە. وەک ئەوەی کە لە میسل کرا، لە کەرکووکیش، زۆربەی کردەوەی تالانی وەستاندو یەکێتی نیشتمانی کوردستان و پارتی دیمۆکراتی کوردستانیش بەڕێوەبردنی شارەکەیان کۆنترۆڵ کرد. یەکسەر لەئەنجامی ئازادکردن، کەم و زۆرێک "پاکسازی ڕەگەزی پێچەوانە" کرا. لە ۲۰۰۳، سەردانی چەند گوندێکی عارەبانم کرد کە چۆڵ کرابوون، کەچی ئاژەڵەکانیان هێشتا هـەر لەو ناوە بەرەڵا بوون و دەخـــولانەوە، بەڵام نەمـــزانی ئایا ئەو ڕۆیشـــتنە لەچاوەڕوانی ڕووخـانی پارێزگاکـە ئەنجام درابوو یان بەتۆبزی دەرکـرابوون[٩٤]. بەشێوەیێکی گشتی، دەسەڵاتدارە کوردە تازەکان، دانێکی زۆریان بەخۆیان دانا بۆ ئەوەی نەهێڵن کوردە ڕاگوێزراوەکان خێرا بچن و زەوی و زارەکانیان دەموودەست وەربگرنەوە.

لەئەنجامی ئەو فشارەی پارتە کوردەکان کردیان، یاسای بەڕێوەبردنی کاتی ناچار بوو چەند هەنگاوێکی دیار باوێ بۆ ئەوەی گەڕانەوەی ڕاگوێزراوەکان و چوونەوەی عارەبە داگیرکەرەکان و دیارکردنەوەی سنووری تازەی پارێزگایەکە، ئاسان بکاو هەموو ئەو گۆڕانکارییانەش کە سەددام حوسێن لەبەرژەوەندی عارەبان کردبووی، وەک خۆی لێبکرێتەوە. بەڵام لەڕاستیدا ژمارەیێکی کەمی ئەو هەنگاوانە جێبەجێ کران. دەسەڵاتی کاتی هاوپەیمانانیش کۆمسیۆنی موڵکدارێتی خۆی نەخستەکار بۆ

---

(٩٤) کەرکووک ئەو شوێنە هەرە گرینگە نەبوو بۆ ئەوەی ڕۆژنامەنووسان، کە لە نیسانی ۲۰۰۳دا چوونە ناو ئێراقێ، ڕووی تێبکەن. سوپای وڵاتە یەکگرتووەکان و دەسەڵاتی سیڤیلیش هیچ بایەخێکیان پێی نەدا. بۆیە کێشەکە بە گشتی پشتگوێ خرا.

ئەوەی لەو داواکارییانە بکۆڵێتەوە کە ئەوانەی لەسەر زێدی خۆیان دەرکرابوون، بۆ کۆمسیۆنەکە بەرزیان کردبۆوە.

لە هەڵبژاردنەکانی یەنایری ۲۰۰۵بوو، لیستی برایەتی کەرکووک کە کورد سەرکردایەتی کردو تورکمان و عارەب و دیانیشی تێدا بوون، زۆرینەی دەنگەکانی ئەنجومەنی شارەوانی کەرکوکی بەدەست هێنا، ئەو سەرکەوتنەش لە ئەنجامی ئەو یاسایە بوو کە ڕێگەی بەکوردە ڕاگوێزراوەکان دا، هەرچەندە کە نەشگەڕابوونەوە بۆ کەرکووک، بەڵام هێشتی لەوێ دەنگ بدەن[۹۵]. بۆ دیاری کردنی باری

یاسایی کەرکووک، دەستووری نوێی ئێراقێ داوای ڕێفرێندەمێک دەکا. هاوپەیمانی کوردستان لە هەڵبژاردنەکانی پارلەمان، لەدیسێمبەری ۲۰۰۵، زۆرینەی دەنگەکانی کەرکوکی وەدەست هێنا، ئەمەش هێمای ئەوەیە کە کەرکووک دەنگ بۆ ئەوەدەدا کە بێتە ناو کوردستان، جا با لەمەش پتر کوردە ڕاگوێزراوەکان بۆ کەرکووک نەگەڕێنەوەو سنووری پارێزگایەکەش وەک خۆی لێ نەکرێتەوەو ناوچە کوردییەکانیشی نێتەوە.

کێشەی کەرکووک کێشەیێکی ناسکە، ئەمەش هەر لەبەر ئەوەی نییە کە کوردی بەرانبەر بەعارەب و بەهەندێ لە تورکمانەکان خستۆتە بەرانبەر، بەڵکو لەبەر ئەوەشە چونکە ئەگەری ئەوەی هەیە تورکیاش تێوەگلێنێ. لە ۲۰۰۳، دەزگای سیخوڕی تورکیا زۆر بەچالاکی بەپارەو بەچەکیش پشتیوانی یەک لە گرووپە تورکمانییەکانی دەکرد کە بەرەی تورکمانی ئێراقێ بوو؛ (بەلای کەم یەک لەو بارە چەکانە کاتێک کە هێزەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان کاروانێکی مرۆیی تورکی پشکنی، لەلایەنی ئەمێریکییانەوە ئاشکرا بوو). لەو کاتەوەبەرەی تورکمانی ئێراقێ داتەپی و پەیوەندییەکانی تورکیاش لەگەڵ حکومەتی هەرێمی کوردستان بەڕادەیێکی دیار گەرم داهات. گومان لەوەدا نییە کە تورکیا دژی تێکەڵ هاتنەوەی کەرکووکە بۆ ناو هەرێمی کوردستان و ڕەنگە لەگەڵ نزیکبوونەوەی کاتی ریفرێندەمە چاوەڕوانکراوەکە، گرفتی گەورەشی لێ بکەوێتەوە.

گەلی کوردستان هیچ جۆرە پابەندییەکیان بەئێراقێوە نییەو ئەو شەڕە سیڤیلەی

(۹۵) هەمان یاسا لە یەکەم هەڵبژاردنی پاشی شەڕی لە بۆزنیا پەیڕەو کرا.

نێوان سوننەو شیعانیش ئەو بەرهەڵستکارییە توندەگەلییەی کە لەدژی چوونەوە نێو ئێراقێ هەیە هێشتا بە هێزتر دەکا. کورد نییە بیەوێ ئەو "نەخۆشییانەی ئێراق" هەیتی کە بریتییە لە گێرەشێوێنی و ململانێی ڕێبازگەری، بۆ ناو کوردستان بێنێ. زۆر کوردیش ئەو شەڕە ناوخۆییەی ئێراقێ وا دەخوێنێتەوە کە ڕۆژی جاڕدانی سەربەخۆیی کوردستان نزیکتر دەکاتەوە.

سەرۆکی کوردستان مەسعود بارزانی، یەک ڕۆژ دوای تەقاندنەوەی مزگەوتەکانی شیعەو لەڕێکەوتی ١٨ نۆڤێمبەری ٢٠٠٥، ڕاستەوخۆ بەکەناڵی NTV تێلیڤزیۆنی تورکی گوت: "خوا لەشەڕی سیڤیل بەدوورمان خا، بەڵام ئەگەر لایەنەکانی دیکە، لەناو خۆیانەوە، دەستیان بەشەڕی کردو شەڕەکە بەرپا بوو، ئێمە هیچ چارەیێکی ترمان [جگە لە سەربەخۆیی] نامێنێ." وەک لەچەند دیمانەیێکی پێشتریش فەرمووبووی، بارزانی هەمیشە مکوڕ بووە لەسەر ئەوەی کە سەربەخۆیی "مافێکی سروشتی و شەرعی" کوردی ئێراقێیە. کە ئێستاش ئێراق وا لەشەڕی ناوخۆدایە، توانجەکانی بارزانی ڕەنگدانەوەی نزیکەی هەموو کوردەکانی ئێراقێیەو ئەمەش هانی ئەمێریکییەکان نادا کە ئومێدیان بەئێراقێکی یەکگرتوو هەبێ.

ستراتیژی سەربازی سەرۆک بوش دەرباری ئێراقێ دەکرێ لەو دەستەواژەیەدا کورت بکرێتەوە کە لە گوتاری ٢٨ حوزەیرانی ٢٠٠٥ ئاراستەی گەلی ئەمێریکای کرد: "کە ئێراقییەکان ڕادەبن، ئێمە واز دەهێنین." هیچ هۆیێک لەئارادا نییە هزری ئەوە بکەینەوە کە ئەمە بەم زوانە ڕوودەدا، ئەگەر هەر ڕوویدا.

بەناو لە٢٠٠٥، سوپای ئێراقێ ١١٥ بەتالیۆن، یان ٨٠,٠٠٠ سەربازی هەبوو. ئەوانەی داگیرکردنی ئێراقێ بەسەرکەوتن دەزانن، هەمیشە باسی ئەو ژمارەیە دەکەن و کەچی ئەو ژمارەیە تەنیا لەسەر لیستی وەرگرتنی مووچەی مانگانەدا کاریگەری هەیە. کە وەزارەتی بەرگری بڕیاری دا سەرپەرشتی لیستی مووچەدان بکا، سێیەکی پارەکە بۆی هاتەوە. (چونکە ئابووری ئێراقێ هەموو هەر بەکاش دەگەڕێ، بۆیێ سەرکردەکان ژمارەیێکی زۆر سەربازی بەناو تۆمار دەکەن و مووچەکانیان بۆ خۆیان دەمێنێتەوە.) گەورە بەرپرسێکی وەزارەتی بەرگری ڕوونی کردەوە کە ڕەنگە تەنیا نیوەی ژمارەی ئەو سەربازانە بەڕاستی هەبن و تەنیا ١٠

لەسەدا لە مەیدانەکانی شەڕدا ئامادە دەبن.

هێشتا لەمەش پتر گومان لەو هێندە چەکە دەکرێ کە وڵاتە یەکگرتووەکان بۆ سوپای ئێراقیی دابین کردووە. کارمەندانی وەزارەتی بەرگری ئێراقیی دەڵێن ئەمێریکییەکان تۆماری ناوی ئەو کەسانەیان پێ نەداون کە چەکیان پێ داون. بەم شێوەیە، سەربازان ڕۆژی دواتر چەکەکانیان لە بازاڕی ئازاددا دەفرۆشنەوەو هەندێک یاخییەکان دەیانکڕنەوە. زۆربەی ئەو چەکانەی دەگیرێن، پێشتر هی پۆلیس و سوپای ئێراقیی بوونە. کرێیگ سمیت لە نیویۆرک تایمز نووسیویەتی کە لەشکری وڵاتەیەکگرتووەکان نایەوێ چیتر چەکی پێشکەوتوو بداتە سوپای ئێراقیی، لە ترسی ئەوەی نەکا یان لە شەڕی ناوخۆ یان لەدژی ئەمێریکییەکاندا بەکاریان بێنن.

گرفتەکان لەگەڵ سوپای ئێراقیی زۆر لەچەند کێشەیێکی گەندەڵی گەورەترە. ئەو پارچە پارچەییەی کە ناو ئێراقییەکاندا هەیە، لەڕیزەکانی سوپاشدا ڕەنگی داوەتەوە. لە سەرجەمی ئەو ۱۱۵ بەتالیۆنەی ئێستا هەنە، شەستی شیعەنە و چل و پێنجی عارەبی سوننەنە و نۆ بەتالیۆنیشی پێشمەرگەی کوردن، کە هەرچەندە بەفەرمی بەبەشێکی سوپای ئێراقیی ناسروان، بەڵام بارەگاکانیان هەمووی لەکوردستانە. تەنیا یەک بەتالیۆنی تێکەڵ هەیە (سەربازەکانیان لە هێزە چەکدارەکانی پارتە سەرەکییەکانەوە دەستنیشان کراون)و بارەگاکەشی لەناو بەغدایە. ئەفسەرانی لەشکرەکان پتر لە ڕەگەزی جیاوازن، بەڵام ئەفسەرە شیعەو کوردەکان کەمتر دەیانەوێ ببنە ئەفسەری ئەو یەکە سەربازییە عارەبە سوننانەی کە لەدژی چەتە عارەبە سوننەکان مەیدان دەگرن. هیچ ئەفسەرێکی عارەب لەناو بەتالیۆنە کوردییەکاندا نییەو قانونی کوردستانیش ڕێگە نادا سوپای ئێراقیی لەناو کوردستان بڵاوە بکا ئەگەر ڕەزامەندی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستانی پێ وەرنەگیرێ.

چونکە بەتالیۆنەعارەبە سوننەکان باوەڕیان پێ ناکرێ، حکومەتی ئێراقی و سوپای هاوپەیمانان، بۆ بەرینگاربوونەوەی چەتەکان، شیعەکان بەکاردێنن و کەمکەمە کوردیش تووش دەکەن. ئەمێریکییەکان واتێدەگەن ئەو سەربازانەئێراقینە، کەچیدانیشیوانەعارەسوننەکان خۆیان بەوجۆرە نازانن. لەکن عارەبە سوننەکان،

سەربازانی شیعە لە پێناوی ئێراقێ نییە خەبات دەکەن، بەڵکو شەڕ لە پێناوی ئەو سستمە سیاسییە دەکەن کە لایەنە سیاسییە شیعەکانی لای ئێرانێ هەڵیدەسووڕێنن. شیعەکان خۆیان وایان کرد ئەو هەستە پەرە بستێنێ، چونکە لە هەر شوێنێکی کەلێی هەڵدەدەن، وێنەی مەلایەکانیانی لێ هەڵدەواسن. ئەو ستراتیژییەی کە سەربازانی شیعەو کورد دەخاتە سەنگەری بەرانبەری چەتەی عارەبی سوننەوە بۆتە بیانوویێک بۆ یاخییە سوننەکان بۆ ئەوەی دانیشتوان لەدژی سوپای نوێ ئەو دەسەڵاتە کاڵ بدەن کە شەڕیان بۆ دەکەن.

لەدوای هەڵبژاردنەکانی ٢٠٠٥، لیستی شیعە لەگەڵ هاوپەیمانی کوردستان هاوپەیمانێتییەکیان پێکهێناو پشتی خواستەکانی یەکتریان گرت. ئەوان إبراهيم جەعفەریان کردە سەرۆک وەزیران و لە بەرانبەریشی جەلال تاڵەبانی پۆستی سەرۆک کۆماری وەرگرت[٩٦].

هاوپەیمانەتییەکە وەزارەتە گرینگەکانی لەناو خۆیدا دابەش کردو وەزارەتی ناوخۆو نەفت و دارایی بووە هی عارەبی شیعەو وەزارەتی دەرەوەش کورد وەریانگرت. عارەبێکی سوننە بەناوی سەعدون دلێمی وەزارەتی بەرگری وەرگرت، کەچی بابەکر زێباری کە کوردە هەر بەسەرۆک ئەرکانی سوپای ئێراقێ ماوەو کوردێکی تریش بەناوی بروسکە نوری شاوەیس بەکەورەکارمەندی سیڤیلی وەزارەتەکە دامەزرا. ئەحمەد چەلەبی و سەرۆکی پێشووی پەرلەمانی کوردستان، ڕۆژ شاوەیس هەردوو پۆستی بریکاری سەرۆک وەزیرانیان وەرگرت. عادل عبد المهدی لەئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی لەئێراقێ بەبریکاری شیعەی سەرۆک کۆماری پێشوو غازی یاوەر (نەیویست کۆشکی کۆماری چۆل بکاو)و پۆستی جێگری سەرۆک کۆماری سوننەی وەرگرت. عارەبێکی سوننەی خەڵکی کالیفۆرنیا کە ناوی حاجم الحسنی بوو، بەسەرۆکی ئەنجومەنی نیشتمانی هەڵبژاردرا.

ئەو پۆستانەی کە کوردیش وەریان گرت، هێمای زۆری بۆیان هەبوو. چونکە هەر

---

(٩٦) هەرچەندە ئیئتیلافی یەکگرتووی شیعەکانی ئێراقێ زۆرینەی کورسییەکانی پەرلەمانی بەدەست هێنا، بەڵام هەڵبژاردنی سەرۆک و هەردوو بریکارەکانی پێویستی بە دوو لە سێی دەنگەکانی هەبوو و سەرۆکیش سەرۆک وەزیرانی دەستنیشان دەکرد.

ئەوە نەبوو لەمێژووی ئەم وڵاتە ئەو کوردە یەکەم سەرۆک بوو کە بەشێوەیێکی دیمۆکراتییان هەڵبژێردرێ، بەڵکو دوو کورد کە تاڵەبانی و هوشیار زێباری وەزیری دەرەوە بوو، لە کۆنگرەی سەرانی وڵاتانی عارەبی لە٢٠٠٥ نمایندەی ئێراقێ بوون. کورد هەرگیز لەبیرناکەن کەوڵاتانی عارەبی بۆ تاقەیەک جاریش ڕەخنەیان لەسەددام حوسێنی برایان نەگرت کە گازی لەدژیان بەکار هێنا. زۆرینەی پۆستە بەهێزەکان وەبەر شیعان کەوت و کوردیش ئەوەیان قەبووڵ بوو؛ چونکەنووسراوەکانی بەغدا لە کوردستان بایەخیان نەبوو.

هەرچەندە کورد و شیعە هاوپەیمانییەتییەکیان هەبوو، بەڵام هیچ پرۆگرامێکی هاوبەشیان نەبوو، سەبارەت بۆ شێوازو پلانی ئایندەیان هەردوولا، تا ئەوپەڕ لەیەکتری دوورن. لەبری ئەوەستان ڕێککەوتنێکیان لە نێوان خۆیاندا کرد: کورد لێ دەگەڕێ شیعە ئێراقی عارەبی بەڕێوە ببەن و لە بەرانبەریشدا، شیعە دەست لەو سەربەخۆییە دیفاکتۆیە وەرنادەن کە ئێستا لە کوردستانێ هەیە. شیعەکان بەم ڕێککەوتنە قایل بوون چونکە بواری ئەوەیان بۆ دەڕەخسێنێ کە لە چوارچێوەی ئێراقی عارەبیدا خۆیان خۆیان ڕێک بخەن. بۆ کوردەکانیش، ئێراق بەپلەی دووەم دێ، چونکە پاراستنی کوردستان لە سەرووی هەموو ئەرکەکانی تر دایە.

لەدوای هەڵبژاردنەکانی ٢٠٠٥، بەڕێوەبەرایەتی بوش لۆبییێکی زۆری لەکورد کرد بۆ ئەوەی دەست نەخەنە ناو دەستی هاوپەیمانی شیعەکانەوە، کاشکا ئەیاد عەللاوی بەپشتیوانی کورد هێندە لایەنگیران لە هاوپەیمانی ئێراقی یەکگرتوو (بەخۆی هاوپەیمانییەکی تۆزێک بنکە بەرینە) پەیدا بکا، تا بتوانێ سەرۆکایەتی حکومەتێکی سێکولار بکا. ئەمێریکیەکان گوتیان عەللاوی لەگەڵ کوردان دەتوانن ئێراقێکی نوێ پێکبێنن. کوردەکان هێندەی بایەخیان بەکوردستانێ دا ئەوەندە گرینگییان بەئێراقێ نەدا. کورد پێویستییان بەڕێککەوتنێک هەبوو لەگەڵ ئەو لایەنەدا بیکەن کە چەند بایەخ بەئەجێندەی خۆیان دەدەن، هێندەش بایەخ بەئەجێندەی کورد بدەن. ئەو لایەنەش شیعە بوو.

جێی سەرسوڕمان نییە کە هاوپەیمانی شیعە- کورد دڵخۆشکەر نەبوو. هەرچەندە یاسای دەسەڵاتی ئینتیقالی زۆربەی دەسەڵاتە سیاسییەکانی بۆ سەرۆک وەزیران

هێشتەوە، بەڵام لەخووی تاڵەبانی نەبووە کە لە کورسی دواوە دابنیشێ. بۆیێ سەرۆک کۆمارو سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران لەسەر پرۆتۆکۆڵ هێندەبەتوندی تێکهەڵچوون کە کەسیان ڕازی نەبوو ئەوی تریان گوتاری ئێراقێ لەئەنجومەنی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان لە۲۰۰۵ ، بخوێنێتەوە؛ ئەوەبوو هەردووکیان خوێندیانەوە. کە تاڵەبانی بەسەردانێکی فەرمی سەرۆکی ئێراق لە سێپتێمبەری ۲۰۰۵، چووە واشنتن، جەعفەری فەرمانی بەهەموو وەزیرە شیعەکان دا تا بۆیکۆتی بکەن. ئەوە کوردی نیگەران نەکردو کردیانە نوکتەو گوتیان چونکە شاندەکە هەموو کوردە، مانای ئەوەیە کە وڵاتە یەکگرتووەکان ئێستا بەفەرمی بەدانی کوردستانێ دانا

تاڵەبانی کۆششێکی بێوچانی کرد بۆ ئەوەی عارەبە سوننەکان بێنێتە ناو پرۆسەی سیاسییەوە، بەڵام بەردەوام کەللە ڕەقە سوننەو شیعەکانیش ڕێیان لێی دەگرت. (تاڵەبانی لەداخانا هێندە تووڕە بوو، پرۆتستۆی کردو کردییە نوکتەو پێی گوتم: "ئەو ئامۆزا ئینگلیسانەتان" وڵاتێکیان دروست کرد کەکاری تێدا ناکرێ.) زۆر بەر لەوەی هیچ کەسێک بێتە قسە، تاڵەبانی ڕۆڵی وەزارەتی ناوخۆی لە بێ سەروشوێنکردن و ئیعدامی خێرای عارەبەسوننەکانی پرۆتستۆ کرد. کوردو هەندێک لە شیعەکانیش بێزارییان لەمەڕ ناکاریگەری جەعفەری دەربڕی. دەتوانم بڵێم، خاڵێکیان لەسەری گرتبوو. لەدوارۆژی دانانی دەستووری ئێراقێ بوو، زۆر لەکێشەکانی تایبەت بەئایندەی وڵات هێشتا چارەسەر نەببوو، کەچی جەعفەری وەزیرەکانی کابینەکەی کۆ کردەوەو سێ کاتی تەواوی لەکۆبوونەوەیەکدا بەسەر برد بۆ ئەوەی تاووتوێی ئەوە بکا ئایا خۆشاوی تەماتە لەگەڵ بەشە ئازووقەی مانگانە بۆ مانگی ڕەمەزان بەسەر هاوڵاتییاندا، دابەش بکرێ یان نەکرێ.

شیعەو ئێراقی هەرگیز لەسەر ئەوە یەکگر نەبووینە کە ئێراقی بن. بەڵام ڕێگەیێکیان دۆزییەوە بۆ ئەوەی بەرژەوەندییەکانی یەکتری ڕەچاو بکەن. هەردوو لا مێژوویێکی هاوبەشی درێژیان لەسەرکوتکراوی و خەباتی دژی دکتاتۆریدا هەیە. لەچەند لایەنێکەوە بووە مایەی بەختەوەری کە عارەبە سوننەکان لەهەڵبژاردنەکانی یەنایری ۲۰۰۵دا بەشدارییان نەکرد. عارەبە سوننەکان ئێجیندەیێکی سیاسی وایان

هەبوو کەبەزۆری بەرهەڵستی هەموو ئەو خاڵە گرینگانەی دەکرد کە کوردو شیعەکان هەیانبوو. لەکاتێکدا کە چەندین کێشەی دەستووری بەرچاو مابوون و پێویست بوو کە چارەسەر بکرێن، لەو کاتەدا ئەستەم بوو هاوپەیمانییەکی سێ لایەنە پێک بێ. بەڵام کوردو شیعەبەهۆی ئەو ئەزموونە تاڵەی هەیانبوو، بیرو بۆچوونێکی هاوبەشیان سەبارەت بەمێژووی تاریکی ئێراقێ هەبوو. کەچی عارەبە سوننەکان نەیانتوانی دان بەوەدا بنێن کە لەڕابردوودا هیچ کێشەیێک هەبووە.

یاسای بەڕێوەبردنی کاتی داوای لە ئێراقییەکان کرد دەبێ بەماوەی شەش مانگ لەدوای هەڵبژاردنەکان، واتا، تا ١٥ی ئابی ٢٠٠٥، دەستوورێک دابنێن کە ببێتە پەیمانێکی کۆمەڵاتی. بەڵام سێ مانگی خایاند تا شیعەو کورد توانییان حکومەتێک بێی عارەبی سوننە پێک بێن. لە تەمموز بوو کە وەزیری بەرگری ڕەمسفێلد سەردانێکی بەغدای کردو یەک پەیامی هێنابوو: وڵاتە یەکگرتووەکان بواری ئەوەنادا کە دواکاتی دانانی دەستوور پاش بخرێ، تەنانەت ئەگەر یاسای بەڕێوەبردنی کاتیش ئەو ڕێگەیە بدا لەهەمان کاتیشدا ئەمێریکییەکان عارەبە سوننەکانیان گرت، هەرچەندە کە بۆ ئەنجومەنی نیشتمانی هەڵنەبژاردرابوون، بۆ ئەوەی بەشداری پرۆسەی دانانی دەستوورەکە بکەن. ئەمێریکییەکان هێشتا هەر لە بری ئێراقییەکان بیریان دەکردەوە. کاربەدەستانی واشنتن هیچ زانیارییەکیان نەبوو کە کوردو عارەبی شیعەو عارەبی سوننە چەند کەم بەرژەوەندی هاوبەشیان لەگەڵ یەکتریدا هەبوو. بەڵام ئەو ڕاستییە لەمیانی تاووتوێ کردنی دەستووری هەمیشەیی ئێراقیدا، بەڕاشکاوی بەدەرکەوت.

# بەشی ١٠

## چارەسەری سێ دەوڵەتی

دووەم دوا دیدلاینی دەستووری ئێراقێ لە ٢٢ی ئابی ٢٠٠٥دا[٩٧]، چەند سعاتێکی مابوو کە سەرکردەکانی شیعەو سوننە لە ژووری کۆنفرانسەکانی بارەگای سەرەکی کوردستان مەسعود بارزانی لە بەغدا کۆبوونەوە. شیعەکان ویستیان هەترەسەکانی سەددام حوسێنی بەدرێژی لە دەستووری باس بکرێ، بەڵام سوننەکان بەرپەرچی ئەو خواستەیانیان دەداوە. لەو دەمەی من لەگەڵ سیاسییە کوردو عارەبەکان چایەم فڕ دەکرد، گوێمان لێ بوو لە هۆڵی کۆبوونەوەرا گاڵەگاڵ هات. ئینجا ئەمین موسەوی، پارلەمانتاری شیعە کە مێژوویێکی درێژی لە هەڵمەتی مافەکانی مرۆڤدا هەیە، هاتە دەرەوە. پێی گوتم: "سوننەکان دەڵێن سەددام لە باشوور تەنیا پێنج جووتیارو هەندێک کوردیشی کوشتووە. باوکی نەبیلی لە ١٩٨١ بێ سەروشوێن کرا، ئەمیش یەکێک بوو لەو ٣٠٠ شیعەیەی کە لە ماوەی سی و پێنج ساڵی حوکمی بەعسدا کوژراون. دیدلاینەکە تێچوو.

سێ ڕۆژ پاشتر، سەرۆک بوش تێلیفۆنێکی بۆ عبدالعزیز الحکیمی کرد کە سەرۆکی ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامییە لە ئێراقێ و گەورەترین و کاریگەرترین پارتی سیاسیی لای ئێرانییە. سەرۆک بوش داوای لێ کرد تا لە دانوستانی کێشەی ئاڵۆزی فیدرالیزم و لادانی بەعسییەکان، نەرمی بەرانبەری وتوێژکارە سوننەکان بنوێنێ. حەکیم بەرێزەوە سوپاسی سەرۆکی کردو تێیگەیاند کە پێشتر باش لە ئاڵۆزی سیاسەتی ئێراقێ تێنەگەیەندراوە، پێی گوت کە بایەخ بە

(٩٧) نیوەشەوی ١٥ی ئابی ٢٠٠٥ یەک کاتی مابوو کە ئەنجومەنی نیشتمانی یاسای بەڕێوەبردنی کاتی هەموار کردو دیدلاینەکەی بۆ ماوەی حەفتەیێک دواخست.

داخوازییەکەی دەدرێ. ئینجا سەرۆک بوش داوای لە حەکیمی کرد مافەکانی ئافرەتان مسۆگەر بکرێ. حەکیمیش دڵنیای کردەوە کە ژنان حەرەمن.

تێلیفۆنەکەی سەرۆک بێ مانا بوو. چونکە لەوکاتەی کە بوش داوای لە حەکیمی دەکرد چەند وازبەند (تەنازول)ێک بکا؛ عارەبە سوننە وتوێژکارەکان بەخۆیان ئەو وازبەندانەیان بەتەواو نەدەزانی. بۆچوونی حەکیمی سەبارەت بە مافەکانی ئافرەتانیش زۆر لە تێگەیشتنی بوشی دوور بوو، بەڵام سەرۆک هێندەی لێ نەدەزانی تا وەڵامی مەلا حەکیمی بداتەوە. ئەو قسانەی لەگەڵ حەکیمی کران، پەردەیان لە سەر ئەوە لادا کە، دوای سێ ساڵ لە داگیرکردنی ئێراقێ، سەرۆک و ڕاوێژکارەکانی زۆر کەمیان دەربارەی لێکترازانی ناو کۆمەڵگەی ئەو وڵاتە دەزانی. ئەم کەلێنانەی کە لە نێوان قوربانیانی ئەو تاوانانەی کران و ئەوانەی کە نکوڵی لەو هەترەسکارییانە دەکەن و دەڵێن هیچ تاوانێکی ئاوا نەکراوە، بەوازبەندێکی کەم پڕ نابنەوە. خۆ سەرۆکیش لە قسەکانیدا ڕاپایێکی کەمی نەکرد کاتێک کە هێندە نیگەرانی خۆی بەرانبەر بە ژنان دەربڕی؛ چونکە دیپلۆماتەکانی پێشتر قایل ببوون کە وازبەندی سەرەکی لە پاراستنی ئافرەتاندا بکەن و دوو ڕۆژ بەرلەوەی نیگەرانی خۆی بۆ حەکیمی باس بکا، بوش بەهۆی: "ئەو دەستووره دیمۆکراتییەی کە مافەکانی ئافرەتان مسۆگەر دەکا." بە ئاشکرا پیرۆزبایی لە ئێراقێ کردبوو.

لە کاتێکدا دەزاندرا کە دەستتێوەردانی ڕاستەوخۆی سەرۆک لە کاروباری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کارێکی ناپەسند بوو، زاڵمای خەلیلزادی باڵیۆزی سەرۆک لە ئێراقێ، ئەرکێکی زۆری کێشا تا دەستوورەکە بەدەرکەوت. تەنیا چەند ڕۆژێک بوو خەلیلزاد پۆستەکەی وەرگرتبوو کە لە سەرەتای مانگی ئاب، سەرکردەکانی ئێراقیی هەموو لە گرین زۆون کۆکردەوەو بەماش سێ حەفتەی ڕەبەقی بێ ڕاوەستان دانوستان کرد تا توانی شیعەو کورد لە سەر بنەماکانی دەستووری ئێراقێ ڕێک بخا.

بە یەکەم چاوتێکردن، وا پێدەچو کە لە بواری ئەم دەستوورەی ئێراقێ، خەلیلزاد ناوبژیوانێکی بێ هاوتا بووبێ. خەلیلزاد ئەفغانییەکی ئەمێریکییەو پەیوەندی لەگەڵ کۆمارییەکان لە سەردەمی بەڕێوەبەرایەتی ڕێیگنەوە دەست پێدەکا. خەلیلزاد بە ئاشکرا ڕەخنەی زۆر توندی لە هەوڵەکانی بوش لە ئێراقێ دەگرێ. لە میانی خۆ

ئامادەکردن بۆ شەڕی ئێراقێ، خەلیلزاد پشتیوانی ئەو گرووپە پارێزگارە تازانەی کرد کە پیلانی شەڕەکەیان ڕێکخست و پاشان نەیانتوانی پلانی بارودۆخی دوای شەڕەکە سازبکەن. لە نۆڤێمبەری ۲۰۰۲ڕا بۆ ماوەی حەفت مانگ، سەرۆک بوش، خەلیلزادی لەلای گرووپە نەیارەکانی سەددام حوسێنی بەنوێنەری خۆی دانابوو. پاش ئەوەی دوو ساڵ) باڵیۆزی وڵاتەکەی بوو لە ئەفغانستانێ و لەوێ بەڕادەیێکی بەربڵاو بە(جێگری مەلیک)ی ناسرابوو، بۆ ئێراقێ هات.

خەلیلزاد هێندە کاتی بەدەستەوە نەبوو کە بتوانێ شارەزای هەموو کونج و کۆڵانەکانی سیاسەتی ئێراقێ ببێ و لە هەندێ کێشەشدا ئەمەی لێ بەدیار کەوت. ئەوە بوو تا من پێم نەگوت، خەلیلزاد نەیدەزانی کە لە یەنایر، کوردستان دەنگی بۆ سەربەخۆیی دابوو. دیار بوو خەلیلزاد ئەوەندەی لە ئەفغانستانێ بوو بواری هێندەی نەبوو کە بەدوای کاروباری ئێراقێ بکەوێ و پێشنەدەچوو کەسیش لە وەزارەتی دەرەوە بیری لەوە کردبێتەوە کە ڕێفرێندەمەکە هێندە بۆ خەلیلزاد گرینگ بووبێ. کەچی خەلیلزاد دانوستانی دەربارەی دەستوور لەگەڵ کوردان دەکرد بۆیێ دەبوو زانیاری تەواوی دەربارەی ڕێفرێندەمەکە هەبێ.

ئەگەر لەودەمەی خەلیلزاد گەیشتە بەغدا، باوەڕی بە قانوونی، "ئێراقێکی دیمۆکراتی، فیدراڵی، فرەلایەنی یەککگرتوو،" هەبا کە بەڕێوەبەرایەتی بوش دایبابوو، ئەوە تەڵە بەپەلە دەیگرت. خەلیلزاد لەکن ئەو لایەنەوە بۆ لای ئەم لایەنە هاتووچووی بوو، بەم چەشنە لە پرۆسەی دەستنووسی دەستوورێک نزیک بووەوە کە زۆر لە ڕاژەی "دەوڵەت- دروستکردنەوە"دا نەبوو هێندەی ئەوەی کە دانوستانێک بووبێ بۆ ئەوەی پەیمانێکی ئاشتەوایی لە نێوان سێ لایەندا ببەسترێ و دەستوورەکەش تاڕادەیێکی زۆر ئەم ڕووکەشەی پێوە دیار بوو[٩٨].

---

(٩٨) لەوە حەپەسام چونکە ئەم دانوستانە زۆر بە دانوستانە سێ حەفتەییەکەی ١٩٩٥ی ژێنێڤ دەچوو کە شەڕی بۆزنیای ڕاگرت و منیش خۆم بەشداریم تێدا کرد. لە بەغدا هەر وەک لە ژێنێڤ، سێ لایەنەکە هەرگیز، وەک گرووپێک، تێکەڵی دانوستانە ڕاستەقینەکان نەبوون. لە بری ئەوە هەموو ڕێککەوتنەکان بە دووقۆڵی دەکران، یان هەر دیپلۆماتە ئەمێریکییەکان بۆ ناوبژیوانییان لە نێوان شوێنی نیشتەجێبوونی سەرکردەکانیان دەهاتن و دەچوون.

له دوای گەیشتنە ئێراقیی، خەلیلزاد تووشی دوو تەگەری گەورە هات: کوردو شیعەو سوننە ئێراقییەکان لە سەر هیچ بنەمایەکی هاوبەشی نێوانیان ڕێک نەبوون و وڵاتە یەکگرتووەکانیش سیاسەتێکی دیاری نەبوو. کوردەکان دەستووریان بە هەڕەشەیێک دەزانی کە لە سەربەخۆییەکان دەکراو هەموو پێشنیازێکیان بەو تەرازووە دەکێشا. شیعەکانیش چونکە زۆرینە بوون؛ دەستیان بەسەر ڕەشنووسی دەستوورەکەدا گرتبوو. جا یان لە نەزانییان بوو یانیش بە نیازەوە بوو، گەلێ جاران لایەنەکانی تر وایاندەزانی کە گەیشتوونە ڕێککەوتنێک، کەچی ئەوان زۆر جاران، بە ئاسانی لێی پاشگەز دەبوونەوە. ئەمەش بەشێوەیێکی سروشتی گومانی کوردەکانی لێیان پتر کرد. عارەبە سوننەکانیش هەر هەموو پێشنیازەکانیان ماندەل دەکردو هێندە کوردو شیعەکانیان بێزار کرد کە چیتر هیچیان لەگەڵ تێکەولێکە نەکەن. لە کۆتاییدا، خەلیلزاد هەموو ڕێککەوتنەکانی بە باڵیۆزخانەی وڵاتە یەکگرتووەکان تۆمار کرد و پاشان لە ناو دەقێکدا ڕێکی خستن و ڕەشنووسەکانی ئامادە کردن.

ئەو بڕیارە سیاسییانەی کە لە واشنتن و لە بەغدا دەردەچوون، ئەرکی خەلیلزادیان ئاڵۆز کردبوو. لە ئایارێ، کۆندۆلیزا ڕایس فڕی و هاتە بەغداو مکوڕبوو لەسەر ئەوەی کە ئەو سوننانەی پێشتر بۆیکۆتی هەڵبژاردنەکانی یەنایریان کردو بووە هۆی ئەوەی کە کەمترین ڕێژەیان لە ئەنجومەنی نیشتمانیدا هەبێ، دەبێ ئێستا لە لێژنەی نووسینەوەی دەستوور ئەندام بن. بێگومان ئەم جۆرە پێک کردنە کارێکی پەسند بوو؛ بەڵام سەرۆک جەلال تاڵەبانی یەکسەر وشیاری کردەوە کە ئەو عارەبە سوننانەی وڵاتە یەکگرتووەکان دەستبژاری کردبوون بۆ ئەوەی نمایندەی کۆمەڵگەی خۆیان بکەن، ئامادە نەبوون بۆ ئەوەی بە ڕشتی دەمەتەقی بکەن و نوێنەرایەتی زۆرینەی سوننەکانیشیان نەدەکرد. ئەم ئاگادارکردنەوانە هەمووی پشتگوێ خران.

شاندی عارەبە سوننەکان لە بیروبۆچوونی جیاواز پێکهاتبوون، بەڵام زۆربەیان کۆنە ئەندامی حیزبی بەعسی بوون. گوتەبێژو سەرکردەی دیفاکتۆی گروپەکە ساڵح موتڵەگ بوو؛ ئەویش کۆنە ئەندامێکی چالاکی حیزبی بەعسی بوو. هەرچییەک پێشنیار بکرابا، ساڵح موتڵەگ بەرپەرچی دەداوەو بەشێوەیێک قسەی دەکرد کە هەم کورد و هەم شیعەشی هەراسان دەکرد، تەنانەت جاری وا دەبوو هاوڕێیە

سوننەکانی خۆیشی لێی بە قسە دەهاتن. کۆنە وەرگێڕی سەددام حوسێن و دەستەیێک لە کۆنە بەعسی چالاکیش هەر لەو تیمەدا بوون. جگە لەوان، نوێنەری حیزبی ئیسلامی ئێراقی و پارتە دینییە سوننەکانیش لەو کانییە ئاویان دەخواردەوە. سەرکردەکانی حیزبی ئیسلامی ئێراقی لە کۆتاییدا پشتیوانی دەستوورەکەیان کرد، بەڵام دەنگیان لەناو ئەو هەموو دەنگانەی تر کە لە دژی کوردو لە دژی شیعە بەرز دەبووەوە، بزر بوو.

ئەوەی بەڕێوەبەرایەتی بوش بەهێنانە پێشی ئەو کۆنە بەعسییانە کردی، بووە هێمایێک کە ئەوانە پتر نوێنەرایەتی عارەبە سوننەکانیان دەکرد لەوانەی کە بە ڕاستی بۆ ئەنجوومەنی نیشتمانی خەڵک هەڵبیژاردبوون و پتر باوەڕیان بەو بەهایە ڕۆژئاواییانە هەبوو کە وڵاتە یەکگرتووەکان دەیویست لەناو دەستووردا ڕەنگ بداتەوە. ئەو عارەبە سوننانەی کە هەڵبژاردرابوون، جێگری سەرۆک غازی یاوەرو سەرۆکی پەرلەمان حاجم الحسنی بوون. هەرچەندە هەردووکیان لە گرووپی دانوستانی سوننەدا نەبوون، بەڵام هیچیان بەچارەسەرێکی مامناوەندی قایل نەبوون. الحسنیش کە لیبراڵێک بوو و چەندینساڵیش بوو لە کالیفۆرنیا دەژیا، بەرهەڵستی فیدرالیزم و نەهێشتنی بەعسی نەکرد، بەڵکو لە دژی پاراستنی مافەکانی ئافرەتان وەستا.

بەپێشخستنی ئەو بەعسییانە لەو سوننە لیبراڵانە، دیسان بەڕێوەبەرایەتی بوش هەمان نموونەی ماستاوسارکردنەوەی بۆ نەیارانی لە سەر حیسابی دۆستەکانی پەیڕەوکرد. بەمەش ئەمێریکییەکان وەک هەمیشەی خۆیان، بە هەڵە لە سیاسەتی ئێراقێ گەیشتن. بەعسییە تازەکانی موتڵەگ، بەچەقەچەق بەرهەڵستی دەستووریان دەکردو بەو جیاوازییەی کە ئەمێریکییەکان نیشانیان دان، وایان کرد کە لە ناو عارەبە سوننەکانی ئێراقێ و لە شوێنەکانی تری جیهانی عارەبیشدا، ڕەوایی دەستوورەکە لەکەدار بکەن. (جگە لەمەش خواستەکانی موتڵەگ وای کرد کە وڵاتە یەکگرتووەکان فرە دەستتێوەردانی ناپێویست بکاو ئەمەش ڕۆڵی ئەمێریکای لە پرۆسەی دەستووریدا ئاشکرا کرد.) لەگەڵ ئەوەشدا کە عارەبە سوننەکان لە هەڵبژاردنەکانی دیسێمبەری ٢٠٠٥ دەنگیان دا، پارتە نوێیەکەی موتڵەگ کە ناوی

بەرەی ئێراقی بۆ وتوێژی نیشتمانی بوو، تەنیا یازدە کورسی بردەوەو ئەمەش لە ٢٠ لە سەدا کەمتری سەرجەم دەنگی عارەبە سوننەکان دەکا نزیکەی ٨٠ لەسەدی عارەبی سوننە دەنگی خۆی بە بەرەی تەوافوقی ئێراقی دا، کە هاوپەیمانییەکی پارتە ئیسلامییە سوننەکانە. (یاوەر و حەسەنی خۆیان لەگەڵ لیستی سێکولاری عەللاوی کاندید کردو ئەمەش ژمارەیێکی کەمی دەنگی سوننەکانی هێنا.)

دووەم کێشەی گەورە کە ڕووبەڕووی خەلیلزاد هات، دێدلاین بوو. وەک بینیمان، یاسای بەڕێوەبردنی کاتی تەنیا شەش مانگ و نیوی لە هەڵبژاردنەکانی ٣٠ یەنایرەوەڕا تا ١٥ی ئابی ماوە بۆ ئەنجومەنی نیشتمانی دانا تا دەستوورێک بنووسێتەوە. ئەم دوا کاتە دیارکراوە، بەولاتێک کە لە بواری سیاسیشدا کۆک بێت، هێشتا هەر ماوەیێکی کورت بوو. لەو بیست و هەشت حەفتەیەی کە بۆ دانانی دەستوورەکە تەرخان کرابوو، دوازدەی هەر بۆ ئەوە چوو تا حکومەتێکی شیعەی کوردی پێک بێنن. پاشان لە ئەنجامی سەردانییەکەی ڕایس لە ئاپاریل کردی، ناچار هەوڵی بەشدارکردنی عارەبە سوننە یاخییەکان بدرێ. هەرچەندە کاریگەرییەکی بەرچاویان لە دوا ڕەشنووسی دەستوورەکە نەدەکرد، بەڵام بۆ ماوەیێکی زۆر پرۆسەکەیان بەپاش خست.

کارێکی لۆژیکی بوو کە ئەنجومەنی نیشتمانی پشت بەو بەندەی یاسای بەڕێوەبردنی کاتی ببەستێ کە بواری درێژکردنەوەی شەش مانگی پرۆسەی نووسینەوەی دەستووری دەدا. بەڵام چونکە سەرۆک بوش ویستی جۆرە پێشکەوتنێک نیشانی ڕای گشتی ئەمێریکی ئارام لێبڕاو بدا، مکوڕ بوو لەسەر ئەوەی کە ئێراقییەکان دەبێ لە گەڵ دێدلاینەکە لە نووسینەوەی دەستوور ببنەوە. هەرچەندە ئەو گەورە سەرکردە ئێراقییانەی کە قسەم لەگەڵیاندا کرد، هەموو دەیانویست ماوەکە بۆ شەش مانگ درێژ بکرێتەوە، بەڵام هیچیان زاتی ئەوەیان نەبوو بە ئاشکرا داوای بکەن. بەڵام بە دیار کەوت کە نووسینەوەی دەستوورەکە لە ١٥ی ئاب کۆتایی نەدەهات، بۆیێ دێدلاینەکە دووجاران درێژ کراوە. یەکەمیان ئەوەبوو کە یاسای بەڕێوەبردنی کاتییان هەموار کرد بۆ ئەوەی ڕێگە بدا ماوەکە حەفتەیێک درێژ بکرێتەوە و جاری دووەمیش، کە لە چوارچێوەی یاسایدا نەبوو، سەرکردەکان

لەسەری ڕێککەوتن. کاریگەری ئەو دێدلاینە کورتە بۆ بەهێزکردنی ئەوانە بوو کە زۆر ڕشت بوون کە ببەنەوە: ئەوانیش کورد و مەلا شیعەکان بوون.

بەڕێوەبەرایەتی هەڵەی تریشی کرد؛ کە هەندێکیان هەڵەی زۆر زەق بوون هەرچەندە ئاشکرا بوو کە بەڕێوەبەرایەتی پێویستی بوو کوردەکان لە داخوازییە سەرەکییەکەی خۆیان، سەبارەت بە کوردستانی مەیلەو سەربەخۆ، نەرمی بنوێنن، بەڵام پێدەچوو دیپلۆماتە ئەمێریکییەکان پێ لە بەری خۆیان پتر درێژ بکەن، بۆ ئەوەی ئازاری کوردەکان بدەن. دە ساڵ پتر بوو، ئەو بەشەی کوردستان کە پارتی دیمۆکراتی کوردستان بەڕێوەی دەبرد، هەڵدانی ئەو ئاڵایەی ئێراقیی یاساغ کردبوو کە هێمای عارەبە قەومییەکان بوو و لە سێبەری ئەو بەیداخەش بوو کە سوپای ئێراقێ ئەنفالی کوردی کردبوو (لە پارێزگای سلێمانی، یەکێتی نیشتمانی کوردستان پەرچەمێکی کۆنی ئێراقیی لە سەر هەندێ تەلاردا هەڵدەدا[۹۹]).

کاربەدەستە ئێراقی و دیپلۆماتەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان بەشێوەیێکی ئاسایی ئامادەی هەموو ئەو بۆنەو چالاکییانەی کوردستان دەبن کە ئاڵای کوردستانی تێدا بەرز دەکرێتەوە. لەگەڵ ئەمەش کە حکومەتی کوردستان ویستی یادی ٤ی گەلاوێژ (ڕۆژی سەربەخۆیی - وەرگێڕ) بۆ ئەمێریکییەکان بکاتەوە، بەڕێوەبەرایەتی هیچ منەتبارییەکی بەوە نیشان نەدا کە تاکە لایەنێکی ئێراقی ویستی بەم شێوەیە ڕێز لە وڵاتە یەکگرتووەکان بگرێ. لەبری ئەمە، ڕێنمایی ئاوا بۆ کۆنسوڵگەری وڵاتە یەکگرتووەکان لە کەرکووک هات کە ئامادەی ئاهەنگەکە نەبێ ئەگەر کورد ئاڵای ئێراقێ هەڵنەکەن. حکومەتی کوردستانیش ئاهەنگەکەی کانسڵ کرد. چونکە ئەمێریکییەکان بەڕاستی دەیانزانی کە کورد هەڵوێستی خۆیان دەربارەی ئاڵاکە نەدەگۆڕی، بۆیێ ناکرێ بڵێین ئەو بڕیارەی بەمەبەستی هەڵگیرسانی کێشەیێک

(۹۹) ئاڵای ئێراقێ بریتییە لە سێ ڕیز ڕەنگی ئاسۆیی کە سوورو سپی و ڕەشە. هەمان ئەو ڕەنگانە لە ئاڵایەکانی میسرو سوریاو یەمەنیشدا هەیە. ئاڵای ئێراقێ سێ ئەستێرەی سەوزی لەسەرە؛ ئاڵای سوریا دووی لە سەرەو ئاڵای یەمەن ئەستێرەی لێ نییە. لە دوای شەڕی ١٩٩١، سەددام "الله اکبر"ێکی بە دەستنووسی خۆی بۆ زێدە کرد، بەڵام ئەو ئاڵایەی لەو کوردستانەی بەشی یەکێتی نیشتمانی کوردستان هەڵدەدرێ ئەوەی بەسەرەوە نییە. هەر سێ ڕەنگەکە هێمای ناسنامەی عارەبینەو بەمەش کوردی لێ دەرکراوە.

لەگەڵ کوردان درا، بڕیارێکی ژیرانە بوو. ئەگەر کاتەکەی ڕەچاو بکەین، نازانین نیازی چ بووە.

چەند ڕۆژێک دوای نسکۆیەکی ٤ی گەلاوێژ، کۆنسوڵی سیاسی باڵیۆزخانەی وڵاتە یەکگرتووەکان لە بەغدا، پرێسی بیانی لە چەند پێشنیازێکی دەستووری جیاجیا ئاگادار کردەوەو باسی پێشنیارێکی کرد کە ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان پێشکەشی کردبوو. لەو پرێس کۆنفراسە، کۆنسوڵەکە سەرکردەکانی کوردی بە قاڵی فرۆش بەراورد کرد کە نرخی گران لە سەر مافوورەکانیان دادەنێن بۆ ئەوەی زۆر بەکەمتر قایل بن. سەرۆکی کوردستان مەسعود بارزانی تووڕە بوو. بەڵام هەر خۆی بوو لە دوا قۆناغدا پێکەنی؛ چونکە نزیکەی هەر هەموو پێشنیازەکانی پەسندکران و بەدیاریش کەوت کە تەنیا ئەمریکییەکان ئەو هێڕانە بوون کە بەرزترین نرخیان دا.

بارزانی تاکە سواری مەیدانی دانوستانە دەستوورییەکان بوو. پاش ئەوەی بارزانی هەموو سەرکردە سیاسی و گرووپە ئیتنییەکانی کوردستان یەک کرد، دەستەیێک کەمترین داواکاری کە مساوەمەی لە سەر نەدەکرا، پێشکەشی ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان کرد: باڵادەستی یاسای کوردستان، بەردەوامی پێشمەرگە، کۆنترۆڵکردنی سەرچاوە سروشتییەکان لەلایەنی کوردستانەوە، ڕیفێرێندەمێک بۆ چارەسەری کێشەی کەرکووک، مافی چارەی خۆنووسین لە ئایندەدا، هەمووی بۆ بوو. چونکە بارزانی پابەند بوو بەوەی کە هەر هەموو ڕێککەوتنە دەستوورییەکان بباتەوە بەردەستی ئەنجومەن، بۆیێ کە گەڕاوە بەغدا، پشتیوانێکی توندو دەسەڵاتی تەواوی هەبوو و ئەویش بواری چارەسەری مامناوەندی نەداو کە بە عارەب و بە ئەمریکییەکانی ڕاگەیاند کە کوردستان ئەو دەستوورەی ناوێ کە تەواوی خواستەکانی جێبەجێ نەکا، یەکسەر هەموو قەناعەتیان پێی هات.

پارتە شیعە فەرمانداڕەکان ئەجێندەیێکی هاوبەشی کێشەی ئاین و دەوڵەتیان هەبوو. ویستیان ئێراق بەدەوڵەتێکی ئیسلامی بناسرێ؛ شەریعەت جێی قانوونی عیلمانی ئێراقی بگرێتەوە؛ دەستوور دان بە مەرجەعییەتی شیعە دابنێ: دادگایەکی دەستووری دابمەزرێ بۆ ئەوەی بە هەموو یاساکان دابچێتەوە تا دڵنیابی کە لەگەڵ ئیسلام یەک دەگرنەوە. ئەگەر هەموو ئەوانە لە چواچێوەیێک بگرین، دەبینین بە یاساکانی جمهوری ئیسلامی ئێرانێ دەچن.

دادگەی دەستووری بەو شێوەیەی شیعەکان پێشنیاریان کردبوو چەند مەلایێکی بەتوانای تێدا دەبێ کە بەهۆی بنەمای ئایینییەوە دەتوانن بڕیارەکانی پەرلەمانی هەڵبژێردراو و حکومەتیش بگۆڕن. ڕۆڵی دەستووری مەرجەع ئەو باروودۆخەی بەبیر هێناوە کە ئێرانی کردە ئەنگوستیلەی دەستی خومەینی. خۆ تەنانەت ئەگەر دەسەڵاتی تایبەتیش بەمەرجەع نەدرێ، بێگومان ڕێزگرتن لە دەستووری ڕۆڵی حکومەت لەوە بەهێزتر دەکا کە ئێستا دەسەڵاتدارترین دەزگای ئێراقییە. لەو کاتەی کە کورد و عارەبە سێکولارەکان دەیانزانی ئەم پێشنیازانە بۆ کوێی دەبردن، بەڕێوەبەرایەتی بوش مکوڕ بوو لەسەر ئەوەی کە شیعە ئێراقییەکان نەیاندەویست نموونەی حوکمی ئێرانی کۆپی بکەن.

لە ١١ی ئاب، سەرۆکی ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی لە ئێراقێ، عبدالعزیز حەکیم باری دانوستانەکانی گۆڕی و پێشنیاری کرد کە هەر نۆ پارێزگا شیعەکانی باشوور، ببنە یەک هەرێم و هەمان دەسەڵاتی کوردستانیان هەبێ. سێکولارە ئێراقی و میدیان ڕۆژئاوا ناوی ئەو هەرێمە زەبەللاحەیان کردە "شیعەستان" و ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی لە ئێراقێیان بەوە گومانباریان کرد کە دەیویست ئێراق دابەش بکا. کەچی بەڕاستی لەو دەمەی کە حەکیم پێشنیازەکەی خۆی کرد، باشووورە شیعەکەی ئێراقێ لەمێژبوو لە بن کۆنترۆڵی بەغدا نەمابوو. ڕەنگبوو پێشنیارەکەی حەکیمی حکوومەتێکی لە باشوور پەیدا بکردبا کە دامودەزگاکانی بە فەرمی بناسراباو بەم شێوەیەش هەیکەلییەتێکی بە ئەو سستەمە نافەرمییە دەدا کە لایەنە دینی و میلیشیا هاوکارەکانیان حوکمی پێدەکەن. چونکە ئەو تاکە شیعەستانە لە سەدی نۆیلی ئێراقو ٤٠ لەسەدی دانیشتوانەکەی و دوو پیرۆزترین شوێنی شیعەکانیشی دەکەوێتە بەر دەست، بۆیێ ڕەنگە لە ئێراقێ و لە ناوچەی کەنداوی پارسیش بە هێزێکی ترسناک سەیر بکرێ. نە عارەبە سوننەکان و نە ئەمێریکییەکانیش هیچیان ئاگایان لەوە نەبوو کە حەکیم، بێ ئاگادارکردنەوە پێشینەی ئەوانەی کە لەدەرەوەی پارتەکەشی بوون، ئەو پێشنیارەی خۆی لەبەر دەمی کۆبوونەوەیێکی گەورە لە نەجەف ڕاگەیاند کە وێنەی خومەینی لە هەموو کونج و کۆلانێکیدا هەڵواسراوە.

پێدەچوو پێشنیارەکەی حەکیم کردی هەندێ لە سەرانی شیعەی حەپەساندبێ. چونکە لەو دەمەی کە ڕێکخراو و لایەنەکانی تریش پشتیوانی فیدرالیزمیان دەکرد، دوو یان سێ پارێزگای شیعەی تریشیان بەگەڵ ئەو فیدرالییە دابوو. سەرکردەکانی بەسرە خۆیان لە پێشنیارەکەی حەکیمی لاتەریک گرت، چونکە بەلای کەم نەیاندەویست نەوتی بەسرە بکەنە میوژی سەر بووکێ. سەبارەت بە کۆنترۆڵی نەوت لەلایەنی هەرێمەکانەوە، دەعوەی جەعفەری بەرهەڵستی حەکیمی کرد، ڕەنگە ئەمەش هەر لەبەر ئەوە بووبێ کە خۆی سەرۆک وەزیرانی حکومەتی ناوەندی بوو. موقتەدا سەدریش بەرهەڵستی کردنی خۆی بۆ هەموو جۆرە فیدرالییەک نیشان دا، کەچی قایلیش نەبوو پشکداری پرۆسەی نووسینەوەی دەستووریش بێ، بیانووشی ئەوە بوو کە لەوکاتەدا دەنووسراوە کە ئێراق داگیر کرابوو. زۆرینەی هاوسۆزەکانی سەدر لە شاری سەدری بەغدادا دەژین؛ بۆیێ نەدەبوونە بەشێکی شیعەستانەکەی حەکیمی.

هەندێ لە دیلۆماتە ئەمێریکییەکان گوتیان کە حەکیم بەو مەبەستە ئەو پێشنیارەی کرد تا هەڵوێستەیێک بە کورد بکاو نەهێڵێ، لەمە زێتر، ئەسپی خۆیان بەرەو سەربەخۆیی تاودەن. ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی لە ئێراقێ بە چڕی ڕەگی لەناو زۆرینەی دانیشتوانی پارێزگارە شیعییەکانی باشوور داکوتاو لە سەرکۆی نۆ پارێزگادا، ئەنجومەنی هەشتیانی کۆنترۆڵ کردبوو. لەو دەمەی کە ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی لە ئێراقێ دەسەلاتی شیعەستانی لەبەر دەست دابوو، پێویستی بەوە نەدەکرد کە گومان لە دڵسۆزی قسەکانی حەکیمی بکرێ. لەمەش پتر، خۆ ئەگەر ویستبای کورد بترسێنێ، ئەوە پرووشکی ئاگرەکەی بە خۆیشی دەکەوتەوە. ڕاستە ژمارەیێکی کەمی سەرکردەکانی کورد وا دەبێ بە ئاشکرا دەڵێن کە دەیانەوێ شیرازەی ئێراقێ تێکچێ، بەلام شیعەستان ئەو هەڵوێستەی کوردستانی بەهێز کردو ئەگەر ئێراقیش لێک بترازێنێ، ئەوە هێشتا زۆر باشترە.

بارزانی و سەرکردە شیعەکان لە کۆتاییدا لە سەر شتێک ڕێککەوتن. کورد هەرچییان سەبارەت بەفیدرالیزم دەویست هەموویان بەدەست هات و شیعەکانیش هەندێ لەوەی سەبارەت بەئیسلام دەیانویست بۆ خۆیان مسۆگەریان کرد. وەک

کێشەکانی ئافرەتان و ڕۆڵی مەلایەکانیان بۆ بوو، بەمەرجێ لە کوردستان کاری پێ نەکردێ. هەردوو لا لەسەر ئەوە کۆک بوون کە دەسەلاتەکانی حکومەتی فیدراڵی تا ئەوپەڕ کەم بکرێتەوە: هەر کاروباری دەرەوەو سیاسەتی بەرگری و سیاسەتی پارەداری و سیاسەتی بودجە و دیاریکردنی لەرەی شەپۆلی پەخش و ڕاژە گوزارییەکانی پۆستەو هاتنی ئاوی ڕووبارەکانی دجلەو فرات و ئەنجامدانی ئاماری گشتی و ڕێکخستنی کێش و پێوەرەکانی بۆ ماوە. هەموو دەسەلاتەکانی دیکە، بە باج وەرگرتنیشتەوە(١٠٠) دەبێ بە هاوکارییەکی کاریگەری هەرێمەکان جێبەجێ بکرێن.

بەڕواڵەت دەستوورەکە ئێراق بەدەوڵەتێکی ئیسلامی پێناسە دەکا. ئیسلام ئایینی فەرمی وڵاتەو "یەک لە سەرچاوە بنەڕەتەکانی یاسایە". پارتە ئیسلامییە شیعەکان ویستیان ئیسلام ببێتە سەرچاوەی بنەڕەت بۆ یاساو بەمجۆرە، شێوەی ڕاستەقینەی دەستووری جۆرە سەرکەوتنێکی سێکولاریزمی تێدابوو. بەلام پاشان دەستوور مەرجێک دادەنێ کە "ناشێ هیچ یاسایێک دابندرێ ئەگەر بە پێچەوانەی ڕێسایەکانی ئیسلام بێ. دەبێ دادگەی بالای فیدراڵی ئێراقی بەدەستووری بوونی هەموو یاسایەکاندا بچێتەوەو گومان نەهێڵێ کە نائیسلامی نینە دەستوورەکە داوای ئەوەش لە دادگەیەکە دەکا کە "شارەزایانی فیقهی ئیسلامی دەبێ لەناو دەستەی دادوەرانیدا هەبن.

لەلای سەرکردە سێکولارە ئێراقییەکان هەبوونی زانای ئیسلامی لەناو ئەو

---

(١٠٠) کارمەندێکی گەنجینەی بریتانی کە وەک ڕاوێژکاری باڵیۆزخانەی وڵاتەکەی کاری دەکرد، دوو کات پێش دوایین دیدلاین، هێندەی نەمابوو ڕیسی دەستوورەکەیان لێ بکاتەوە خوری. دەقێکی وەرگێڕدراوی ئینگلیسی دەستوورەکەی دەخوێندەوە کە بەبەر دەستی کەوتبوو، بۆی ئاشکرا ببوو کە حکومەتی فیدراڵی دەسەلاتی باج وەرگرتنی نەبوو. نزیک بوو داوای کۆبوونەوەی سەرکردە سیاسییەکانی ئێراقێ بکا کە ڕاوێژکارێکی دەستووری کوردی زیرەکی بیرخێرا گەڕاو ڕۆژئاواییەکی گرت کە من خۆم بووم، بۆ ئەوەی بچم بارو دۆخەکەی بۆ کابرا ڕاڤە بکەم. پێم گوت ئەو پشتگوێ خستنە بەهەڵە نەکراوەو دەتوانێ پرس بە باڵیۆزەکەی خۆیان بکا بەر لەوەی کە دەرخۆنەکە هەڵداتەوەو ئەو چارەسەرە مامناوەندە ناسکەی ئێراقییەکان کردوویانە، داتەپێنێ.

دادگـەیەی کـە بە یاسـاکـاندا دەچووەوە، وای لێ کـردبوو کـە بڵـێن بۆنی سـسـتـمی ئێـرانێـی لێ دێ. ئەو سـێکولارانـە کـە حـەسـەنی سـەرکـردایەتی دەکـردن بـە توندی نکوڵییان لێی کرد. لەگەڵ ئەمەشدا، پارتە ئایینییەکان پشتیوانێکی ڕەچاو نەکراویان هەبوو، ئەویش باڵیۆزەکەی ئەمێریکا بوو. لە مـیـانی کۆبوونەوەیێک کە لە بارەگای بارزانیدا سازکرا، خەلیلزاد مشتومڕی لەگەڵ سێکولارە ئێراقییەکان لە سەر ئەوەی بوو کـە دەبێ شـارەزایانـی ئایینی لەنـاو ئەو دادگـەیەدا هەبن تا بتـوانن ئەو تەگـەرە دەستوورییانە نەهێڵن کە دێنە پێش ئەو قانوونانەی کە بە پێچەوانـەی بنەمایەکانی ئیسـلامن و ڕاستـی بنەمـایەکـانی یاسـایەکـان دەبێ بسـەلمێنن. ئـەمـەش دەقی ئەو بیانووانە بوو کە سەرکردەی حیزبەکانی شیعە هەیانبوو، عیلمانییەکان بەمە زۆر دڵگران بوون کـە هـەمـان ئەو بیـانووانەیان لە نوێنەری سـەرۆک بـوشی بیسـتـەوە. خەلیلزاد دەیزانی کە شیعەکان بە دەستوورەکە قایل نابن ئەگەر هەندێک لە خواستە ئایینییەکانیانی تێدا نەبێو ئەمێریکییەکانیش ناتوانن لە لایێک بەرگری لە بەهایە ڕۆژئاواییەکان بکەن و لەلایێکی تریشەوە لەگەڵ دێدڵاینەکە ئەرکەکەیان تەواو بکەن. سـەرۆک بـوش پێـشـتـر ڕوونی کـردبووەوە کـە بابەتی دووەمین لە کن ئەو، گرینگترەکەیان بوو.

کـوردەکـانیش بەدوودڵیـیـەوە بەگـەڵ خـەلیلزادی کـەوتن، چونکە نزیکی هەمـوو خواستـەکانی خۆیانیـان بەدەست هێنابوو، بۆیێ گەرەکیـان بوو دەسـتـوورەکە ببێ. بەڵام لەبری ئەوە ڕێگەیان دا کە مەلا لەناو دادگەی باڵادا هەبن، هەستان نەیانهێشت دادگەکە دەسـەڵاتی بەسەریاندا بشکێت و بتوانێ بە یاسـایەکانی هەرێم دابچێتەوە. کـورد هـەرگـیـز هـێنده لە ئەمـێـریکـیـیـەکـان نیگەران نەبوونە وەک ئەوەی کـە لەو ڕێنمـایـیـانەیان کـە بۆ دادگـەی باڵا کـردیان، هەراسـان بوون. چونکە کـە وتوێژکـارەکـانیـان سـەیری نموونـە ئەمێریکـیـیـەکەیان کـرد، دەسـەڵاتێکی قـەزایی سەربەخۆیان بەدی نەکرد، بەڵکو دەزگایەکی ترسناکی شۆڕشگێڕی وەتۆیان بەرچاو کەوت کە دادوەرەکانی دەتوانن بە پێی میزاجی سیاسی خۆیان بڕیاری ئەنجامدانی هەڵبـژاردنی سـەرۆکـایەتی بدەن. بۆیێ بۆیان نەدەکـرا بە هـیـچ شـێـوەیێک ئەو دەسەڵاتانە بە دادوەرەکانی بەغدا بدەن.

دوای سەپاندنی دەستوورەکە زۆر لە ڕۆژئاواییەکان فۆکەسیان لە سەر بەندەکانی یاسای مافەکانی مرۆڤ و ڕەگەز کرد، بێ ئەوەی بزانن کە تاڕادەیێکی زۆر بێ سوود بوون. وا باسی بەشی مافەکانی مرۆڤی دەستووری ئێراقێ دەکرێ کە لە ڕۆژهەلاتی ناڤیندا باشترینیانە. کەچی ئەو مەرجانەی بۆ مافەکانی ئافرەت داندراوە ڕەخنەی ئەوەی لێ دەگیرێ کە هەنگاوێکەو بۆ دواوە دەگەڕێتەوە[١٠١].

دین و مافەکانی مرۆڤ و ڕەگەز لە بن دەسەلاتی تەواوی حکومەتی فیدرالّی نینە. چونکە بەتەواوەتیش لە ژێر دەستی حکومەتی فیدرالّیدا نینە، بۆیێ دەستوورو یاسا هەرێمییەکان بالادەست دەبن. ئەم جۆرە ڕێکخستنە، بواری کوردستان دەدا تا بارە سێکولارەکەی خۆی و مافەکانی مرۆڤیش لە دەقی دەستووری خۆیدا بپارێزێ؛ چونکە دەستوورەکەی بالادەستی دەستووری فیدرالّییە (لەگەلّ هەندێش هەموو کات پەیڕەو ناکرێ). ئەمە ئەوەش دەگەیێنێ کە هەرێمەکانی شیعە (یەک بێ یان زۆر بن)، بە تایبەتی لە هەلّسوکەوت کردن لەگەلّ ژنان، لایەنێکی توندتری شەریعەتی ئیسلامی پەیڕەو دەکەن لەوەی کە لە ناو دەستووری فیدرالّیدا هەیە.

ئێستا ئێراق دابەشی سەر سێ قەوارەی جیاوازە بووە. کوردستان لە ١٩٩١ لە ئێراقێ بووەوە ناشکەڕێتەوە. شۆڕشی شیعەی ئێراقێ و عارەبی سوننەش شەڕێکی ناوخۆیان دەستپێکرد کە ئێراقی دابەشی سەر هێلّی ڕێبازگەران کردووە. دەستووری ئێراقێ دوو تایبەتمەندی گەورەی تێدا هەیە: یەکەم؛ بنەمایێک بۆ عارەبە سوننەو شیعەکانی ئێراقێ ساز دەکا تا بتوانن دامەزراوە تایبەتییەکانی خۆ-بەڕێوەبردن پێکبێنن کە ڕەنگە ڕێگە بۆ پێشکەوتنی باشوور خۆش بکاو یارمەتی ناوەندیش عارەبی سوننەش بدا تا ناوچە پڕ ئاژاوەکانیان ئارام بکەنەوە. (کوردستان ئێستا حکومەتی هەرێمی کارامەو هێزی ئاسایشی خۆی هەیە.) دووەم، دەستوور

(١٠١) دەستوور دەیەوێ لە شوێنی یاسای کاروباری سیڤیل، کە یاسایێکی پێشکەوتووە، ڕێگە بە هەر کەسێک بدا بتوانێ لە نێوان سستمێکی ئایینی مەزهەبگەری و یاسای سیڤیل هەلّبژێرێ بۆ ئەوەی بە پێی کامیان خۆی دەیەوێ بەو حوکم بکرێ. چونکە شەریعەتی ئیسلامیش لە کێشە کەسییەکانی وەک مارەو تەلاق و میراتگرتندا(خوشک نیوەی برا وەردەگرێ)، لای پیاو دەگرێ، بۆیێ لێرە هاندەرێک بۆ پیاو هەیە تا شەریعەتی ئیسلامی پەسند بکاو ژنیش یاسای سیڤیل هەلّبژێرێ، ئەگەر بەڕاستی ڕێگەی بدرێ.

یاسایێکی بۆ خاوکردنەوەی ئەو کێشانە خستۆتە گەڕ کە قسەو باسی زۆریان لە سەر دەکرێ و ڕەنگە شەڕی ناوخۆی ئێراقیّ بەرفرەوانتر بکەن. ئەوانەش کێشەی خاک و دابەشکردنی دەرامەتو کۆنترۆڵکردنی حکومەتی ناوەندی بەغدانە.

لە میانی دانوستانە دەستوورییەکان، عارەبە سوننەکان پێکهێنانی هەر هەرێمێکی تری فیدراڵییان ڕەت کردەوە، چونکە بە قسەی ئەوان دەبنە هۆی پارچە بوونی ئێراقیّ. (لە سەرەتادا بە فیدراڵی کوردیش قایل نەبوون، بەڵام لە کۆتاییدا تەنانەت ساڵح موتڵەگیش هاتە سەر ئەو ڕایەی کە ئەو فیدراڵییە ڕاستییە.) بەو پێیەی کە لە هەر ئێراقێکی یەکگرتوودا، عارەبی شیعە باڵادەست دەبن و ئەو بەرهەڵستییەی عارەبی سوننە لە فیدراڵیزمی دەکەن، دژی بەرژەوەندی خۆیانە، دەبێ بیانووەکانیان تەنیا بەو جۆرە بخوێنینەوە کە بۆ ئەوەبوو دەیانویست سەرتاپای پرۆسەی دانانی دەستوور لەناو ببەن. هەرچەندە عارەبی سوننە بە نزیکەی کۆی دەنگ (نا) لە دژی دەستورەکە بوون، بەڵام دەستوورەکە هەر سەپا. ئینجا ئومێد دەکرێ کە عارەبی سوننە بیر لە چاکەی خۆیان بکەنەوەو هەرێمی خۆیان دابمەزرێنن.

هێشتا دیار نییە ئایا عارەبە شیعەکان، وەک ئەوەی کە حەکیم داوای کرد، هەرێمێکی زەبەلاح پێکدێنن، یان چەند هەرێمێکی بچووک دروست دەکەن. لە میانی دانوستەکانی دەستوویدا، خەلیلزادو عارەبە سوننەکان هەوڵێکی زۆریان دا، بۆ ئەوەی نەهێڵن ژمارەی ئەو پارێزگایانەی کە یەک هەرێمی فیدراڵی پێک دێنن، لە چوار پارێزگا ڕەت بدا، بەڵام سەرنەکەوتن. بەڕێوەبەرایەتی بوش زۆر بەدرەنگەوە بە ئاگا هات و تێگەیشت کە دەبێ ستراتیژییەکی تایبەت بۆ تاووتوێکردنی دەرئەنجامەکانی داگیرکردنی ئێراقیّ ڕێک بخرێ، بەڵام کورژ کردنەوەی قەوارەی شیعەستان ئەنجامەکە زۆر ناگۆڕێ. هەرێمە شیعەکان لە چوارچێوەی کۆنفیدراڵییێکی شیعەدا هاریکاری یەکتری دەکەن. جگە لەمە، لە ئایندەشدا ئەگەر یەک هەرێمی شیعەی بەهێز هەبێ، لە پاشەڕۆژدا ئاسانتر دەتوانێ خۆی لە ئێرانێ دوور بخاتەوە، بەڵام ئەگەر چەند هەرێمێکی لاواز بن، بێگومان درەنگتر ئەمەیان بۆ بەسەر دەچێ.

دەستوور یاسایێکی تایبەتی هەیە بۆ ئەوەی ئەو ناکۆکییانەی کە تایبەتن بە زەویو

لە نێوان ئێراقییەکاندا هەیە، چارەسەر بکا: کێشەی کوردستان لە گەڵ سەرجەم ئێراقییەکان لە سەر کەرکوکی نەفتدارە. دەستوور بەندەکانی ناو یاسای بەڕێوەبردنی کاتی دووبارە کردەوە بۆ ئەوەی کوردە ڕاگوێزراوەکان بگەڕێنەوەو عارەبە داگیرکەرەکانیش ڕەوانی شوێنی خۆیان بکرێنەوەو سنوورەکانی پارێزگای کەرکووک وەک خۆی لێ بکرێتەوە. بەڵام دەستوورەکە وەک یاسای بەڕێوەبردنی کاتی نەکردو کۆتایی ٢٠٠٧ی دانا بۆ ئەوەی ڕیفرێندەمێک لە سەر کەرکووک بکرێ و کێشەکە ببڕێتەوە. بەڵام ئەو بەندانەی سەبارەت بە کەرکووک هەنە، سەربەخۆیان ناتوانن کێشەکە بە شێنەیی خاو بکەنەوە. عارەبە سوننەکان بە توندی بەربەرچی لەدەستدانی کەرکووک دەدەن و نایانەوێ ئەو شوێنەی کە بە میراتی خۆیانیانی دەزانن بە هیچ شێوەیێک لە دەستی بدەن و دەیانەوێ ئێراق هەموو لە میانی ڕیفرێندەمەکەی کەرکووک دەنگ بدا. بەم شێوەیە ڕەنگە ئەگەر عارەبی سوننە کەرکووک لەدەست بدەن کاردانەوەی توندی لە بەرانبەردا بکەن.

ڕیفرێندەم بۆ ناوەوەی کەرکووک پەسند نییە. چونکە لە کاتێکدا هیچ ئەنجامێک وەدەست نایێ کە بە هەموو لایەنەکان خۆش بێ، هێشتا دەشێ دڵی ئەو لایەنە بدرێتەوە کە دەدۆڕێنێ. کەرکووک پێویستی بە دابەشکردنێکی باشی دەسەڵاتی بەسەر کوردو عارەبو تورکمان و کەلدۆئاشووریانەوە هەیەو پێویستی بە ئۆتۆنۆمیش هەیە، جا ئەگەر لە ئەنجامدا بکەوێتە سەر کوردستان یان ئەگەر هەر لەگەڵ ئێراقی عارەبیدا بمێنێتەوە. ئەنجامی دەنگدانەکە هەرچییەک بی، وا باشە ئەوانەی کە ڕیفرێندەمەکە دەدۆڕێنن هەست بەوە نەکەن کە گۆڕانکارییەکی سەرەکی لە چۆنیەتی بەڕێوەچوونی پارێزگایەکەیان بەدی هاتووە.

ئەگەر بەندەکانی ناو دەستووری سەبارەت بەکەرکووک، بە ڕاستی پیادە بکرێن، دەستکەوتێکی بێ ئەندازەیان دەبێ. دەتوانن ئەو کێشەیە چارەسەر بکەن کە هەشتا ساڵە لە ئێراقێ، ناکۆکی لە نێوان کوردو عارەب پەیدا کردووە. ئەو هەنگاوانەی لە کەرکووک دەهاوێشترێن، دەکرێ لە شوێنەکانی تریش بهاوێژرێن کە کورد داوایان دەکاتەوەو بە فەرمی نەخراونەتەوە سەر کوردستان. خانەقین، لە باشووری سلێمانی و مەخمور، لە ڕۆژئاوای هەولێر، هەموویان کوردن و وا پێدەچی هەموو لایەنەکانیش،

گەڕانەوەیان بۆ ناو کوردستان پەسند بکەن. گرووپەکانی تر پێش لە خواستی کورد دەگرن و سەبارەت بە شنگاڵ، لە نزیکی سنووری سووریاو شوێنەکانی تری پارێزگای میسل، ململانێیان لەگەڵ کورد هەیە. ڕەنگە ئەمانە ببنە هۆی هەڵچوونی ناوچەکە. بەڵام ئێستا لەبەر ڕێکوپێکی پارتە سیاسی و کارامەیی حکومەتی هەرێمی کوردستان و پێشمەرگەیە کە کوردەکان لەو ناکۆکییانەی کە لەگەڵ عارەبە ئێراقییەکان هەیانە هەمیشە باڵا دەستن. دەبێ وریا بن و لە مەترسی زێدەڕۆیی تێبگەن.

لەوڵاتێکی وەکو ئێراق کە تەنیا یەک سەرچاوەی هەیە، نۆیڵ دەسەڵاتە. هەرچەندە بەڕێوەبەرایەتی بوش بە هەمــوو توانای خــۆی هەوڵی دا بۆ ئەوەی نەفت لە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی ناوەندی بمێنێتەوە، بەڵام هەرگیز کەس لە سەر ئەم ڕایە کۆک نەبووەو نابن. مەسعود بارزانی و ئەنجومەنی نیشتمانی کوردستان گوتیان کە هیچ لەو دەستووره باشتر نییە کە دەرامەتی وڵات هەمووی لەبەر دەستی حکومەتی ناوەندی دابنێ. بەڵام چونکە لە باشوور نەوت زۆرەو شیعەکانیش دەیانویست نۆیڵی ناوچەی خۆیان کۆنترۆڵ بکەن. بۆیێ ڕێککەوتنێکی مامناوەندی "نەوتی کۆن، نەوتی نوێ" کرا. بەپێی ئەم ڕێکخستنە، حکومەتی ناوەندی داهاتی ئەو کێڵگانە کۆدەکاتەوە کە ئێستا لەکارن و دابەشیان دەکا. هەرێمەکانیش لە ئایندەدا کێڵگە تازەکان بەڕێوە دەبەن و قازانجەکانیشیان بۆ خۆیان دەبێ و بەم پێیەی دەستوور ڕێکی خستووە بۆ چەند دەیە ساڵێکی ئایندە ئەو بەرهەمە بە یەکسانی دابەش دەکرێ. پاش چەندین ساڵی دیکە، کە ئەم چاڵەوتانەی ئێستا وشک دەکەن و ئەوانەی هەرێمەکان بە تەنیا بەرهەمیان دەمێنێ، ئەو کات قازانجەکە هەر بۆ هەرێمەکان دەمێنێتەوە. بەڵام، بە گوێرەی ئەوەی کە کێڵگەکانی نەوتی کەرکووک لە ١٩٢٤ دەستیان بەبەرهەمدان کردووەو تائێستاش ئەو کۆگا زەبەللاحانەی ئێراقێ هێشتا دەیان بلیۆن بەرمیل نەوتیان تێدا ماوە، بەو پێیە، تا ماوەیێکی دوورو درێژ ئەو هەرێمانە هەر بێ نەوت نابن. لە کاتێکدا کە زۆربەی نەوتەکە لە باشوورو باکووری ئێراقێ دەهێندرێتە بەرهەم، هەر سێ کۆمەڵی ئێراقی خاکی ئاوایان هەیە کە هێشتا فرە بیری لێ ڕەچاو دەکرێ. ڕەنگە بەغدا بۆ خۆی لەسەر قوڕگی گۆمێکی گەورەی پڕ نەوت

دانیشتبێ، کە هێشتا نەدۆزراوەتەوە. تا بەندەکانی دەستوور جێبەجێ بکرێن، عارەبی سوننە پێویست ناکا لەوە بترسێن کە سەرچاوەی داراییان نەمێنێ. لەگەڵ هەندێش، لایەنێکی ئەو رێککەوتنە تازەیە زۆر گرینگە. لەبری ئەوەی کە عارەبی سوننە بەشێکی داهاتی نەوت بۆ باکوورو باشوور بنێرن (بەشە زۆرەکەشی بۆخۆیان بهێڵنەوە)، ئێستا کوردو شیعە چێکی پارەی خۆیانی لێ دەبڕن.

هەروەها دەستوور ململانێی سەر دەسەڵات و دەستڕۆیشتن لە بەغدا دەبڕێنێتەوە. لە ١٩٢٠ڕا عارەبی سوننە لووتکەی دەسەڵاتی ئێراقییان بەدەستەوە بووە؛ زۆربەی ژەنراڵەکانی سوپای ئێراقێ ئەوان بوون، زۆربەی باڵیۆزەکان خۆیان بوون، باشترین پۆستە ڕاژەگوزارییە سیڤیلییەکانیان بۆ خۆیان هەموار کردبوو. لە ڕاستیدا، جەلال تاڵەبانی یەکەم سوننەی ناعارەبە کە پۆستی سەرۆک وەردەگرێ. دەستوور دەخوازێ کە سەرۆک کۆمارو سەرۆک وەزیران و ئەندامانی ئەنجومەنی وەزیران و دادوەرەکان زۆرینەی هەرە زۆری دەنگ وەدەست بێنن بۆ ئەوەی پۆستەکانیان وەربگرن، ئەمەش بۆ ئەوەیە دەسەڵات لە نێوان هەرسێ پێکهاتەی ئێراقێ بە چاکی دابەش بکرێ. لەوەش گرینگتر ئەوەیە کە دابەشکردنی دەسەڵاتو نەهێشتنی لە ناوەند، ململانێی نێوان کوردو عارەبی شیعەو عارەبی سوننە کەم دەکاتەوە؛ چونکە چ نابێ شەڕی لەسەر بکەن.

دەستوور هیچ چارەسەرییەکی کێشەی بەغدای پێ نییە. بەغدا ٦٠/٤٠ لە سەدای شیعەو سوننەیەو (ئەم خەمڵاندنەش ڕەنگە زۆر ورد نەبێ چونکە ژمارەیێکی زۆری کەمینەی کوردو دیانەکان ناگرێتەوە)و بەرەی هەرە پێشەوەی شەڕی ناوخۆی ئێراقییە. بە پێی دەستوور ڕەنگە بەغدا پەیوەندی بە هیچ هەرێمێک نەکاو بۆ خۆی تەنیا هەرێمێک ڕێک بخا. ئەستەمە ڕێگەچارەیێک هەبێ کە کێشەی دابەشبوونی ڕێبازگەری ئەو پایتەختە هەرە ترسناکەی دونیای پێ چارەسەر بکرێ.

هەروەها دەستوورەکە پەیمانێکی نیشتمانی نییە. چونکە شیعەو کورد دایانناوەو عارەبی سوننەی تێدا نییە. وەک پێشان گوتم هیچ ڕێگەچارەیێکی لەبەر نەبوو. تەنیا ئەوە نەبوو کە عارەبی سوننە بۆیکۆتی ئەو هەڵبژاردنەیان کرد کە ئەو ئەنجومەنەی لێکەوتەوەو ئەنجومەنەکەش ئەو دەستوورەی نووسییەوە، بەڵکو ئەو عارەبە سوننانە

هەڵوێستی ئاوایان هەبوو کە بە هەموو شێوەیێک لە دژی شیعەو کورد بوو. بە کورتی، ئەوەی عارەبی سوننە دەیانویست ئەوەبوو کە هیچ نەدەنە شیعەو کورد کە دەیانویست. بەم پێیە نەکرا هیچ خاڵێکی هاوبەش لە نێوانیاندا بدۆزرێتەوە. بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا، ئەم دەستوورە ئەو چارەسەرەیە کە ئێراقییەکان بۆ گرفتەکانی خۆیان نووسیویانەتەوە. کوردو شیعە گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کە ئێراق ناکرێ وەک دەوڵەتێکی یەکبوو کار بکا، بۆیێ وێکڕا کاریان کرد تا بە شێوەیێکی ئاشتییانە بەشی بکەن. عارەبی سوننە نکوڵییان کردو پشکداری پرۆسەکەیان نەکرد بەڵام کوردو شیعە شوێنی بەتاڵیان بۆ هێشتنەوە. عارەبی سوننە هەموو ئەو مافانەیان هەیە کە کوردو شیعە هەیانەو ئەمەش ئەنجامێکی دیارو شەرمەنەندە کە لە هەموو مێژووی ئێراقیدا باسی دەمێنێتەوە.

ڕێفرێندەمی دەستووری ئێراقیّ لە ١٥ ئۆکتۆبەری ٢٠٠٥دا کراو هەڵبژارنی ئەنجومەنی نیشتمانی کە ناوی تازەی پەرلەمانە، دوای دوو مانگ لە ١٥ دیسێمبەری ٢٠٠٥دا بەڕێوەچوو. ئەنجامی ئەو هەڵبژاردنەش دەری خست کە ئێراق چەند لەناو خۆیدا دابەش بووە. لە ڕیفرێندەمەکەی ئۆکتۆبەر، هەرسێ پارێزگایە کوردییەکە بە ڕێژەی ٩٩ لەسەد بە بەڵێ، دەستوورەکەیان پەسند کرد. ڕێژەی دەنگی بەڵێ لە نۆ پارێزگایەکەی باشوور لە نێوانی ٩٥ تا ٩٨ لەسەدا بوو. بە پێچەوانەی ئەوەشەوە، زۆرینەی دانیشتوانی پارێزگای سەلاحەددین بە ٨١ لە سەدای دەنگ و پارێزگای ئەنباریش کە هەمووی عارەبی سوننەنە، بە ٩٧ لە سەدای دەنگ لە دژی دەستوور دەنگی خۆیانیان دا. بەڵام چونکە ڕێژەی دانیشتوانی عارەبی سوننە لە پارێزگای نەینەوا بە شاری میسلیشەوە تەنیا ٦٠ لەسەدای سەرجەم ژمارەی دانیشتوانە، بۆیێ دەستوورەکە سەپا. نەینەوا بە ڕێژەی ٥٤ لە سەدا لە دژی دەستوور دەنگیان دا، ئەمەش لەو ڕێژەی دوو لە سێی پێویست کەمتر بوو بۆ ئەوەی لەگەڵ دوو پارێزگایەکەی تر هەرەس بە دەستوور بێنن(١٠٢).

لە هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی نمایندان کە لە دیسێمبەر کرا، بە ڕێژەی ٢

(١٠٢) ئەگەر سێ پارێزگا بە ڕێژەی دوو لە سێی دەنگی لە دژیان هەبا، ئەوا دەستوورەکەیان دەبەزاند، ئەمەش پێی دەگوترێ ڤیتۆی کوردی.

لەسەدا کەمتر کوردەکانی ئێراقیّ دەنگی خۆیانیان بە پارتە ناکوردییەکان دا، کەچی ١٥ لە سەدا کەمتر عارەبی سوننەو شیعە دەنگیان بە پارتە نا ڕێبازگەرەکان دا(١٠٣).

ئەوانەی ڕەخنە لەو دەستووورە دەگرن دەڵێن کە ڕێی پارچەبوونی ئەو وڵاتەی خۆش کردووە. بەڵام لە ڕاستیدا ڕەنگە ئەمە تاکە داو بێ کە بتوانێ ئەو وڵاتە بە یەکگرتوویی بهێڵێتەوە. کوردە ئێراقییەکان نایانەوێ بەشێک لە ئێراقیّ بن و زۆر ڕقیشیان لێیەتی. بەڵام دەزانن ئەگەر بۆ سەربەخۆیی بچن مەترسییان بۆ دەبێ، هەر بۆیێش ڕەنگە لە سەر ئەم سەربەخۆییە دیفاکتۆیەی خۆیان، بە پێی دەستوور، هەر بەردەوام بن. وەک ئەوەی سەرشێتییەکەی برێمەر بۆ دروستکردنەوەی وڵات دیاری خست؛ هەر گوشارێکی دەرەکی بۆ ئەوەی کە ئێراق یەک بمێنێ، داواکاری سەربەخۆیی پتر دەکا. کەسیش نابێ بۆ ماوەی دوورخایەنیش خۆی فریو بدا؛ چونکە هەر دەمێک کەش و هەوای نێودەوڵەتی ڕێگەی کوردستانێکی سەربەخۆ بدا، کورد یەکسەر جاڕی دەدەن.

خۆ ڕەنگە ئەو دابەشبوونە ڕێبازگەرییەی لە نێوانی عارەبی سوننەو شیعەدا هەیە هەر ئاوا بمێنێتەوەو چارە نەکرێ، چونکە دین هەرگیز هێندەی سیاسەت لە ئێراقی وەک ئێستا گرینگ نەبووە(١٠٤) و دەشێ لە ئایندەشدا ئەو سۆنگەیەی بێتەوە. هەر لەمێژەوەڕا ئیلیتی پیشەوەرو کارگوزارو بیوروٚکراتی ئێراقی هەر سێکولار بووینەو هێندە عیلمانی بووینە کە زۆران هەن کەس نازانێ ئایا شیعەن یان سوننەنە. هەرگیز بایەخیان بەمە نەداوەو نەیانتوانیوە بزانن بۆچ ببیبە ئەم یان ئەو گرینگە. دێمۆکراتی لە ئێراقیّ هاوسۆزی زۆر هەبووە، تەنانەت شیعەکانیش پشتیوانی دێموٚکراسییان کردووەو ڕەنگە دیسان بێنەوە سەر ڕێ، یان ڕەنگیشە هەر نێنەوە.

لە ئەنجامی ئەو شەڕە مەزهبگەرییەی ئێستا، شیعەو سوننە هێشتا پتر لێک دەترازێن. فێدراڵییەت، وا دەکا هەر کۆمەڵە ئێراقییەک بە شێنەیی نەریت و دەزگا کۆمەڵایەتییەکەی خۆی بەڕێوە ببا، بێی ئەوەی کەس هەڕەشەی لێ بکا. بەم جۆرە، شیعە دەتوانن سستمی ئێران ئاسای خۆیانیان هەبێ، بەڵام هەر لەو ناوچانەی کە

---

(١٠٣) پاشکۆی ژمارە ٢ پاراوتر ئەنجامەکانی هەڵبژاردن تەتڵە دەکا.

(١٠٤) بە پێچەوانەوە، نیشتمانپەروەری هەمیشە باڵادەستی سیاسەتی کوردستان بووە.

شیعەی لێ هەیە. کە عارەبە سوننەکانیش ئەو دەوڵەتە فیدرالییەی خۆیان دەبێ سەرکردەکانیان دەتوانن قۆڵیان لە خزمەتکردنی کۆمەڵگەکەیان هەڵواسن و خەمی بەرهەڵستکاری نەخۆن. حکومەتێکی سوننەی عارەبی جا بەعسییە تازەکان بن یان ئیسلامی بن دەتوانن قۆڵیان لە چەتەکان هەڵماڵن و لەناویان ببەن.

بە بۆچوونی ئەمێریکی ئەمانە هیچیان پەسند نینە. ئەگەر ئەمێریکییەکان دەیانزانی ئەنجامی داگیرکردنی ئێراقێک کە کەمێک چەکی کۆمەڵکوژی هەبوو دەبووە هۆی ئەوەی کە نیوەی ئەو وڵاتە ببێتە ساتێلایتێکی ئێرانی و حکومەتێکی دینی لێی دەسەڵاتدار بێ؛ کەمتر پشتیوانی ئەو داگیرکردنەیان دەکرد. بەڵام ئەم ئەنجامە لەوە باشترە کە حکومەتێکی ناوەندی وەتۆ هەبێ کە ببێتە هاوپەیمانی تاران و هەوڵ بدا دەسەڵاتێکی ئایینی شیعی بەسەر ئێراقیدا بسەپێنێ. بە پێی ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی دیسێمبەر، ئەگەری ئەوەش هەیە کە عارەبە سوننەکانیش ئیسلامییەکان هەڵبژێرن، ئەگەر هەڵبژاردنی بەعسییە تازەکانیش لە ئارادا هەیە، بەڵام لە ئیسلامییەکان کەمترە. ئەوەش مسۆگەر نییە کە حکومەتێکی عارەبی سوننە دەتوانی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی خۆی کۆنترۆڵ بکا، یان بیەوێ بەڕاستی یاخییەکان پەلبەست بکا. هێشتا هەر ئەو حکومەتە هەڵبژاردراوەی کە هێزی چەکداری خۆی بۆ سەپاندنی ئاسایش بەکاردێنی لەوە باشترە کە عارەبە شیعەکان لە ناوچەکانی عارەبە سوننەکان دا دەیکەن و ئەوانیش هێزی نامۆی حکومەتی خائنی بەغدایان پێ بێژن.

ڕەنگە چارەسەری کردنی ئێراق بە سێ ویلایەت، ببێتە هۆی ئەوەی کە دەوڵەتەکە نەتوێتەوە. هیچ بیانوویێک نییە بۆ ئەوەی خەم لە نەمانی ئێراقێ بخۆین. چونکە ئێراق هەمیشە ٨٠ لەسەدی سەرجەم دانیشتوانە ناعارەبە سوننەکەی خۆی دڵتەنگ کردووەو چەرمەسەری پێ کردوونەو بەبێی بەکارهێنانی هێز ناکرێ بە یەکگرتوویی بمێنێتەوە. گومان لەوەدا نەماوە سەربەخۆیی کوردستان تەنیا بە کاتەوە پابەندە. وەک بابەتێکی ئەخلاقی، کوردە ئێراقییەکان هیچیان لە لیتوانی و کرواتی و فەلەستینییەکان کەم نییەو ئەوانیش شایانی سەربەخۆیی خۆیانن. ئەگەر عارەبە شیعە ئێراقییەکانیش ویستیان بەخۆیان فەرمانی خۆیان بگێڕن، ئایا هیچ

بنەمایێکی دیمۆکراسی هەیە کە ڕێگەیان لێ بگرێ؟ ئەگەر نرخی مانەوەی یەکگرتوویی ئێراقیش دکتاتۆرێکی تر بێ، ئەمە نرخێکی زۆر گرانە ئەگەر بیدەین.

سیاسەتسازە ئەمێریکییەکان، وەک چۆن دەیانویست یەکێتی وڵاتانی یەکێتی سۆڤیەت و یۆگۆزلاڤیا بپارێزن، ئێستاش بە شێوەیێکی پێچەوانەوە پابەندی یەکێتی خاکی ئێراقن. وەڵامی تەقلیدی هەر مشتومڕێکی سەبارەت بە پارچەکردنی ئێراقێ بکرێ، ئەوەیە کە ناسەقامگیری بەرپا دەکا. ئەمە خوێندنەوەیێکی بە هەڵەی مێژووی تازەی ئێراقییە. هێشتنەوەی ئێراق بە یەکگرتوویی بە زەبری هێز، هەمیشە هۆی ناسەقامگیری بووەو لەشکری زەبەلاح و حکومەتی سەرکوتکارو بەفیڕۆدانی دەرامەتی نۆیڵ و کردەی جینۆسایدی ناوخۆیی و پەلاماردانی دەرەکیشی لێ کەوتۆتەوە. ئەمڕۆش، ئەو هەرەسەی ئەمێریکا لە بواری بنیاتنانەوەی ئێراقێکی یەکگرتووی دیمۆکراتیدا تووشی هاتووە، بووەتە هۆی چەتەگەرییەکی توندو حکومەتی دینی شیعانیشی لێ دروست بووە.

لە میانی بانگهێشتەی هەڵبژاردنی ۲۰۰۰دا، جۆرج و. بوش دەربارەی ئەوە دوا کە ئەمێریکا پێویستە بە نەرمی لەگەڵ هەموو دونیا هەڵسوکەوت بکا. بەڵام کە چووینە ئێراق بە فیزەوە چووین و باوەڕمان وابوو کە دەتوانین دەوڵەتێکی پڕ بە کراسی خۆمان دروست بکەینەوە. هەرەسێکی گەورەمان هێنا. بۆیێ پێویستە ئێستا ئەوە بکەین کە دەبوو هەر لە سەرەتاوەڕا بمانکردایە - ڕیزی ئارەزووی خەڵکی ئێراقێ بگرین. ئەوان گوتوویانە، لەناو بترازێ ئەم وڵاتە نابێ یەک بێ. چارەسەری سێ دەوڵەتییان ڕێکخستووەو لەناو دەستووریان سەپاندووەو ڕێژەی ۸۰ لەسەدی دانیشتوانی دەنگیان بۆی داوە. ڕاستە کە عارەبە سوننەکان دەستوورەکەیان نەویستووە، بەڵام لەبری ئەوەدا چ هەیە؟ ئەو دەستوورەی عارەبی سوننە پەسندی دەکەن ۸۰ لەسەدی دانیشتوان ماندەلی دەکەن.

پێویستە وڵاتە یەکگرتووەکان ئێستا وابکا کە ڕێکخستنە سیاسییە تازەکەی ئێراقێ کار بکاو هەوڵی نەزۆک نەدا بۆ ئەوەی لەکاری بخا. واتا دەبێ یارمەتی هەرێمەکانی ئێراقێ بدرێ بۆ ئەوەی کاروباری خۆیان پێش بخەن و هێزی ئاسایشی خۆیان توکمەترو لەشکرەکانیشیان ئامادەتر بکەن. ئەمە لە بەرژەوەندی ئێمە دایە.

کە هەرێمەکانی ئێراقی سەقامگیر دەبن، لەشکری وڵاتە یەککگرتووەکان و هاوپەیمانان دەتوانن بکشێنەوە. ئەگەر گەلێک یان پتر لە گەلێکی ئێراقی ویستی جودا بێتەوە، دەبێ ئێمە ئەو ڕێگەیەی بۆ خۆش بکەین تا بە شێنەییەوە لێی دەربچێ. کە دەوڵەتان پارچە دەبن، وەک ئەوەی لە یەکێتی سۆڤیەت و لە چێکۆسلۆڤاکیا ڕووی دا، شەڕی ناوخۆ چارە دەکرێ. لە یۆگۆزلاڤیاش، لە ١٩٩١، وڵاتە یەککگرتووەکان و یەکێتی ئەورووپا، هەموو توانای خۆیان خستە گەڕ بۆ ئەوەی ئەو وڵاتە بە یەککگرتوویی بهێڵنەوە، کەچی پێویست بوو هەوڵی ئەوە بدەن کە نەهێڵن شەڕی سیڤیل ڕووبدا. لە شەڕێکدا کە دەشیا بە سیاسەتێکی ڕاستەقینەترەوە ڕێگەی لێ بگیرێ، دوو سەد هەزار کەس مردن. نابێ هەمان هەڵە لە ئێراقێدا دووبارە ببێتەوە، چونکە ئێراق ئێستا لە ناو شەڕی ناوخۆدا دەژی.

# بەشی ١١

## چۆن لە ئێراقێ دەربچین

لە ١٩ی ئاداری ٢٠٠٦، کە سێیەم ساڵیادی دەستپێکی شەڕی ئێراقێ بوو، وەزیری بەرگری ڕەمسفیڵد گوتارێکی بۆ واشنتن پۆست نووسی. ڕەمسفیڵد، وەک هەمیشەی خۆی باسی بەدەستهێنانی پێشکەوتنی کردو گوتی: دەزگاکانی ئاسایشی ئێراقێ بەهێزن و دیمۆکراسیش بەرەو پێشەوە دەچێ. تەنانەت تەقاندنەوەی مزگەوتی عەسکەریش کە لە ٢٢ی شوبات ڕوویدا، نیشانی دا کە "زۆرینەی ئێراقییەکان دەیانەوێ وڵاتەکەیان بە یەکگرتوویی بمێنێتەوەو لە ململانێی ئیتنییەوە دوور بێ[١٠٥]." پاشان بە شێوەیێکی سەرسوڕهێنەر دەڵێ: "ئەگەر ئێمە ئێستا بکشێینەوە، زۆر هۆ هەیە دەهێنێتە سەر ئەو باوڕە کە سەددامی و تیرۆریستەکان بۆشاییەکە پڕ دەکەنەوە. ئەگەر لە دوای شەڕ پشت لە ئێراقێ بکەین، وەک ئەوەیە کە لە دوای جەرمەنستانمان تەسلیمی دەستی نازییەکان بکردایەوە[١٠٦]."

---

(١٠٥) بۆ ئەوەی قسەکەی خۆی بسەلمێنێ، ڕەمسفیڵد نووسی کە: "سەرکردە ئێراقییەکانی پارتە سیاسییە جیاوازەکان و گرووپە ئاینییەکان هەموو توندوتیژییان ڕیسوا کردو داوایان کرد ئارامی بپارێزن." و گوتیشی کە: "هێزە ئێراقییەکان بە خۆیان نە هێزێن وڵاتە یەکگرتووەکان نە لەشکرێن هاوپەیمانان بوو کە لە دوای پەلاماردانی گڵکۆ زێڕینەکەی سامەڕا، هاتووچۆی قەدەغە کردو نەیهێشت توندو تیژی ببێ." بە نیازەوە ئەو ڕاستییە پشتگوێ دەخا کە ئەو کەسەی داوای ئارامبوونەوەی کرد موقتەدا سەدر بوو، کە سەرکردەی سوپای مەهدییەو ئەو سوپایەش لە زۆربەی توندی و تیژی و دەستدرێژییەکانی لە دوای تەقاندنەوەی سامەڕا کرانە سەر عارەبە سوننەکان بەرپرسیارە. لە هەمان کاتیشدا ئەوەش پشتگوێ دەخا کە پۆلیسی ئێراقێ و کۆماندۆزە شیعەکان قەدەغەکردنی هاتووچۆیان بەهەل زانی و هەندێ پەلامارو تیمەکانی مردنیان لە پەنای خۆیانەوە ناردو چەندین عارەبی سوننەیان کوشت.

(١٠٦) ئامە جەخت کراوەتەوە.

چونکە وڵاتە یەکگرتووەکان دوای سێ ساڵ لە داگیر کردنی ئێراقێ هێشتا هەر بە هەمان ژمارەی ئەو سەربازانە شەڕ دەکا کە وڵاتەکەی پێ داگیرکرد، بۆیێ ڕەچاوی ئەوە لە وەزیری بەرگری دەکرا کە قسەی ڕاستمان بۆ بکاو بڵێ کە هێزەکانی ئاسایشی ئێراقێ فاکتەرێکی سەرەکی بەرپا بوونی شەڕی ناوخۆو لە یەکتر ترازانی پتری ئێتن و کۆمەڵگە جیاکانی ئێراقێنە لەوەی کە سیاسەتوانە ئێراقییەکانی باسی لێوە دەکەن. لە لایێکی ترەوەش کشانەوەی ئەمێریکا بەو شێوەیە نییە کە ڕەمسفیلد باسی کرد. چونکە هیچ ئەگەرێک نییە دووبارە بەعسییەکان دووبارە دەسەڵات وەربگرنەوە. بەر لەوەی بەڕێوەبەرایەتی بتوانێ بێتە ئاستی گەلی ئەمێریکا، پێویستییەتی کە ئازابێ و لە ڕاستی لانەدا.

چارەسەرییەکی گونجاو نییە بۆ ئەو ئاژاوەیەی کە لە ئێراقێدا هەیە. ئەم وڵاتە پارچە بووەو ئێستا ژانی شەڕی ناوخۆی لێیە. ئەگەر بشگەڕێتەوە بۆ سەر بارودۆخی جارانی، دەشێ چەند بەشێکی وڵاتەکە ئارام بێتەوەو شەڕەکەی ناوخۆش ڕابگیرێ. بەڵام پێویستە وڵاتە یەکگرتووەکان دەستوبردی بۆ بکا. تا وڵاتە یەکگرتووەکان لە ئێراقێ بمێنێو هەوڵ بدا کە ئامانجی نا پەسند جێبەجێ بکا، بەڕێوەبەرایێتی نە دەتوانی بە چاکی سەرکردایەتی وڵات بکاتو نە دەشتوانێ ئاسایشی ئەمێریکا مسۆگەر بکاو نەهێڵی ئێران چەکی ناووکی بەدەست بێنێ و هەڕەشەی بەردەوامی القاعدەش ببڕێنێتەوە.

لە سەرەتای ٢٠٠٦، بەڕێوەبەرایەتی هەموو کۆششێکی دیپلۆماتی خۆی خستە گەڕ بۆ ئەوەی حکومەتێکی یەکێتی نیشتمانی لە شیعەو سوننەو کوردو سێکولارەکان پێک بێنێ. چونکە هاوپەیمانی یەکگرتووی ئێراقی گەورەترین بلۆکی ناو پەرلەمان بوو، بۆیێ مافی ناونیشانکردنی سەرۆکی وەزیرانی هەبوو. بەڕێوەبەرایەتی عادل عبد المهدی ئەندامی ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی لە ئێراقێی لەلا پەسند بوو. عبد المهدی ئابووریناسێکە لە فەرەنسا خوێندی خۆی تەواو کردووەو کابرایەکی مەیلەو لیبراڵە (سەیر ئەوە کە برێمەر لە ٢٠٠٤ ڤیتۆی داو نەیەێشت پۆستی سەرۆک وەزیران وەربگرێ.) کوردەکانی ناو ئەنجومەنی نوێنەران عبدالمهدیان زۆر خۆشدەویست و لە کن سوننەکانیش ناپەسند نەبوو. لە ١٢ی شوبات،

پەرلەمانتارەکانی هاوپەیمانی یەکگرتووی ئێراقی لە ماڵە بەسەنگەر کراوەکەی عبد العزیز الحکیمی قەراخی ڕووباری دجلە لە بەغدا، کۆبوونەوەو بە ٦٤ دەنگ بەرانبەر بە ٦٣ دەنگ ئیبراهیم جەعفەری سەرۆک وەزیرانیان بە سەر عبدالمهدی پەسند کردو دووبارە بۆ پۆستەکە هەڵیانبژاردەوە. موقتەدا سەدر کە سی ئەندامی لە ناو لیستەکەدا هەبوو بە توندی پشتیوانی جەعفەری کرد. ئەویش لە حیزبی دەعوە سی ئەندامی خۆی هەبوو بە هەردوو لا جەعفەری شێست دەنگی هێنا. دەڵێن موقتەدا چەند ئەندامێکی لەوانەی دەنگەکانی خۆیانیان هەڵپەساردبوو ترساندو ناچاری کردن کە ئەوانیش دەنگی خۆیان لە سەر تای تەرازووی جەعفەری دابنێن و بەم چەشنە بارەکەی بەلای ئەو داگرت و سەری خست.

هەرچەندە کە هاوپەیمانی یەکگرتووی ئێراقی نزیکەی زۆرینەی بێ هاوتای لە پەرلەمانێدا هەبوو، بەڵام چونکە دەستوو دەڵێ کە هەرسێ ئەندامەکەی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی (لە سەرۆک کۆمارو دوو جێگری پێکهاتووە) دەبێ بە تێکڕای دەنگ سەرۆک وەزیران ناونیشان بکەن و ئەمەش مافی ڤیتۆی بە کوردو بە عارەبە سوننەکان دەدا بۆ ئەوەی ڤیتۆی هەڵبژاردەیان بکەن[١٠٧]. تاڵەبانی سەردەفتەری ئەوانە بوو کە

بەرهەڵستی جەعفەری کردو دوو بلۆکی عارەبە سوننەکانیش لایان گرت. خلیلزادیش بەرهەڵستی کردنی جەعفەری هان دا، چونکە بەڕێوەبەرایێتی بە کابرایێکی جودا کاری ناکاریگەرو زۆر نزیک لە موقتەدا سەدری دەناسی. ئەنجامی ئەم بەرهەڵستکارییە پرۆسەکەی بەربەست کرد. تا جەعفەری مکوڕ بوو لە سەر ئەوەی کە بە دەستنیشانکراوی هاوپەیمانی یەکگرتووی ئێراقی بمێنێتەوە، شیعەکان نەیانویست بیگۆڕن، چونکە لەوە دەترسان کە گۆڕینی جەعفەری دەرەز بە هاوپەیمانەتییەکەیان بگەیەنێ. ئەو گەڕەلاوژەی لە سەر سەرۆک وەزیران پەیدا بوو،

---

(١٠٧) بە پێی دەستوور دەبێ ئەنجومەنی سەرۆکایەتی بە دوو لە سێی دەنگ هەڵبژێردرێ، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە هەر حکومەتێک دەبێ دوو لە سێی هەموو دەنگەکانی هەبێ تا پێک بێ. هەرچەندە لە دەستووردا باس نەکراوە بەڵام لێی تێدەگەی کە یەکێک لە ئەندامەکانی ئەنجومەنەکە دەبێ کورد بێ و یەکیان شیعەو سێیەمیشیان دەبێ سوننە بێ.

(له كۆبوونەوەی كورت بترازێ) كه كارمەندو ئەنجومەنی سەرۆكایەتی هەڵبژارد، چیتر نەیهێشت ئەنجومەنی نوێنەران كۆ ببێتەوە. له سەرەتای نیسان وەزیری دەرەوە كۆندۆلیزا ڕایس و وەزیری دەرەوەی بریتانیا سەردانێكی ڕانەگەیەندراوی ئێراقیان كرد بۆ ئەوەی فشار بخەنە سەر لایەنەكان تا سەرۆك وەزیرانێك هەڵبژێرن. لایەنگرانی جەعفەری و (ژمارەیێك له دوژمنانی)و هەندێ له ڕەخنەگرانیش، وڵاته یەككگرتووەكان و بریتانیایان دەنگ دا، چونكه دەستیان له كاروباری ناوخۆی ئێراقێ وەرداو گوتیان سەردانەكەیان زیانی پتر بوو.

دوای پتر له چوار مانگ له هەڵبژاردنەكان و له ٢٠ی نیسانی، جەعفەری بڕیاری دا واز له ئۆفیسەكەی بێنێ. دەستبەرداربوونی جەعفەری له ئەنجامی ڕێككەوتنێك بوو كه جێگرەكەی بۆ سەرۆكایەتی ئەنجومەنی وەزیران دەستنیشان بكرێ. ئیتر گوتەبێژی هاوپەیمانی یەككگرتووی ئێراقێ نوری المالكیان بۆ پۆستی سەرۆك وەزیران هەڵبژارد. سەرۆك بوش بەپەله دەستخۆشی لەو هەڵبژاردنە كرد و گوتی: "گەلی ئێراقێ ئەو هەوڵانەیان پووچەڵ كردەوە كه تیرۆریستان بۆ پارچەكردنیان دەیانداو ڕێگەی یەكبوونی نیشتمانەكەیان هەڵبژارد." له ڕاستیدا بەڕێوەبەرایەتی بوش فرێ له دەربارەی مالكی نەدەزانی، تەنانەت نەیاندەزانی ناوی یەكەمیشی چ بوو. (دپلۆماتەكانی وڵاته یەككگرتووەكان وایاندەزانی ناوه نهێنییەكەی، جەواد، ناوی ڕاستی خۆی بوو.) وەزارەتی دەرەوەش لەو پلانەی بۆ سەردانەكەی وەزیری ڕێكی خستبوو، هیچ بایەخێكی پێی نەدابوو، چونكه نەیدەزانی كابرایێكی هێنده گرینگه و دەبوو بیخاته سەر ڕیزبەندی ئەو سیاسییانەی كه وەزیر كۆبوونەوەیان لەگەڵدا دەكا. مالكیش وەك هەموو سەركردەكانی دەعوە، زۆربەی ژیانی خۆی له هەندەران بەسەر بردووە. بەڵام وەك جەعفەری نەبوو له لەندەن بژێ و فێری زمانی ئینگلیسی ببێ، بەڵكو هەر له ئێران بووەو پاشان ڕووی له سوریا كردووە. كاتێك كه بریكاری سەرۆكی كۆمیتەی نووسینەوەی دەستوور بوو[١٠٨]، ناوبانگی بەوە دەركرد كه دەهاته

(١٠٩) له ئابی ٢٠٠٥ كۆمیته كۆبووەوە پاشان سەركرده سیاسییەكان جێی كۆمیتەی نووسینەوەی دەستووریان گرتەوەو ڕۆڵی سەرەكییان له خاوكردنەوەی كێشه دەستوورییەكان گێڕا.

سەر بابەتی نەهێشتنی بەعسییان چارەسەری مامناوەندی لەگەڵ عارەبە سوننەکانی لەکن پەسند نەدەکردو لە کورد و لە ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی پتر پشتیوانی حکومەتێکی ناوەندی بەهێزی دەکرد. مالکی شارەزایی لە حکومەتدا نەبوو، هەرگیز سەرکردایەتی بزووتنەوەیێکی سیاسی گەورەشی نەکردووە. بەڵام ئەو بەشان و شەوکەت هەڵدانە خێرایەی وڵاتە یەکگرتووەکان و ئەو فشارەی کە ئەمێریکا بەمەبەستی پێکهێنانی حکومەت دەیکرد جا هەر حکومەتێک بێ هەردوو لایەنە سیاسییەکەی تری ناچار کرد دەستیان لە ناو دەستی مالیکی دابنێن.

دوای ئەوەی لە سەر مالکی ڕێککەوتن، ئینجا لە ٢٢ی نیسان ئەنجومەنی نوێنەران، بە مەبەستی ناونانی سەرۆک کۆمارە هەردوو جێگرەکان و سەرۆکی پەرلەمانی کۆ بووەوە. تاڵەبانی دووبارە بەسەرۆک هەڵبژاردراوەو عادل عبد المهدیش هەر بە جێگری سەرۆک ماوە. چونکە سەرۆک کۆمار کوردو سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران عارەبی شیعە بوو، بۆیێ دەبوو سەرۆکی ئەنجومەنی نوێنەران عارەبی سوننە بێ. عارەبی سوننە لە سەرەتادا دەیانویست طارق الهاشمی سەرۆکی حیزبی ئیسلامی ئێراقێ ئەو کونە پڕ بکاتەوە، بەڵام کوردو شیعە لە ڕێگەی ڕاوەستان و گوتیان کابرایێکی زۆر توندڕۆ بوو. لەبری ئەوە هاشمی پۆستی جێگری سەرۆکی وەرگرت؛ چونکە لەوێ دەتوانێ هەر یاسایێکی سەرۆکایەتی ڤیتۆ بکاو واژوو کردنی هەر تەشریعێک ڕاگرێ و نەهێڵێ ببێتە قانون (هەر سێ ئەندامی ئەنجومەنی سەرۆکایەتی دەبێ یەک دەنگبن) جا عارەبە سوننەکان محمود المشهدانییان بۆ سەرۆکایەتی ئەنجومەنی نوێنەران ناو لێنا. لەمیانی گوتارەکەی لەپێش ئەنجومەنی نوێنەران و لە دوای هەڵبژاردنییەوە، محمود المشهدانی هوشیاری دا، گوتی: "یەکێتی ئێراقێ ئەرکی هەمووومانە. هەر دەستێک یان هەر زمانێک کە ئەم یەکێتییە بە خراپەکاری ئازار بدا، شایستەیە قوت بکرێ." محمود عوسمان کە سەرکردەیێکی دێرینی کوردەو زۆرجاران وەک گوتەبێژی لایەنی کوردی قسە دەکا، گوتارەکەی بە "ترسناک،" پێناسە کرد.

حکومەتی یەکێتی نیشتمانی ئێراقی، وەک ناوەکەی نییە. ئاخر لەو سەرکردانە پێکهاتووە کە ئامانجەکانیان دژی یەکترن و لە ناو هەمووشیان تەنیا تاڵەبانی و مەهدی ئەزموونیان لە حوکمڕانیدا هەیەو سەلماندیشیانە کە توانای چارەسەرکردنی

یەکلاکەرەوەیان هەبووە، ئەمەش بۆ بڕیاردان لە ئێراقیّ زۆر گرینگە. ئەوانیتر زۆربەیان بەتوندڕۆیی ناوبانگیان هەیە. پێناچیّ کە حکومەتی ئێراقیّ بەچاکی ڕێبکا. جا ئەگەر باشیش بەڕێوە بچیّ، خۆ هێشتا پرسیارێکی گونجاو هەیەو دەبیّ بکریّ: حکومەت حوکمی چ دەکا؟

کوردستان لە دەستی حکومەتیدا نییە. حکومەتی هەرێمی کوردستان لە سەر ڕاهێنانی دەسەڵاتی دەستووری خۆی مکوڕە، تا فەرمانداری هەرێم بکا. وەزیرەکانی بەغدا تەنانەت ڕێگەی ئەوەشیان پیّ نەدراوە تا ئۆفیسیش لە باکوور بکەنەوە.

شیعەی باشووریش لە ناو بازنەی حکومەتیدا نینە. باشوور بە هۆی ئەنجومەنەکانی شارەوانی و ئەنجومەنی پارێزگایەکان بەڕێوە دەچیّ. ئەمانەش هەمووی بندەستی مەلایەکانن، یان سەر بە حیزبە ئایینییەکان و یانیش ئەندامانی میلیشیایەکانن. لە باشوور دەسەڵاتی ڕاستەقینە لەبەر دەستی ئەو میلیشیایانە دایە. چونکە لە باشوور ڕیز نە لە دەستووری کاتی و نە لە دەستووری هەمیشەیی نەگیراوە، بۆیێ ئەو هەرێمە حکومەتێکی ئایینی بەڕێوەی دەباو میلیشیاو پۆلیسی دینی لە هەر ناوچەیێک بە شێوەیێک یاسای ئیسلامی پەیرەو دەکریّ، جا هەندێک بە نەرمی و هەندێکی تریش بە توندی یاسایەکە جێبەجیّ دەکەن. دەسەڵاتدارانی بەسرە، شێرەی نەوتی ئێراقییان بەدەستەوە گرتووە. بلیۆنەها دۆلار لە نێوان نەوتەژمێری بەسرەو نەوتەژمێری بەندەری سەر کەنداوی پارسی جیاوازی هەیە.

حکومەتی بەغدا خاکی سوننەکانیش حوکم ناکا. ئەو خاکە مەیدانی شەڕە. سوپای ئەمێریکی بە هاریکاری لەشکرەکانی شیعە ڕاوی چەتەو تیرۆریستە بیانییەکان دەنێن. زۆربەی عارەبە سوننەکان بێز لە هەردوو لایەنی ئەو شەڕە دەکەن. بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنیّ کە بە حکومەتێک قایل دەبن کە عارەبی شیعە بەڕێوەی ببا؛ چونکە ئەوان بە دەسەڵاتێکی دەزانن کە ئەمێریکییەکان سەپاندوویانەو دڵەلای ئێرانیشن.

باسی بەغداش مەکە، بەلای کەم باسی دەرەوەی گرین زۆونی مەکە. چونکە تەنانەت بەر لەو فرە ئاڵۆزبوونە ڕێبازگەرییەی پێش شوباتی ٢٠٠٦یش، پایتەختی ئێراقیّ ئۆردووگەیێکی پرچەک بوو. کۆنکریتی نۆ پیّ بڵند کە بە سەنگەرەکانی برێمەر ناسراون، دەوری تەلارو هۆتێل و ماڵی دەوڵەمەند و دەسەڵاتدارانی لە نێو

خۆدا گرتووە. ئێراقییە دەوڵەمەندەکان سوپای تایبەتی خۆیانیان هەیە بۆ ئەوەی بیانپارێزن.

وەزیرو گەورە کاربەدەستەکانی تری میری میلیشیایەکانی خۆیان بۆ پاراستن بەکار دێنن، یانیش هێزی پێشمەرگە لە کوردان دەخوازنەوە. تەنیا ملهوڕەکان بۆ پاراستنی خۆیان پشت بە پۆلیس یان سوپای ئێراقێ دەبەستن، ئەگەر هەر لە بنەڕەتدا بەخۆیان هانی پێشمەرگە یانیش میلیشیا نەبن بەرگی سوپاو پۆلیسی ئێراقێ دەپۆشن. لە دەرەوەی گرین زۆون و قەڵا سەربازییە تایبەتەکان نەبێ، ئەویتر، بەغدا بەهۆی تەقینەوەو تاوانی توندی و تیژییەوە هەر بۆخۆی دۆزەخێکە. کوشتارو ڕفاندن بۆ پارەو دزی بەزەبری چەک و ئابڕوو بردن، هەمووی لەبەر دەسەڵاتی بێدەسەڵاتی دەستی لە یاسا سەندووە.

کوشتن لە ترسناکترین شاری ئەم دونیایەدا، لە دوای ۲۲ی شوبات زۆرتر بووەو بێ نیشانەو دڵڕەقانەتریش ئەنجام دەدرێ. لە دەرەنگێکی ئادار بوو کە چوار تەرمی هەرزەکاران لە العدل، کە گەڕەکە سەنگەرێکی عارەبی سوننەیە، فرێدرابوون. بە گوێرەی سەندێی تێلیگراف، هەر تەرمێک و ناسنامەکەی لە سەر سینگی داندرابوو. پۆلیس زوو بۆی ڕوون بووەوە کە هەموو یەک ناویان هەبوو، عومەر بوو. عومەر خەلیفەی دووەم بوو. شیعەکان دەڵێن دەسەڵاتی زەوت کردووە. سوننەو شیعە ئێستا ئەگەر جلوبەرگی بە هەڵە بپۆشن دەکوژرێن. شێوەزاری لایەکەی دیکە بەکار بێنن دەکوژرێن، یان ناوەکانیان هی لایەنی بەرانبەر بێ دەکوژرێن. ڕێژەی ژمارەی ئەو تەرمانەی کە لە سەرەتای ۲۰۰٦ ڕۆژانە لە بەغدا دەدۆزرانەوە چل تەرم بوون. زۆر لە تەرمەکان چاویان دەرهێندرابوو، میخیان لە گۆشتی کوترابوو، هەندێکیشیان جێی ئەشکەنجەی دڕندانەیان پێوە دیار بوو.

زۆربەی وەزارەتە ئێراقییەکان لە دەرەوەی گرین زۆونن، بەڵام هەشن کە لە ناوەوەی دانە. لە کاتی چوونە سەر ئیش، تێپەڕبوون بە بازگەکانی گرین زۆون، خۆی لە خۆیدا پڕ مەترسییەو ئەگەری ئەوەش هەیە چەند کات لە ناو تەنگژەی ترافیک بگلێیەوەو ئەو تەقینە ناوەناوانەوەش کە بەمەبەستی ئاسایشەوە ڕێگاکان دەگیرێن، هێشتا بارەکە ئەستەنگتر دەکا. با وەزیر هەر پاسەوانی زۆر بێ، خۆ ئەگەر کەوتە ناو تەنگژەوەو ڕێ گیرا، ئەوە وەک مەڕ دەبێ لەناو ئۆتۆمۆبیلەکەی دابنیشێ و چاوەڕێ بکا. زۆر لە

وەزیرەکان بە دەگمەن بۆ ئۆفیسەکانیان دەچن و لە بری چوونە سەر کارەکانیان هەر لە ناوچەی سەوز دەچن سەردانی برادەرانیان دەکەن. لە ئاستە بەرزەکانی حکومەتی ئێراقیێ قسەی گەورە زۆر دەکرێ، بەڵام ئاشەکەیان بێ باراشە.

ئەو گەورە کاربەدەستە ئەمێریکییانەی سەردانی بەغدا دەکەن، دەبێ بە چاونقانێک بزانن چ دەقەومێ و چ قەوماوە. دوای سێ ساڵ لە داگیرکردنەکەی ئەمێریکا کردی، هێشتا ئەو گەورە بەرپرسانەی کە سەردانی دەکەن، نە دەوێرن لە ناوچە کەسکەکە دەرچنە دەرەوەو نە دەوێرن شەوی لێبمێننەوەو ئەگەر بە ناو گرین زۆونەکەشدا تێدەپەڕن، دەبێ سوپایێکی بچووک هەر پاسەوانیان بێ[109] ڕەنگە بەڕێوەبەرایەتی بوش پێیخۆش بێ بارودۆخەکە ئارامتر با، بەڵام خەیاڵەپلاو برسی تێر ناکا. ڕەنگە کارمەندانی بەڕێوەبەرایەتیش بتوانن دڵی خۆیان بەوە بدەنەوە کە ئێراق هەر دەبوو لەدوای نەمانی سەددامی پارچە ببا. ئەو یەکێتییەی سوننە ئێراقییەکان بە زۆری زۆردار سەپاندبوویان، خۆ بەر لە داگیرکردنەکە نەمابوو (کوردستان لە ١٩٩١ ڕا جودا ببووەوە) و وڵاتە یەکگرتووەکان تەنیا تۆزێک پەلەی بە لێکترازانەکەی کرد تا کۆتایی بێ.

وڵاتە یەکگرتووەکان ئێستا لە ئێراقێ پێویستی بە ستراتیژێکی ڕاستەقینە هەیە. تەنانەت لە ٢٠٠٣ و ٢٠٠٤، کە وڵاتە یەککرتووەکان و بریتانیا دەسەڵاتی تەواویان بە سەر ئێراقێوە هەبوو، شتێکی وایان نەکرد نەهێڵن وڵاتەکە پارچە ببێ. لە باشوور، بریتانی و ئەمێریکییەکان ڕێگەیان بە مەلا شیعەو حیزبە دینییەکانیان دا بۆ ئەوەی دەسەڵاتی خۆیان بەسەر ناوچەکەدا بسەپێنن و دەوڵەتی ئیسلامی خۆیان دابمەزرێنن. هەرچەندە بە زار دەڵێن کە پابەندی یاساو قانوونن و مافەکانی ئافرەتان دەپارێزن (بەو شێوەیەی کە لە ناو یاسای بەڕێوەبردنی کاتیدا دیار کرابوو)، بەڵام هیچیان نەکرد بۆ ئەوەی نەهێڵن میلیشیاکان شێوە بەرگێکی تایبەتی بە سەر ژنان بسەپێنن و تۆمارگەکانی میوزێک و گۆرانی دابخەن و دوکانەکانی بادەفرۆشان دانەخەن (بە گشتی خودانە کریستیانەکانیان دەکوژن)، و نەهێڵن دادگەی تایبەتی خۆیان حوکم

---

(١٠٩) لەوەتی فشار هەیە هیچ کام لە گەورە بەرپرسان شەوێکیان لە ئێراقێ بەسەر نەبردووە، کۆندۆلیزا ڕایس و جاک سترۆ لە نیسانێ تاکە شەوێک لەوێ مانەوە.

بکا. لەوکاتەی کە دەڵێن کوردستان دەبێ دووبارە بچێتەوە نێو ئێراقێ، هیچ نەکراوە بۆ ئەوەی ڕادەی ئۆتۆنۆمییەکەی کوردستان کەم بکەنەوە. لەکاتێکیشدا دەڵێن هەر هێزێکی چەکدار جگە لە سوپای ئێراقێ هەموو لە قانون بەدەرن، بینیمان لە دوای داگیرکردن، هاوپەیمانان ڕێگەیان دا میلیشیاکان ڕنەو دەنووکیان بێ و هیچیان نەکردووە تا چەکیان بکەن. کاتێک کە هاوپەیمانان بەدەستیان بوو هەموو شتێک بکەن، هیچیان نەکرد، ئێستاو لەودەمەی کە دەسەڵاتی وڵاتە یەکگرتووەکان زۆر لە جاران کەمترە، کارێکی نالۆژیکە ئەگەر هەوڵ بدەن دەزگای بەهێزی وەک یەک سوپای ئێراقێو حکومەتێکی ناوەندی توندوتۆڵ دروست بکەن.

لەکاتێکدا گەلی ئەمەریکی ئەم شەڕە بە هەڵە دەزانێ و ڕێژەی پشتیوانانی سیاسەتی بوش هێندەی ڕێژەی پشتیوانی نیکسن دابەزیوە، وڵاتە یەکگرتووەکان ناچێ ئەوپەڕ هەوڵ بدا تا دەوڵەتێکی وا دروست بکاتەوە کە لە کاتی دەسەڵاتی بەسەریدا دەشکا نەیکرد. بەکورتی، کوردستانێکی سەربەخۆو باشوورێکی دینی کە میلیشیاو ڕێبازگەران کۆنترۆڵیان کردووە، ئێستا دوو قەوارەی ڕاستەقینەن و لە ژیانی ڕۆژانەی ئێراقیدا هەنە. بەڕێوەبەرایەتی نیازی نییە ئەوانە بگۆڕێ. بەڕێوەبەرایەتی پێویستە لە گەڵ خۆی و لەگەڵ گەلی ئەمێریکیدا ئەمین بێ. تاکە ڕێگە کە لەپێش بەڕێوەبەرایەتی هەبێ تا بتوانێ بەناو ڕێچکۆڵەیێکدا بڕواو لە ئێراقێ دەرچێتە دەرەوە ئەوەیە کە دەبێ دان بەوەدا بنێ کە چەند کەمی دێتە بەر دەوی داسەوە.

لە هەر هەژدە پارێزگاکانی ئێراقێ یازدەیان ئارامن[110]. ئەمەش بنەمای ستراتیژییەکی کشانەوە دادەنێ. کوردستان لە سێ پارێزگای تەواو و هەندێ ناوچەی چەند پارێزگایێکی تریش پێک هاتووە. پێشمەرگە (زێرەڤانی هەرێمی کوردستان) بەتواناترین هێزی سەربازی ئێراقییەو تاکە هێزیشە کە بە متمانەوە لای ئەمێریکایە. پێویستە وڵاتە یەکگرتووەکان تاکە دۆستی خۆی لە ئێراقێ بەهێز بکا.

---

(١١٠) بەڕێوەبەرایەتی جەخت لەوە دەکات کە چواردە پارێزگا ئارامەو چوارانیش نا. لیستی پارێزگا نائارامەکانی ئەو پارێزگایانەی عارەبی سوننە نشین دەگرێتەوەو ئەوانیش: ئەنبارو نەینەواو سەلاحەدین و بەغدانە. کەچی شەڕی مەزەبی لە بال و لە دیالەش بەردەوامە. کەرکووک (بەفەرمی بە تامیم ناسراوە) یش ئارام نییە.

ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە یارمەتی تێکنیکییان پێ بدرێ تا حکومەتی هەرێمی کوردستان بتوانێ بە شێوەیێکی کاریگەر ڕاژەگوزاری پەروەردەو پاراستن و تەندروستی پێشکەش هاولاتیانی بکا. بەڕێوەبەرایێتی ئێستا خەریکە کوردستان بە سەرماگوزاران دەناسێنێ کە ناوچەیێکی نارامی ئێراقییەو ڕەنگە ببێتە دەروازەی پێشکەوتنی هەموو ئەو وڵاتەو بەم لایەدا پشتیوانی لێ دەکا. پێویستە ئەمە نەپسێتەوە. لەو کاتەش کە کوردستان بەراستی خۆی دەسەلمێنێ کە دیمۆکراسیترین ناوچەیە لە ئێراقێدا، چاکسازی سیاسی پێویستە لەو هەرێمەدا بکرێ کە دوو پارتی سیاسی دەیان ساڵە دەستیان بەسەر سیاسەتییەوە داگرتووە. ئەو دیمۆکراسییەی کە وڵاتە یەککگرتووەکان گەرەکییەتی، پشتیوانییەکی زۆری لە کوردستان، لە ناو ئیلیتی شارستانی کوردستان و میدیا و ئەکادیمییەکاندا هەیە.

توانای پێشمەرگە دەبێ لە ڕێگەی مەشق پێکردن و زرێپۆش و چەکی قورس و هێلیکۆپتەرەوە پتر بکرێ. وەک ئاشکرایە ئەمانە دۆستی ئەمێریکانەو ڕەنگە وڵاتە یەککگرتووەکان لە ئۆپەراسیۆنەکانی پاشەڕۆژی لە ناو ئێراقێ، پێویستی پێیان ببێ.

لە ۲۰۰۳، کورد شانبەشانی ئەمێریکییان شەڕیان کرد تا سەددامیان ڕووخاند. لە ڕۆژانی دەسەلاتی کاتی هاوپەیمانان و دواتریش، بە بەردەوامی پشتیوانی سیاسەتی وڵاتە یەککگرتووەکانیان کرد. لە دانوستانەکانی لە ۲۰۰٦دا سەبارەت بە حکومەتی ئێراقێ کران، خەلیلزاد کوردی کردە چەپارە بۆ ئەوەی ئێجیندەی وڵاتە یەکگرتووەکان بەرەوپێشەوە ببا و ئەوەبوو توانی ئیبراهیم جەعفەری بەپشتیوانی کردنی کورد لە کاندید کردنەکەی لا بدا. چونکە هاریکارییان لەگەڵ ئەو وڵاتەدا کردووە کە زۆربەی عارەبەکان بە دوژمنی دەزانن، ئەو گەلە نرخێکی گران دەدا. وڵاتە یەککگرتووەکان قەردێکی ئەخلاقی هاوپەیمانێتی لە سەرە. وڵاتە یەککگرتووەکان پەیمانی دا لە ڕێگەی هێزی ئاسمانی خۆیەوە بیانپارێزێ، ئەگەر ئێراق پەلاماریان بداو بەرەو باکوور بێ، ئێستاش، دەکرێ هێشتنەوەی هێزێکی بچووک لە کوردستان تاووتوێ بکا، بۆ ئەوەی دوو مەبەست بەجێ بێنێ، یەکەمیان کورد بپارێزێ و دووەمیشیان وەک چاو سوورکردنەوەیێک بێ لە تیرۆریستان، ئەگەر ویستیان ناوچەکانی عارەبە سوننەکان داگیر بکەن. لەوکاتەی کە گێژەنێکی زۆر سەبارەت بە

هێشتنەوەی سوپای وڵاتە یەکگرتووەکان لە ئێراقێدا هەیە، کورد بۆ خۆیان مەرەقیانە بنکەی سەربازی ئەمێریکی لە کوردستان هەبێ.

سەیری پێشەوە بکەین، دەبینین کە کوردستانێکی تەواو سەربەخۆ، پەیوەندی بە کاتەوە هەیە نە بە چۆن دەبێ. نەوە گەنجترەکەی سەرکردەکانی کورد (ئەوانەی لە چل و بەرەو ژێرن) هیچ پێویستییەکیان بە ئێراقێ نییە و هەر بارودۆخەکەیان بۆ بگونجێ، سەربەخۆیی جاڕ دەدەن. ئەگەر سنووری کوردستان نیشان بکرێ، لەوکات هیچ کاریگەرییەکی بەسەر ئێراقێوە نابێ. سەرکردە ئێراقییەکان بە تەنیا پێیان گوتم کە ئەوان هیچ نکوڵییەکیان لە دیارکردنی مافی چارەی خۆنووسینی کوردستانێ نییە و دەشزانن لەبەر چییە، دوای ئەوەی ئەو هەموو نالەبارییەی بەسەر کورد داهات، گەلی کوردستان نایەوێ بە بەشێکی ئێراقێ بمیننەوە. هەندێک پێدەچوو حەز بکەن کە کوردستان لێیان جودا بێتەوە و نیگەران بوون لەوەی کە کوردستان هیچ وازبەندێک بۆ دەوڵەتێکی هاوبەش ناکا. جێگری سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران، ئەحمەد چەلەبی بە ئاشکرا گوتی کورد مافی جودابوونەوەیان هەیە. ئەیاد عەللاویش هەمان قسەی بۆ کردم کاتێک کە لە ۲۰۰۳، لە بەغدا دیمانەیێکم بۆ ئێی بی سی نیوز، لەگەڵی سازدا. بەڵام ئەوەشی گوت کە جودابوونەوەی کوردستان بەپێی دانوستان دەبێ ببێ، نەک جودابوونەوەیێکی یەکلایەنە بێ. ئەگەر سنووری کوردستان دیاری بکرێ، زۆر لەگینە کێشەکە وەک ئەوەی چیکۆسلۆڤاکیا بەئاشتی ببڕێتەوەو وەک ئەوەی یوگۆزلاڤیا کوشتو کوشتاری لێ نەبێ.

چونکە ژمارەی ئەو کوردانەی کە لە تورکیا و لە ئێرانێدا دەژین، لە ئەوندە پترە کە لە ئێراقێدا دەژین بۆیێ هەردوو وڵات دژی سەربەخۆبوونی کوردستانن(۱۱۱).

چونکە تورکیا قەوارەییکی گەورەی هەیە و هاوپەیمانێکی گرینگی وڵاتە یەکگرتووەکانە لە نێیتۆ، بۆیێ، لەبەردەم سەربەخۆ بوونی کوردستان هەمیشە گەورەترین تەگەرە بووە.

---

(۱۱۱) لە سووریان، لەنێوان ۵۰۰،۰۰۰ تا یەک ملیۆن کورد دەژین، بۆیێ ڕەنگە ئەویش لە دژی کوردستانی سەربەخۆ بوەستێ. بەڵام هیچ کاریگەرییەکی لەسەر ئایندەی کوردستانی ئێراقێ نییە.

له ٢٠٠٣وەڕا، هەڵوێستی تورکیا بە شێوەیێکی بەرچاو بەرانبەر بە کوردستانی ئێراقیّ بۆ پێشەوە چووە. بەر لە دەستپێکی شەڕەکە، تورکیا بەردەوام بەرهەڵستی فێدرالیزمی لە ئێراقیّ کردو تەنانەت دوای دەستپێکی شەڕەکەش ویستی دەسەلات لە وڵاتە یەکگرتووەکان وەرنەگریّ و لەشکری ڕەوانی باکووری ئێراقیّ بکا. بەڵام لەم دواییانەدا، حکومەتی تورکی فێدرالیزمی لە ئێراقیّ پەسند کردو تەنانەت لە جاران کزتریش بەرهەڵستی گەڕانەوەی کەرکووک بۆ ناو خاکی کوردستان دەکا. (پێشی شەڕەکە، تورکیا گوتی گرتنی کەرکووک لەلایەنی کوردانەوە "هێڵی سوورە"ە ئەگەر لێی دەرباز بن، تورکیا ناچار دەکەن بە هێزی سەربازییەوە بێتە ناوەوە.)

هەڵوێست گۆڕینی تورکیا ڕاستی ئێراق ئاشکرا دەکا. لە کاتێکدا کە ڕەنگە بڕیارێکی یەکلایەنەی کوردی بۆ ئەوەی هەرێمێکی فێدرالّی دابمەزرێنیّ یان کەرکووک بگەڕێنێتەوە بۆ ناو کوردستان، ڕەت بکاتەوە، ئێستا چیتر هیچ بنەمایێکی یاسایی بەدەستەوە نەماوە بۆ ئەوەی بە ڕووی هەر چارەسەرێک بوەستیّ کە بە پێی دەستوورو یاساییەوە ئەنجام دەدریّ و حکومەتی خاوەن سەروەری خۆی بڕیاری لەسەر دەدا. لە میانی ئەو هەوڵانەی کە تورکیا لە پێشی شەڕەکە بەمەبەستی گوشار خستنە سەر کوردان دای؛ خۆی وا نیشان دا کە پارێزەری تورکمانەکانی ئێراقییە و مکوڕ بوو لەسەر ئەوەی کە بۆ پاراستنی ئەو سیّ ملیۆن خزمانەی دێتە ناوەوە ناهێڵیّ بکەونە ناو کوردستان. لە هەڵبژاردنەکانی ٢٠٠٥ بوو، پارتە تورکمانییەکان تەنیا سیّ کورسییان بردەوە. ئەمەش ئەوەی ڕوون کردەوە کە ژمارەی تورکمانەکانی ئێراقیّ تەنیا بەشێکی کەمی ئەو سیّ ملیۆنە بوون کە تورکیا و تورکمانەکانیش خۆیان پێی هەڵدەکێشا[١١٢]. لەئەنجامدا کێشەی تورکمانەکان بایەخی جارانی نەما.

لە دیسێمبەری ٢٠٠٢، لە گێستهاوسی حکومەت بووم لە سەلاحەدین، لەگەڵ

(١١٢) چونکە ئێراقییەکان لە هەردوو هەڵبژاردنەکان دەنگی خۆیانیان یان بە نەتەوە، یان بە ڕێبازە دینییەکەیان دا، بۆیێ بووە هێمایێکی ڕوونی سەرژمێری. تورکمانەکانی ئێراقیّ هەندێکیان سوننەو ئەوانی دیکەشیان شیعەنە. ڕەنگە تورکمانە شیعەکان دەنگیان بە هاوپەیانی یەکگرتووی ئێراقیّ دابیّ. ڕەنگە ئەو تورکمانە سوننانەش کە بە ناسنامەی ئیتنییانەوە ناسراون، ژمارەیان لە ٢٠٠,٠٠٠ کەس پتر نەبیّ و هەندێکیشیان دەنگیان بۆ هاوپەیمانی کوردستان دا، ئەوانەش ئەوان بوون کە ناویان لەسەر لیستەکەیاندا تۆمار بوو.

سەرۆک وەزیران نێچیرڤان بارزانی، وێکڕا سەیری تێلیڤزیۆنمان دەکرد کاتێ کە لە نوچەدا هات: یەکێتی ئەوروپا کاتێکی بۆ تورکیا دەستنیشان کرد بۆ ئەوەی وتووێژی چوونە ناو یەکێتییەکە دەست پێبکا. ئێمە هەردووکمان لە سەر ئەوە کۆک بووین کە ئەو ڕۆژە گرینگترین قۆناغی مێژووی کوردستان بوو. تورکیا دەزانێ کە زۆر لە وڵاتانی ئەوروپایی لە تاکە بیانوویێک دەگەڕێن بۆ ئەوەی نەهێڵن لە یەکێتی ئەوروپادا ببێتە ئەندام. هەر دەستتێوەردانێکی سەربازی تورکی لە باکووری ئێراقێ، هیچ هەلێکی بۆ چوونە ناو یەکێتی ئەوروپا بۆ ناهێڵێ و ڕەنگە تووشی سزادانیش ببێ (وەک ئەوەی لە دوای داگیرکردنی قیبرس لە ١٩٧٤ تووشی هات). دەستەی ژەنراڵە تورکەکان ئەوەش دەزانن کە داگیرکردنی کوردستانی ئێراقێ کارێکی ئاسان نابێ. لە ١٩٨٤ڕا تا ١٩٩٩، سوپای تورک شەڕی لەگەڵ گەریلاکانی پارتی کرێکارانی کوردستان (پەکەکە)، لە باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیادا کردو ٣٠ کەسی تێدا لەناو چوو. لە هیچ کاتێک ژمارەی گەریلاکانی پەکەکە لە ٥,٠٠٠ جەنگاوەری ڕەتی نەداوە. کەچی لە باکووری ئێراقێ تورکیا ڕووبەڕووی سوپایەکی پتر لە ١٠٠,٠٠٠ پێشمەرگەی دڵسۆز دەبێتەوە کە لە ناو خاکی خۆیان ئۆپەراسیۆن ئەنجام دەدەن.

تورکیا کە بە پراگماتێکی لە باکووری ئێراقێ نزیک دەبێتەوە هەر لەبەر ئەوە نییە کە هیچ ڕێگەچارەیێکی تری لە پێشدا نییە. بەڵکو لەبەر ئەوەشە کە هەندێ لە هزرڤانە ستراتیژەکانیان، بەتایبەتیش ئەوانەی لە ناوەوەی دەزگاکانی لەشکرو هەواڵگرییەوە نزیکن، کوردستانی ئێراقێ بە پشتیوانی خۆیان دەزانن. تێبینییان کردووە کە کوردەکانی ئێراقێ سێکولارو لایەنگری ڕۆژئاوانەو عارەبیش نینە. ئەمەش وایان لێ دەکا کە هاوپەیمانێکی سروشتی تورکیا بن و ئەو ناوچەیە پێک بێنن کە وڵاتەکەیان لە دەوڵەتێکی عارەبی ئیسلامی لە باشوور، جودا بکاتەوە. هەروەها تورکیا شەیدای ئەو ئابوورییەیە کە وا لە کوردستانی ئێراقێ گەشە دەکا و کۆمپانیا تورکییەکان گەورەترین لایەنی سەرمایەداری بیانینە کە لەو هەرێمە سەرمایەکانیان بە گەڕ خستووەو کۆمپانیاکانی نۆیڵی تورکی بەڵێنی پڕ سوودیان لە حکومەتی هەرێمی کوردستان وەرگرتووە بۆ ئەوەی کێڵگە تازەکانی نەوت پەرە پێ بدەن.

تا ئەم ٢٠٠٦ـەش، تورکیا بە توندی لەڕێی تەواو سەربەخۆبوونی کوردستان

دەوەستێ. بەڵام تورکەکان وەک جاران بە هەڕەشەی لەقەڵەم نادەن و زۆریان تێگەیشتوون کە ئەمە ڕۆژێک هەر دەبێ ببێ. جێی نیگەرانییە کە تورکیا خۆی بۆ ئەوە تەیار داوە کە هەر کاتێک کوردستان سەربەخۆ ببێ، ئەو لە هەمووان پتر کاریگەری بەسەر ئەو وڵاتەدا هەبێ.

ئێرانیش کە بە درێژایی مێژوو یارمەتی شۆڕشە جوداخوازەکانی کوردی ئێراقیی داوە، ڕەنگە ئەمڕۆ ترسناکترین تەگەرەی سەر ڕێی سەربەخۆبوونی کوردستانێ بێ ئەگەر لە ئێراقێ ببێتەوە. ئەو ڕووداوانەی لە ئێراقێ هاتۆتە کایەوە، هانی کوردەکانی ئێرانیی داوە بۆ ئەوەی داوای پتری مافەکانیان بکەن و هێندە ڕژێمی تارانییان ترساند کە لە و ۲۰۰٥ دا بە توندوتیژی سەرکوتی کردنەوە. لەگەڵ ئەمەش ئێران ڕێگەی کەمتری لەبەردا هەیە بۆ ئەوەی نەهێڵێ کوردستانێکی سەربەخۆ لە ئێراقێ دروست ببێ. وڵاتە یەکگرتووەکان و هاوپەیمانانی لەوە نابوورن ئێران ڕاستەوخۆ بە هێزی سەربازی دەست لە کاروباری هەرێم وەربدا. سیاسەتی ئێران لەم جۆرە بارودۆخەدا هەمیشە کاولکاری و تێرۆریزم بووەو لێرەش دەتوانێ ئازار بگەیەنێ، بەڵام هەرگیز ناتوانێ ڕێگە لەو کوردستانە بگرێ کە مکوڕە سەربەخۆ ببێ. جگە لەمەش، ئێران هەمیشە بەر لە هەموو شتێک چاوی لە شیعەکانی باشوور بڕیوە.

ئەگەر شیعەکانی باشووریش هەرێمی خۆیان دروست بکەن، ئەوانیش دەتوانن حکومەتێک پێک بێنن و زێرەڤانی هەرێم دابمەزرێنن. حکومەتەکەیان ئایینی دەبێ و زۆربەی زێرەڤانەکانیشیان لە میلیشیا پێک دێن (کە ڕەنگە هەر لە ڕێکخراوی بەدر پێک بێ، چونکە ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی لە ئێراقێ، لەلایەنی سیاسییەوە هەشت پارێزگای لە سەرجەم نۆ پارێزگا شیعەکانەدا کۆنترۆڵ دەکا). بەم جۆرەش ئەگەر حکومەتێکی هەڵبژاردراوی هەرێم هەبێ و زێرەڤانیشی هەبێ کە بیەوێ ئەو حکومەتە بپارێزێ وا بەباش دەزاندرێ کە ناوە ناوە بەرەنگاری میلیشیاکان ببێتەوەو لە هەمان کاتیشدا بە شێوەیێکی نافەرمی سستمێکی ئیسلامی پەیڕەو بکا، چونکە حکومەتی وڵاتە یەکگرتووەکان و هاوپەیمانەکانی یارمەتی تێکنیکی پێشکەشی حکومەتی باشوور دەکەن، بۆیێ ڕەنگە بە جۆرێک کار لە گۆڕانکارییەکانی ناوخۆ بکەن. تەنانەت حکومەتی دینیش دەتوانێ باری سیاسی

و ئابووری هێنده سەقامگیر بکا کە بواری سەرمایەداری تازە بدا بۆ لە کێڵگەکانی نەوتی باشوور بەرهەمداری بکا.

ئێستا ئەگەری زۆر ئەوەیە کە ئێراق بۆ دوو دەوڵەت دابەش بکرێ، ئەویش ئێراقێکی عارەب و کوردستانە، ئەم ئەگەرەش زۆر لەوە بەهێزترە کە بکرێتە کوردستان و دەوڵەتێکی سوننە و دەوڵەتێکی شیعە. کێشەکە ئێستا لەوەدا خۆی دەنوێنێ ئایا هەرێمەکانی سوننە و شیعەکانی ئێراقێ (گریمان دروست بووینە) لە ئاییندەدا دەیانەوێ سەربەخۆ بن. هەرچەندە شیعە ناسنامەیێکی ئایینییە، بەڵام زۆر لە شیعەکان کە باسی دەکەن وەک ئەوە ناوی دێنن کە ناسنامەیێکی "ئیتنی" یان نەتەوەیی بێ. ئەمەش وەک چۆن بەرواڵەت دێتە بەرچاو هێندە شتێکی نائاسایی نییە. یوگۆزلاڤیای تیتۆ موسوڵمانەکانی بۆزنیای بەگرووپێکی ئیتنی دادەنا نەک هەر کۆمەڵگەیێکی ئایینی بێ[١١٣]. بەڵگەی دەگمەن هەیە کە جەماوەری شیعە

ئێراقییەکان لە سەرکردەکانیان پتر دەیانەوێ بەخۆیان حوکمی خۆیان بکەن و لەوانیش "شیعە پەروەر" ترن. سەرکردەکانی ئەنجومەنی باڵای شۆڕشی ئیسلامی لە ئێراقێ، لەم بارەیەوە، وەک سەرکردەکانی تری شیعەکان نینە. لە ١٩٢٠کان، دانیشتوانی بەسرە ویستیان ئەوانیش وەک کومیت، دەوڵەتی سەربەخۆی خۆیانیان هەبێ و ئەم جوداخوازییە لە ٢٠٠٣ بەدواوە سەری هەڵداوەتەوە. ئەمش کێشەیێکی ئاڵۆزە، چونکە دەوڵەتی بەسرە شوێنە گرینگەکانی وەک نەجەف و کەربەلای تێدا نابێ، بەڵام زۆربەی نەوتی ئێراقیی لێ دەبێ. چونکە ژمارەیێکی زۆری شیعە لەو شەڕەی ناوخۆدا کوژران، بۆیێ بووە هۆی پەرەپێدانی شیعە پەروەری و خوازیارانی دەوڵەتێکی جودای شیعانی بەپەرۆش هێناوە.

---

(١١٣) بەم چەشنە ئەو کرواتییە یان ئەو سربییەی کە ئایینگۆڕی دەکردو دەبووە ئیسلام، ناسنامە ئیتنییەکەی خۆی هەر دەپاراست و دەبووە "کرواتییەکی موسوڵمان" یان "سربییەکی موسوڵمان" جارێک لە وەزیری دەرەوەی بۆزنیا هاریس سیلادزیچم پرسی، ئەرێ ئەو موسوڵمانەی ئایینگۆڕکێ دەکا و دەبێتە کاتۆلیک، دەبێ بە "موسوڵمانێکی کاتۆلیک" وەڵامی داوە کە موسوڵمان دینی خۆی ناگۆڕێ. چونکە سێ کێشەی دێنە پێش، لە ١٩٩٣، حکومەتی بۆزنی ناوی ئیتنی موسوڵمانی گۆڕی و کردییە "بۆزنیاک"، بۆیێ دەشێ ببێتە بۆزنیاکێکی کاتۆلیکی.

ڕەنگە سەرۆکی میسری حوسنی موبارەک لە میانی دیمانەکەی ڕۆژی ٩ی نیسانی ٢٠٠٦، لەگەڵ کەناڵی ساتالایتی العربیە دا، ئاگرەکەی خۆشتر کردبێ کاتێک گوتی کە دونیای شیعە پتر دڵەلای ئێرانە لەوەی کە دڵسۆزی وڵاتەکانی خۆیان بن، بەلام لە قسەکانیدا، موبارەک سەد لە سەد سەرچیغ نەچوو. گرینگ نییە هەرچەندە شیعەکانی باشوور پێشکەون، هەر ئێران باڵا دەستی سەریان دەبێ. پارچە کردن، جا ئەگەر بۆ چەند کۆنفیدراڵییێکی بێهێز بێ وەک ئەوەی دەستوور دایناوە، یان وڵات ببێتە چەند دەوڵەتی تەواو سەربەخۆ، ڕەنگە کاریگەری ئێران لە باشوور کەم بکاتەوە.

بەڕێوەبەرایەتی بوش ئەندازەیێکی کارامەی بۆ گۆڕانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دانابوو، بواری عارەبی بە ئێرانێ دەدا هەڵسوکەوتی وای لەگەڵ شیعەی ناو وڵاتانی عارەبی وەک ئێراق و کوەیت و ناوچەی ڕۆژهەلاتی عارەبستانی سعودی و بەحرێن، بکردبا کە هەرگیز بە خەونیشیدا نەدەهات(١١٤). هەرچی دەڵێ بابڵێ، هیچ گرینگ نییە، بەلام ڕاستییەکەی ئەوەیە کە بەڕێوەبەرایەتی بوش نە دەتوانی و نە دەیەوێ لە باشووری ئێراقێ ڕووبەڕووی سەنگەری ئێرانێ ببێتەوە، نە دەشتوانێ لەو ناوچە عارەبییانەی کە زۆرینەیان شیعەنە پەلاماری ئێرانێ بدا. ئەمانە گۆڕانکاری دڵخۆشکەر نینە، بەلام پێویستیش بەوە نییە کە کارەساتیان لێ دروست بکرێ.

***

وڵاتە یەککگرتووەکان و شیعەکانی دونیا هەموو بە ئێرانیشیانەوە، بەرژەوەندیەکی هاوبەشیان لە بەزاندنی قاعیدە و ئەو بزووتنەوە ئیسلامییە توندڕۆیانەدا هەیە کە هەوادارینە. پەیوەندی وڵاتە یەککگرتووەکان لەگەڵ شیعەکانی باشووری ئێراقێ وەک ئەو پەیوەندییەی نێوان ئێران و وڵاتە یەککگرتووەکان پڕ ئەشکەنجە و توندوتیژە نەبوو؛ بۆیێ وڵاتە یەککگرتووەکان دەیتوانی پەیوەندییەکی باش لەگەڵ تیۆکراسی شیعەی باشووری ئێراقێ پەرە پێ بدا، چونکە ئەوانە بەڕێگەی هەڵبژاردنێکی

(١١٤) زۆرینەی کوەیت سوننەیە، بەلام ژمارەیێکی بەرچاوی شیعەشی لێ دەژی. سەرژمێرییەکی تەواوی ناوچەی ڕۆژهەلاتی عارەبستانی سعودی لەبەر دەستدا نییە، ڕەنگە شیعە لەوێ زۆرینە بن. زۆرینەی دانیشتوانی بەحرێنیش هەر شیعەنە.

دیمۆکراسی دەسەڵاتیان وەرگرت کە هێزەکانی هاوپەیمانان مسۆگەریان کرد. بەڵام ئەگەر لە ئێرانێ توند بکا، شیعەکانی ئێراقێ هەمووی سەنگەر لە وڵاتە یەکگرتووەکان دەگرن.

بەردەوامی مانەوەی هێزەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان و بریتانییەکان لە باشووری ئێراقێ، بێ ئەوەی هیچ سوودێکیان بۆ ئەو ناوچە مەیلەو ئارامانە هەبێ، تەنیا تەنگژە لەو ناوە دروست دەکا. لە ٢٠٠٥، چەند جارێک سەربازانی بریتانی لەگەڵ هێزەکانی پۆلیسی ناوخۆو میلیشیاکان بەگژ یەکتریدا چوون. جارێکیان کە هێزەکانی بریتانی پەلاماری بنکەیێکی پۆلیسیان دا، هێندە بارەکە ئاڵۆز بوو کە نزیک بوو لەدەست دەرچێ[١١٥]. تا هێزەکانی هاوپەیمانان لە باشووردا بمێنن، ئەگەری پەلاماردانی پتر لە ئارادا دەبێ.

سەربازەکان دەبێ بە پەلە، بەڵام بە شێوەیێکی رێکوپێک، پاشەکشەیان پێ بکرێ.

کشانەوەی سەربازان لە باشوور، هەڵوێستی وڵاتە یەکگرتووەکان و ئەوروپاییەکان بەهێز دەکا بۆ ئەوەی ستراتیژییەتێک رێکبخەن و بتوانن رێگە لە ئێرانی بگرن تا نەهێڵن چەکی ناووکی دروست بکا. تا هێزەکانی لە باشوور بمێنێ، وڵاتە یەکگرتووەکان هیچی پێ ناکرێ و ئێرانیش ئەمەی زۆرچاک دەزانێ. هەرکە لە باشوور دەرکەوتن، وڵاتە یەکگرتووەکان و بریتانی باشتر دەتوانن دانوستان بکەن، چونکە توانای سەربازییان دەبێ.

لە پارێزگایەکانی عارەبە سوننەکان، وڵاتە یەکگرتووەکان تووشی گرفتی گەورە هاتووە. وادیارە بوونی سوپای ئەمێریکی لە ناو ئەو عارەبە سوننە دوژمنانەدا، بێ ئەندازە کەسانی خۆکوژو چەتە پەیدا دەکا. ئەگەر وڵاتە یەکگرتووەکان لە ناو جەرگەی خاکی سوننەکان دەرچێ، رەنگە یاخی و تێرۆریستان پتر خاکیان بەردەست بکەوێ. خراپترین سیناریۆ ئەمەیە کە ناوچەی عارەبی سوننە وەک ئەفغانستانی ژێر تالیبانی لێ دێ: واتا دەبێتە بنکەیێکی ئارام کە لەوێوەڕا

---

(١١٥) ئامانجی پەلامارەکە ئەوەبوو کە دوو کەسی هێزە تایبەتەکانی بریتانی ئازاد بکەن کە لە کاتی گرتنیان بە بەرگی سیڤیل کاریان دەکرد.

تێرۆریستان دەتوانن پیلان بۆ پەلاماردانی سەر وڵاتە یەکگرتووەکان ڕێکبخەن.

ئەو پرۆگرامەی کە لە دوای تەقاندنەوەی گڵکۆی عەسکەری هات، زۆرینەی عارەبی سوننەی بەئاگا هێنا. لە شەڕێکی نێوان شیعە و سوننەدا، سوننەکان دەزانن بەمسۆگەری دەدۆڕێن. هەندێ لە دوژمنە هەرە دیارەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان هەڵوێستی خۆیانیان گۆڕی، پێشان داوایان دەکرد بکشێتەوەو ئێستاش داوا دەکەن وڵاتە یەکگرتووەکان بیانپارێزێ. لە فەللوجەی، شێخی خێڵە عارەبە سوننەکان پیاوانی خۆیانیان نارد تا پەیوەندی بە بەتالیۆنی فەللوجەی هێزی سوپای ئێراقێ وە بکەن کە وڵاتە یەکگرتووەکان پێکی هێنا. وا پێدەچوو گەیشتبنە ئەو ڕاستییە کە بۆ خۆیان وا باشترە سوپایێکی سوننە بیانپارێزێ نەک سەربازە شیعەکان بێن و کۆنترۆڵی شارەکەیان بکەن.

دەشێ عارەبی سوننە بێن و پێکهێنانی ئەو هەرێمە ببینن تا بزانن کە بۆ پاراستنی خۆیان چەند پێویستەو بەمەش ئەو ترسەیان لە دڵ دەردەچێ کە فیدرالیزم ئێراق پارچە دەکا. ئەگەر عارەبە سوننەکان زێرەڤانی هەرێمەکەیان دروست بکەن، دەتوانن ئەرکی پاراستنی ئاسایشی ناوچەکانیان لە هێزەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان و سەربازانی سوپای ئێراقی زۆرینە شیعە وەربگرنەوە. ئینجا وڵاتە یەکگرتووەکان دەتوانێ هێزەکانی خۆی بکشێنێتەوەو بە سەرکردەی سوننەکانیش بڵێ ئەگەر دەسەڵاتداران ڕێگەی قاعیدە و تێرۆریستانی دژە ڕۆژئاوا بدەن بێن لەو هەرێمەدا چالاکی بکەن، ئەوکات دیسان وڵاتە یەکگرتووەکان هێزەکانی خۆی ڕەوانی ئەو هەرێمە دەکاتەوە. ئەگەر عارەبە سوننەکان هەرێمی خۆیان پێک نەهێنا، هێشتا وڵاتە یەکگرتووەکان هەر دەتوانی بکشێتەوەو ئەرکەکانی پاراستنی ئارامیش بە هێزە ئێراقییەکان بسپێرێو ئەویش بەردەوام هەر شیعەکان لەو ناوچەیە بەردەدا.

چونکە کشانەوەی وڵاتە یەکگرتووەکان لە ناوچە سوننەنشینەکان مەرجی هەیە و دەبێ دەسەڵاتدارە لۆکاڵەکان تێرۆریستان سەرکوت بکەن، بۆیێ دەبێ وڵاتە یەکگرتووەکان هێزێکی ئامادە لە نزیکی ئەو هەرێمەدا بهێڵێتەوە بۆ ئەوەی لە کاتی پێویست دەستبەکار بێ. بۆ مانەوەی ئەو هێزانە کوردستان شوێنێکی نایابە. نزیکەو دانیشتوانەکەی دۆستن و هەر لە ناوەوەی ئێراقیشە. بارەگا گرتنی هێزەکان وەک

هەندێک پێشنیار دەکەن، ئەگەر لە دەرەوەی ئێراقیش بێ، گەڕانەوەی لە لایەنی سیاسییدا گران دەوەستێ و ئاسان نابێ[116]. پارچە بوون بۆ کوردستان و بۆ عارەبی شیعەی باشوورو بۆ عارەبی سوننەی ناوەڕاستیش چارەسەرێکی سیاسی باشە؛ چونکە ئەوەی تا ئێستا قەوماوە هەمووی بە فەرمی دەناسێنێ. ئەو پارچە بوونەیە کە کوردستانی بەئارامی هێشتۆتەوەو باشووریشی مەیلەو ئارام ڕاگرتووە. ئەمە چارەسەری ئێراقی خۆیانەو لە ناو دەستووردا هاتووەو کەس بەسەریانیدا نەسەپاندوون. بە پێچەوانەوە ئەو هەوڵانەی کە ئەمێریکییەکان دایان بۆ ئەوەی ئێراقێکی یەکگرتووی دوور لە ڕێبازگەری و ئیتنی دروست بکەن، هیچی بەهیچ نەگەیاند. ئەگەر وڵاتە یەکگرتووەکان ڕشت با بۆ ئەوەی ئەو ئێراقە یەکگرتووە دروست بکا، ئەو هەرێمەی کە ئێستا ئارامە، ئەویش ئارام و سەقامگیر نەدەما. کوردەکان بەتوندی بەرپەرچی هەر هەوڵێک دەدەنەوە ئەگەر بیەوێ لە بەناو زێتر بە ئێراقییان بناسێ و ئەو هەوڵانەش کە بۆ دامەزراندنی سوپایێکی تێکەڵ لە شیعەو سوننە، هەمووی نەزۆکن و ڕێگە بۆ شەڕی ناو یەکە سەربازییەکان خۆش دەکەن.

پارچەکردنی ئێراقێ ڕێگایێکە بۆ ئەوەی بە خێرایی لەو وڵاتە بکشێینەوە. بەڵام پارچە کردن کێشەی بەغدا چارەسەر ناکا. ئەوەش هەر لەبەر ئەمەیە چونکە چارەسەرییەکی چاک لەگۆڕێدا نییە.

بەغداییەکان متمانەیان بە هیچ هێزێکی چەکداری ئێراقی نییە. پۆلیس و سوپا بەشێکن لە گرفتەکە. ئەو بەغداییەی پۆلیس دەبینێ کە جلی خۆی لەبەر کردووە نازانی ڕاستینەو بە ئەرک دەرچوونە، یان. کۆماندۆزەکانی پۆلیسی شیعەنەو خەڵک دەرفێنن، یان هەر ساختەچینەو خۆیان وەک پۆلیس پۆشیوە. هەرکەسێک ناوی ئەو ناوە بێ کە ئەوەی ڕایدەگرێ نەیەوێ، ڕەنگە لە بازگەی پۆلیس بکوژرێ. سوپا

---

(116) هەرکە هێزەکانی وڵاتە یەکگرتووەکان لە ئێراقێ دەرکەوت، ئیتر بەرهەڵستی بەرفراوانی لە ناوەوەی وڵات دەبێ ئەگەر پێویست بکا بۆ ئێراقێ بچێتەوە. چونکە زانیارییەکانی دەربارەی چەکی کۆمەڵکوژ ڕاست نەبوو، بۆیێ ئەگەر ئەمجارە زانیاری هەواڵگری تەواویش دەربارەی تێرۆریستانەوە هەبێ، هەر دەبێتە کارێکی زۆر ئەستەم بتوانی دووبارە گەلی ئەمێریکا قایل بکەی بەوەی دیسان بگەڕێیتەوە. حکومەتێکی بەشبەشی ئێراقیش ڕەنگە نەتوانێ ئەو بڕیارە بداو داوا لە وڵاتە یەکگرتووەکان بکا دووبارە هێزەکانی خۆی بۆ ناو ئێراقێ ڕەوان بکا.

کەمێک لەمە باشترە. لە ئاداری ٢٠٠٦، سوپا وەزارەتی بەرگری بانگەوازێکی بڵاوکردەوە و داوای لە هاوڵاتیانی شاری بەغدا کرد لەگەڵ هیچ هێزێکی پۆلیس یان سوپا نەڕۆن، بەڵام زۆر کەس بۆی نەچووە سەری و کەسی بەهاواریەوە نەچوو.

بەقسە، وڵاتە یەکگرتووەکان دەبوو هەندێ ئاسایشی بەغدا بپارێزێ و سەربازانی وڵاتە یەکگرتووەکان ببوونایە پۆلیسی ناو بەغداو بازگە سازبدەن و چەک بگرن و تاوانکار و تیرۆریستان دەستبەسەر بکەن و میلیشیا بەهێزەکان چەک بکەن و چاوپۆشی لەوانەش نەکەن کە لەگەڵ پۆلیس و سوپا دابوون. ئەمەش ئەرکەکەیانی بەتەواوەتی دەگۆڕێ و سەربازی پتری دەویست و کوشتاری پتریشیان لێ دەکەوتەوە.

ئەمەش باش نەبوو کە سەربازانی وڵاتە یەکگرتووەکان بێ ئەوەی زمان بزانن و شارەزاییان لە کۆمەڵگەی لۆکاڵ نەبێ و بە پاراستنی خۆیانەوە خەریکبن، ئەمانە جێی چینە پۆلیسێکی ئێراقی متمانە پێکراو ناگرنەوە. لە ناوەوەی وڵاتە یەکگرتووەکانیش کەسێک نییە پشتگیری ئەم جۆرە ئەرکە بکا.

لەبری ئەوە وڵاتە یەکگرتووەکان دەبێ دان بەوە دابنێ کە ناتوانێ لە بەغدا هیچ بکاو ناشیەوێ ئەو کوشتو کوشتارەی لێ بوەستێنێ. هەرکە ئەوانیش دەست بە شەڕی ناوخۆ دەکەن، وەک هەموو شەڕێکی ناوخۆی ئەم سەردەمە، بە خۆی کاتێک دیاری دەکا تا کۆتایی بە خۆی بێنێ. کردەوەی هەترەسکاری کارەساتی پتری لێ دەبێتەوەو کەمجارێکیش وادەبێ گۆڕانکاری توند لە نەکاوێک ڕوودەداو شەڕەکە ڕادەگرێ. گومان لەوەدا نییە کە زۆربەی گەلان نە شەڕی سیڤیلیان گەرەکە و نە دەشیانەوێ ناکۆکی ڕێبازگەری ڕۆڵەکانیان بەکوشتن بدا. شەڕی سیڤیل توندڕۆترین گروپەکان بەهێز دەکا و لە زمان خەڵکانێکی پتر پشتیوانی ئەو لایەنە توندڕۆیانە دەکەن. لەبری ئەوان توندڕۆیەکانی لایەنەکەی تر دێنە مەیدان. پەیڕەو کردنی ڕێبازێکی نەرم دەبێتە کارێکی ترسناک، چونکە لەگەڵ خیانەت کردن لە گەلەکەی خۆت یەکسان دەبێ.

لەم چەرخەدا، چەندین هێزی دەرەکی هاتووە بۆ ناوبژیوانی کردن، بۆ ئەوەی ئەم جۆرە شەڕانە کۆتا بێنن. سوپای سوریا شەڕی پازدە ساڵەی ناوخۆی لوبنانی لە

١٩٨٩ كۆتا هێناو پاشان پازده ساڵی تریش لەوێ ماوه. ئەیتۆ له بۆزنیا بڵاوەی کرد بۆ ئەوەی شەڕە سیڤیلەکەی ئەوێ بوەستێنێ(١١٧) و هێزەکانی ئەوروپاییش دوای پازده ساڵ، تائێستا هەر لەوێ ماونەتەوه. تائێستاش هێزه بیانییەکان له لایبیریاو سیرالیۆن و کۆنگۆ پێویستن بۆ ئەوەی ئاشتییه لەترکزییەکەی ئەوێ بپارێزن.

ئەم جۆره هێزه بیانییه له بەغدا نییه تاکو ئەم ڕۆڵه بگێڕێ. وڵاته یەکگرتووەکانیش نایەوێ. دەشێ داوا له وڵاتانی عارەبی بکرێ بۆ ئەوەی ئەم هێزه بنێرێ، بەڵام ئەم سەربازانه دەبێ له گەورەترین و بەتواناترین وڵاتی عارەبییەوه که میسره بێن. ڕەنگه حکومەته شیعەکەی ئێراقێ هەر لەشکرێک ڕەت بکاتەوه که له وڵاتێکی عارەبی سوننەوەڕا بێ. بێگومان ئەو سەربازانەشیان ناوێ که لەو وڵاتەوەڕا بێن که سەرۆکەکەیان به نەیاری ئێرانی دەناسێ. عارەبه سوننه ئێراقییەکان و وڵاته دراوسێیه عارەبه سوننەکانی ئێراق و وڵاته یەکگرتووەکانیش به هاتنی لەشکری ئێرانێ قایل نابن. کوردیش له دژی هەر ڕۆڵێکن ئەگەر لەشکری تورکیا بیگێڕێ. تورکیاش لەلای خۆیەوه بەهیچ شێوەیێک نایەوێ لەشکری خۆی بۆ ئەرکی ئاشتی پاراستنێکی پڕ مەترسی بنێرێ که کەسیش منەتی پێ نەبێ و سوپاسیشی نەکەن.

مەترسی ئەوەش هەیه که فاکسیۆنه نەیاره ئێراقییەکان هەر یەکەو داوای یارمەتی پتر لەوەی ئێستا بۆیان دێ، له هاوپەیمانانیان بکەن. دوور نییه سوپای ئێرانێ بێ و یارمەتی حکومەته شیعەکەی ئێراقێ بداو لەشکرەکانی وڵاته عارەبییه سوننەکانیش بەهانای عارەبه سوننەکانەوه بێن. بەم ڕێگەیەش دەشێ شەڕه سیڤیلەکەی ئێراقێ سنووری ئەو وڵاته ببەزێنێ و به وڵاتانی دراوسێدا بڵاو ببێتەوه.

شەڕه ناوخۆیەکەی ئێراقێ، کۆتاییەکی ئاڵۆزوباڵۆزی وڵاتێکه که هەرگیز به خۆشی خۆی یەکی نەگرتووەو ئەمەش بووه هۆی ئەوەی که هەمیشه نیگەرانی و زۆربەی کاتیش ژیانی ناخۆشی بۆ زۆرینەی هاوڵاتییەکانی خۆی هێناوه. وڵاته یەکگرتووەکانیش که ئێراقی داگیرکردو پاشان بەڕێکی بەڕێوەی نەبرد، بووه هۆی ئەوەی که ئێراق خێراتر له خۆی بڕووخێ و وەک وڵاتێکی یەکگرتوو نەمێنێ بەڵام

---

(١١٧) لەلایەنی تەکنیکییەوه بۆزنیا شەڕی ناوخۆی نەبوو، چونکه سێربیاو کرواتیا هێزەکانی خۆیان لەوێ بڵاوه پێ کرد و چالاکییەکانی سێرب و کرواته لۆکاڵەکانیان ئاراسته دەکرد.

هۆیەکە ئەو نەبوو. پارچەبوونی ئەو ڕێگەچارەیەی ئێراقییەکان بە خۆیان دایاننا زۆربەی هەرێمەکانی ئەو وڵاتەی سەقامگیر کردووە، هەر لەبەر ئەم هۆیەشە دەبێ ئەم پارچەبوونە پەسند بکرێ. لە بەغدا و ئەو شوێنانەی کە شیعەو سوننەی لێ تێکەڵی یەکتری بووینە، وڵاتە یەکگرتووەکان ناتوانێ چارسەری بکا، چونکە بەلای کەم لەئایندەی بەرچاودا، چارەسەری نییە. ئەمە تراژیدیایێکە و کەسیش نییە قەناعەت بەخۆی بێنێ و دان بەوە دابنێ کە ئەم گرفتە چارەناکرێ. بەڵام ڕاستییەکە ئەمەیە. مانەوەی ئەمێریکییان بۆ ماوەیێکی دوورودرێژ لە ئێراقی عارەبی هیچ ئامانجێک بەجێ ناهێنێ.

ئەندازیارەکانی شەڕ باوەڕیان وابوو کە دەتوانن ڕۆژهەڵاتی ناڤین بگۆڕن. گۆڕییان.

# پێڕست

